ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا  توێژینەوەی ماستەرە کە بەسەرپەرشتی د. سالّح مەلا عومەر عیسا، پێشکەشی کۆلێژی یاسا و زانستە سیاسییەکان/ بەشی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی سەلاّحەددین کراوە.

پێشکەشە بە:

گۆڕی سەربازی ون....

پێشمەرگە...



خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

# ● بنەماکانی هزری و چوارچێوەی تیۆری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران

● پەرویز رەحیم

● نەخشەسازی ناوەوە: رێدار جەعفەر
● بەرگ: رێمان
● نرخ: (٤٠٠٠) دینار
● چاپی یەکەم: ٢٠١٤
● تیراژ: (٧٥٠) دانە
● چاپخانەی: موکریانی (هەولێر)
● لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٤٥٨) ساڵی (٢٠١٤)ی پێ دراوە.

زنجیرەی کتێب (٨٧١)

MUKIRYANI
ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION
ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

## پێشەکی

کۆماری ئیسلامی ئێران وەکو دەوڵەتێکی گرنگی ناوچەیی و بەهۆی جۆری سیستەمە سیاسی و ئایدۆلۆژیاییەکەی واتە سیستەمی ئیسلامی ـ شۆڕشگێڕی و پێگەی گرنگی جیۆپۆلەتیك و دەوڵەمەندییەکەی لەبواری وزە (نەوت و غاز) هەروەها بە هۆی ئەو مێژوو و شارستانییەتەی کە هەیەتی، کاریگەری لە سەر ڕووداوەکانی ناوچەکە هەیە. بۆ ئەم مەبەستەش ئەم توێژینەوەیە هەوڵ دەدات کە بنەماکانی هزری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران دەستنیشان بکات و لە چوارچێوەیەکی تیۆریدا ئەو فاکتەر و ڕەگەزانە بخاتەڕوو کە کاریگەریان لەسەر سیاسەتی دەرەوەی ئێران هەیە.

ئەم توێژینەوە بە سوود وەرگرتن لە تیۆری (کۆنستراکتیڤیزم) کە لە بواری پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان و سیاسەتی دەرەوەدا تیۆرێکی نوێیە، هەوڵ دەدات بنەماکانی هزری پێکهێنەری ناسنامەی کۆماری ئیسلامی ئێران، کە بە پێی چوارچێوەی ئەم تیۆریە دەبێتە هۆی ڕەفتار و بەرژەوەندی تایبەتی ئەو دەوڵەتە، بخاتەڕوو. هەروەها هەر دوو فاکتەری پێکهاتەیی ناوخۆیی و دەرەوە و هەروەها ڕەگەزی بکەرایەتی و کاریگەریان لە سەر یەکتری و لە لایەکی ترەوە، فاکتەرە ماددی و ماناییەکان خراوەنەتەڕوو، تاوەکو بتوانین خوێندنەوەیەکی زانستی بۆ ئەو دەوڵەتە و سیاسەتی دەرەوەی بکەین، کە لێرەدا بەچەند خاڵێك دەیخەینەڕوو. لەم توێژینەوەیەدا باسمان لە تیۆر و پێناسە و ئاستەنگەکانی شیکردنەوەی

سیاسەتی دەرەوە بەگشتی کردووە. هەروەها لە بەشی تیۆرییەکاندا باسمان لە تیۆریەکانی ریالیزم و نییوریالیزم و لیبرالیزم و نییولیبرالیزم و ڕەفتارگەرایی و پاش ڕەفتارگەرایی و دروستکردنی بڕیار لە سیاسەتی دەرەوە و هەروەها تیۆری رەخنەیی و روانگەیان بۆ سیاسەتی دەرەوە کردووە و پاشان تیۆر و روانگەی کۆنستراکتیڤیزمان خستۆتەڕوو. لە کۆتاییدا باسمان لە رۆڵ و کاریگەری هەردوو فاکتەری پێکهاتە و بکەر لە سیاسەتی دەرەوەدا کردووە.

لەم تۆێژینەوەیەدا پێکهاتەی فەرمی کاریگەر لە سەر سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، خراوەتەڕوو و نیشانمانداوە، کە لەم پێکهاتە فەرمییەدا کە دەرهاویشتەی سیستەمی سیاسی و ئایدۆلۆژیای کۆماری ئیسلامییە، ڕێبەر ڕۆڵی سەرەکی لە هەموو بوارەکانی ناوخۆ و دەرەوە، بە تایبەت سیاسەتی دەرەوەدا دەبینێت. هەروەها سەرچاوەکانی ناسنامەسازی لە کۆماری ئیسلامی ئێران کە وەکو بنەماکانی هزری و پێکهێنەری ناسنامە و ڕەفتار و بەرژەوەندی کۆماری ئیسلامی ئێران کاردەکەن، ڕوون کردۆتەوە و گرنگیمان بە هەردوو فاکتەر و ڕەگەزی مانایی و ماددی لە دروستکردنی ئەم بنەما هزری و ناسنامەییەی کۆماری ئیسلامی ئێران داوە، وەکو: مێژوو. هەروەها رۆڵی ئاینی ئیسلام و مەزهەبی شیعە و ئەو بنەمایانای کە دەرهاویشتەی ئەم ڕەگەزەیە کە دواتر کاریگەری لە سەر جۆری ڕوانین و تێگەیشتنی بڕیار وەرگرانی کۆماری ئیسلامی و ڕەفتار و بەرژەوەندییەکانی دەبێت. هەروەها ڕەگەزەکانی جیهانی سێیەمگەرایی و گوتاریی شۆڕشگێرانەی ئیسلامی و تیۆری پیلانگێری و تێڕوانینی تایبەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە بارەی دەوڵەت - نەتەوە، کە بەگشتی ئەو فاکتەر، ڕەگەز و بنەمایانە وەکو سەرچاوەی ناسنامەسازی یان ناسنامە پێدەری کار دەکەن، شیکردنەوەمان بۆ کردووە. ئەم توێژینەوە هەندێ پرس و نموونەی لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەیی خستۆتەڕوو،

هەروەها ریشە و هۆكارەكانی دوژمنایەتی ئێران و ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و ئیسرائیل، بەرزی و نزمی و بارگرژی لە پەیوەندییەكانی یەكیتی ئەوروپا و كۆماری ئیسلامی ئێران و وڵاتانی تری ناوچەكە، سیاسەتی كولتووری كۆماری ئیسلامی، پرس و كێشەی دۆسیەی ئەتۆمی و ئابلۆقە نێودەوڵەتییەكانی سەر ئێرانی خستۆتەڕوو و لێكدانەوەی بۆ كردووە.

ئەم توێژینەوەیە بەگشتی هەوڵێكە بۆ دەستنیشانكردنی بنەماكان و فاكتەر و ڕەگەزەكانی هزری كاریگەر لەسەر سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران و لەم ڕووەشەوە، باسمان لەو بنەما و ڕەگەز و فاكتەرانە كردووە، بۆ نموونە: ئایدۆلۆژیای ئیسلامی شۆڕشگێرانە و دەرهاویشتەكانی لە سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران، ڕۆڵی تاك یان وەلی فەقیە و ڕێبەری لە سیاسەتی دەرەوەی ئێران، هەروەها تێگەیشتن و تێڕوانینی كۆماری ئیسلامی بۆ پێكهاتەی هێزی نێونەتەوەیی و دامەزراوە و ڕێكخراوە نێونەتەوەییەكان و چۆنیەتی تێڕوانین و تێگەیشتنی كۆماری ئیسلامی بۆ پرسی ئاسایش و كاریگەری پاراستنی بەرژەوەندییەكانی سیستەمی ئیسلامی ئێران لەسەر سیاسەتی دەرەوە و ڕۆڵی دۆكتۆرینی (ام القری) لە سیاسەتی دەرەوەی ئێران و هەروەها فاكتەرەكانی كۆمەڵایەتی و پێكهاتەی دانیشتوانی ئێران و كولتووری سیاسی ئێرانییەكان و كاریگەریان لە سەر تێگەیشتن و ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوە، هەروەها تێڕوانین و ململانێ نێوان نوخبە ریالیست و ئایدیالیستەكان و كاریگەریان لەسەر ئاڕاستەكردنی ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران و ڕۆڵی فاكتەری ئابووری و وزە لە سیاسەتی دەرەوەدا، كە هەر ڕەگەز و فاكتەرێك بەشێك لە تیگەیشتن، ڕەفتار و بەربەستەكانی سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێرانمان بۆ ڕووندەكاتەوە.

لە کۆتاییشدا گەیشتینە کۆمەڵێك ئەنجام کە گرنگترینیان ئەوە بوو کە بنەما هزرییەکان و بەتایبەت بنەماکانی ئیسلامی- فیقهی و ئایدۆلۆژیای شۆرشگێرانەی کۆماری ئیسلامی، کە ناسنامە، ڕەوایەتی و ئەم تێگەیشتنە تایبەتەی کۆماری ئیسلامی ئێران، لەسەری ڕاوەستاوە، لەگەڵ گوشارەکانی پێکهاتەیی سیستەمی نێونەتەوەیی و نۆرم یان پێوەر و بەهاکانی نێونەتەوەیی زاڵ، پێکەوە کارلێك دەکەن و تێگەیشتنی تایبەت بۆ هەردوو لایەن دروستدەکەن، کە ئەمەش دیسانەوە دەبێتە هۆی دووبارە بەرهەم هێنانەوە و پێناسەکردنەوەی بەرژەوەندی، دوژمنایەتی، بارگرژی، هاوکاری، دۆستایەتی و پاڵپشتی یان هەموارکردنەوەی ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوە، وەکوو دژایەتی و دوژمنایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لەهەمبەر ئیسرائیل و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەگشتی رۆژئاوا یان پاڵپشتی ئێران لە بزوتنەوە توندڕەوەکانی دژی ڕۆژئاوا و هاوپەیمانەکانیان، بەڵام پارێزگاری لە مانەوە و پاراستنی ئەم سیستەمە، باڵاترین ئامانج و بەرژەوەندی و هەروەها جێبەجێ کردنی ئەرکێکی ئایینی و فیقهیە بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران و بۆیە بە هەموو شێوەیەك کار بۆ پاراستنی دەکات. بەگشتی، سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، ئامراز و دەرهاویشتەی سیاسەتی ناوخۆیی و ڕەنگدانەوەی ڕوانین و بنەماکانی هزری و تێگەیشتنی ڕێبەر و نوخبەی دەسەڵاتدار و پێکهاتەی فەرمی و بەرژەوەندیەکانی ئەم سیستەمە سیاسییەیە، کە ئەوەش وادەکات، پارێزگاری کردن لەمانەوە و بەهێزترکردنی سیستەم و پاراستنی ناسنامەکەی و جێبەجێ کردن و هێنانەدیی بنەماکانی هزری ئەم سیستەمە سیاسییە، ئامانجی کۆتایی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران بێت.

# (١) ـ دەستپێك

یەکێك لە پرس و بابەتە گرنگەکانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان، سیاسەتی دەرەوەی وڵاتانە، کە بە تیۆر و ڕوانگەی جۆراوجۆر خوێندنەوەی بۆ دەکرێت. لە لایەکی تـریشەوە سیاسەتی دەرەوەی هەر وڵاتێکیش ئامرازێکە بۆ پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتان یان ئەکتەرەکانی تـری نێونەتەوەیی بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی ئەم دەوڵەتە کە لەسەر بنەمای ستـراتیژیەتێکی تایبەت بەڕێوەدەچێت. ئەم ڕەفتار و ستـراتیژیەتە دەرەکییەش دەرهاویشتەی کۆمەڵێك ڕەگەز و فاکتەری ناوخۆیی و نێونەتەوەییە، بەم مانایە کە سیاسەتی دەرەوەی هەر دەوڵەتێك لە لایەك دەرهاویشتەی کارلێکی نێوان فاکتەر و ڕەگەزەکانی ماددی و مانایی ناوخۆیی و دەرەوەیە و لە لایەکی تـریشەوە دەرئەنجامی هەوڵدانە بۆ بەرجەستەکردن و جێبەجێ کردنی کۆمەڵێك لە فاکتەر و ڕەگەزەکانی هزری، ئایدۆلۆژی، کولتووری، کۆمەڵایەتی، مێژوویی و بەگشتی ناسنامەییە، کە لە سیاسەتی دەرەوەدا بەرجەستە دەبێت. بەڵام بە پێی فاکتەر و ڕەگەزەکانی پێکهێنەری ناسنامەی وڵاتێك ئەم کارلێکە جیاوازە و ڕۆڵی پێکهاتە یان بکەرەکە بەرجەستە یان بەرز و نزم دەبێتەوە.

کۆماری ئیسلامی ئێرانیش وەك ئەکتەرێکی گرنگی ناوچەیی و بە هۆی تایبەتمەندی سیستەمە سیاسییە ئایدولۆژیك و شۆڕشگێرانەکەی، خاوەن سیاسەتێکی دەرەوەی تایبەتە، کە هەوڵەکان بۆ خوێندنەوە و شیکردنەوەی سیاسەتی دەرەوەی ئەو وڵاتە، تەنیا بە تیۆر یان ڕوانگەیەك ناتوانێت هەموو ڕەهەندەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران ڕوون بکاتەوە. بۆیە پێویستە بنەماکانی هزری و ڕەگەز و هەروەها فاکتەرەکانی

کاریگەر لە سەر ئەم بنەما هزریانە کە ئاراستەی سیاسەتی دەرەوەی ئێران دەکات لە چوارچێوەیەکی تیۆریدا بخەینە ڕوو و هۆکاری ڕەفتاری تایبەتی ئەم وڵاتە لە سیاسەتی دەرەوەدا ڕوون بکەینەوە و هەوڵ بدەین لە تیۆر یاخود لە ڕوانگەیەکی چەند ڕەهەندی سوود وەربگرین، تاوەکو ناسنامەی کۆماری ئیسلامی ئێران دەستنیشان بکەین کە ئەم ناسنامەیە فۆرمی سیاسەتی دەرەوە و ڕەفتاری کۆماری ئیسلامی دەستنیشان دەکات. بەم مانایە کە تیۆر و ڕوانگەیەك کە هەم گرنگی بە پێکهاتە و بکەر دەدات و هەم فاکتەرە هزری و ماددیەکان ڕوون دەکاتەوە. لێرەوە هەوڵ دەدەین کە لە تیۆری کۆنستراکتیڤیزم سوود وەربگرین تاوەکو بنەماکانی هزری و چوارچێوەی تیۆریی ڕەفتاری کۆماری ئیسلامی ئێران، کە جۆری تێگەیشتنی ئەم دەوڵەتە لە جیهانی دەرەوە و هەڕەشە و مەترسیەکان، هەروەها لێکدانەوەیان دیاریدەکات، کە لەسەر بنەمای جۆرە تێگەیشتن و ڕوانگەیەکی تایبەتی ئایینی، ئایدۆلۆژی، مەزهەبی، کولتووری، کۆمەڵایەتی و تەنانەت جوگرافیایی و جیۆپۆلەتیکە لە ئاستی دەرەوەدا، ڕووبەڕووی کۆمەڵێك گیروگرفت و کێشە دەبێتەوە لە پەیوەندی لەگەڵ ئەکتەرەکانی تری ناوچەیی و نێونەتەوەیی یاخود پێکدادانێك لە نێوان بەها و پێوەرەکانی کۆماری ئیسلامی و بەها و پێوەرە زاڵەکانی سیستەمی نێونەتەوەیی ڕوودەدات، کە ئەمەش دیسانەوە کاریگەری لە سەر ڕەفتار و تێگەیشتنی نوخبە سیاسییەکانی کۆماری ئیسلامی بە پێی ئەو دەزگا و سیستەمە هزریانەیان دەبێت و وادەکات کە کۆماری ئیسلامی بۆ بەدیهێنانی هەمان ئامانج و بەرژەوەندی، ستراتیژی جیاواز بگرێتەبەر. چونکە فاکتەرەکانی تاك، پێگە، کۆمەڵگە، حکومەت و پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی لەم پرۆسەیەدا بەشداران، کە لە ڕوانگەی کۆنستراکتیڤیستەکانەوە پێکەوە دەبنە هۆی دروستبوونی ناسنامەی تایبەت و تێگەیشتنی تایبەت و بەرژەوەندی تایبەت بۆ دەوڵەتێك.

**ئامانج:**

ئامانجی سەرەکی ئەو توێژینەوەیە، هەوڵدانە بۆ لێکۆڵینەوە و دەستنیشان کردنی بنەماکانی هزری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە چوارچێوەیەکی تیۆریدا و دیاریکردنی ڕۆڵ و کاریگەری ئەم فاکتەر و ڕەگەزە ماددی و هزریانە لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە تەعامول لەگەڵ پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی و بە گشتی ڕۆڵی ئەم ناسنامە ئایینی-ئایدۆلۆژیکە لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا. لەم ڕوانگەیەوە هەوڵ دەدەین کە وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە.

**أ- پرسیاری سەرەکی:**

بنەماکانی هزری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران کامانەن و چۆن کاریگەری دەکەنە سەر سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران؟ کام چوارچێوەی تیۆری باشتر دەتوانێ سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران ڕوون بکاتەوە یاخود گونجاوترە بۆ سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران؟

ب-پرسیارە لاوەکییەکان:

١- پەیوەندی دەرەکی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ وڵاتە جیاوازەکان لە سەر چ ڕوانگە و تێگەیشتنێك دامەزراوە؟ واتا هۆکاری دۆستایەتی و دوژمنایەتی وڵاتان لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێران هەڵقوڵاو و دەرهاویشتەی چ بنەمایەکی هزری یاخود ماددیە؟

٢- ناسنامەی تایبەتی ئێرانی - ئیسلامی و شیعی - شۆڕشگێرانەی کۆماری ئیسلامی بە چ شێوەیەك کاریگەری لە سەر سیاسەتی دەرەوەی ئێران هەیە؟

٣- ئایا جۆری سیستەمی سیاسی کۆماری ئیسلامی و بنەمای هزری دروستکەرانی بڕیار لە کۆماری ئیسلامی و ئەو ناسنامە تایبەتەیە کە کاریگەری لە سەر دروستکردنی بڕیار و ڕوانگە و جۆری پەیوەندییەکان و بەرژەوەندی کۆماری ئیسلامی هەیە، یاخود ئەوە بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانە کە پاڵنەر و ڕێگە نیشاندەر و داڕێژەر و ئاراستەکەری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێرانە یان بە مانایەکی تـر فاکتەرە دەرەکییەکان کاریگەری لە سەر سیاسەتی دەرەوەی ئێران دادەنێن یان فاکتەرە ناوخۆییەکان (ماددی و هزریەکان)؟

٤- ئایا لە سیاسەتی دەرەوەی ئێراندا پارادۆکس(تناقض) هەیە و ئەگەر هەیە لە بەر چ هۆکار یان فاکتەرێك ئێمە پارادۆکس (تناقض) لە سیاسەتی دەرەوەی ئێراندا دەبینین؟

## میتۆد:

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەش لە توێژینەوەکەماندا کەڵك لە میتۆدی (وەسفی - شیکاری) و (شیکردنەوەی ناوەڕۆك) و هەروەها سوود لە چوارچێوەی تیۆری کۆنستراکتیڤیزم وەردەگرین. بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکانیش سوودمان لە سەرچاوەکانی کتێبخانە و ئینتەرنێت وەرگرتووە.

## گریمانە:

**گریمانەی سەرەکی:** ((بنەماکانی هزری و ئایدۆلۆژیك - شۆڕشگێرانەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە چوارچێوەی بنەماکانی هزری فیقهی شیعەدایە، کە سیستەمی سیاسی کۆماری ئیسلامی ئێران و پێکهاتە فەرمییەکەی ڕەوایەتی لێوەردەگرێت. بەم پێیەش ئەو ڕۆڵ و پێگەیەی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ خۆی

لە سیستەمی نێونەتەوەییدا پێناسەی دەكات، لە سەر بنەمای ناسنامەیەكی تایبەتی ئێرانی - ئیسلامی و شیعی - شۆڕشگێرانەیە، كە وادەكات سیاسەتی دەرەوەی ئاراستە و بەرژەوەندییەكانی پێناسە بكات و هەوڵی بەدیهێنانی ئامانجە باڵاكانی بدات، بەڵام پاراستنی ئاسایش و مانەوەی ئەم سیستەمە ئایینی - سیاسییە، ئامانجی سەرەكی سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێرانە. پێگە و تێگەیشتنی ڕێبەر و نوخبە ئایینی- سیاسییەكانی ئێران لە خۆیان و لە جیهانی دەرەوە و پرسی پاراستنی ئاسایش و بەرژەوەندی سیستەم، هەروەها كاریگەری و گوشارەكانی پێوەرەكان، بەهاكان و پێكهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی و دابەشبوونی هێز، جارێكی تر ئەم ناسنامەیەی كۆماری ئیسلامی ئێران و بەدوایدا بەرژەوەندی و ڕەفتارەكانی ئەم بكەرە هەموار دەكاتەوە)).

بۆ تێگەیشتن لە بنەماكانی هزری و دیاریكردنی لۆژیكی ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران، تیۆری كۆنستراكتیڤیزم باشترچوارچێوەی تیۆریكی سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێرانمان بۆ ڕوون دەكاتەوە. بەم پێیەش ئەم گریمانەیە لە سەر ئەم خاڵانەی خوارەوە راوەستاوە:

## گریمانەلاوەكییەكان:

١ـ ناسنامەی كۆماری ئیسلامی ئێران پێكهاتەیەكە لە مێژووی ئێران، ئایینی ئیسلام و مەزهەبی شیعەی دوادزە ئیمامی كە بۆتە هۆی دروستبوونی كۆمەڵێك بەها و پێوەر بۆ ڕەفتارەكان، وەكو: دادپەروەریخوازی، بنەمای ولایەتی فەقیە، بنەمای (تەوەلا و تەبەڕی)، بنەمای بانگەشەكردن، دابەشكردنی جیهان بۆ دوو بەرەی دارولئیسلام و دارولحەرب، تەقییە، شەهادەتخوازی، ڕۆحیەی خەباتگێری و بەرخودان، بنەمای نەفی سەبیل و چاوەڕوانی بۆ دەركەوتنی ئیمامی مەهدی و ئامادەكاری بۆ شۆڕشە جیهانییەكەی، هەروەها جیهانی سێیەمگەرایی

و ڕۆژهەڵاتگەرایی، گوتاری ئایدۆلۆژیکی شۆڕشگێرانەی ئیسلامی، جیۆپۆلەتیك، تیۆر یاخود زهنییەتی پیلانگێری، ڕوانگەی جیاواز بۆ نەتەوە و دەوڵەت، کە ئەمانە سەرچاوەی سەرەکی ناسنامەسازین لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا.

٢ـ پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی کاریگەری لەسەر بکەرایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە سیاسەتی دەرەوەدا هەیە.

٣ـ کێشە و گیروگرفتەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران و کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی، دەرهاوێشتەی ناکۆکی ناسنامەییە یاخود بە واتایەکی تر، جیاوازی لە بەها و پێوەرە زاڵەکانی سیستەمی سیاسی کۆماری ئیسلامی ئێران و جۆری تێگەیشتنی ڕێبەر و نوخبە ئایینی- سیاسییەکانیەتی لە هەمبەر بەهاکان، پێوەرەکان، دامەزراوەکان و پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی، بۆ نموونە: دژایەتیکردنی ڕۆژئاوا بەگشتی و ئیسرائیل و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تایبەت، پرسی پرۆگرامی ئەتۆمی، پاڵپشتی لە بزوتنەوە توندڕەوەکان و... هتد.

٤ـ تیۆری کۆنستراکتیڤیزم بە هۆی گرنگی پێدان بە پرسی ناسنامە و فاکتەرە مانابییەکان و هەروەها لەبەرچاو گرتنی کار و کارلێك لە نێوان بکەر و پێکهاتەی ناوخۆیی و نێونەتەوەیی، بنەماکانی هزری و چوارچێوەی تیۆری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران باشتر ڕوون دەکاتەوە.

٥ـ ڕۆڵی وەلی فەقیە(ڕێبەری)، ئایدۆلۆژیای شۆڕشگێرانە ـ ئیسلامی کۆماری ئیسلامی ئێران و هەروەها فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکان، کولتووری سیاسی ئێران، جیۆپۆلەتیك، سیستەمی ئابووری، پرسی پاراستنی ئاسایش و بەرژەوەندی سیستەمی کۆماری ئیسلامی ئێران، چۆنیەتی تەعامول و تێڕوانینی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی و دامەزراوە نێونەتەوەییەکان، هەروەها گۆڕانکاری و ململانێیەکانی ناوخۆیی ئێران، کاریگەریان لە سەر سیاسەتی دەرەوە و بکەرایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران هەیە.

## گرنگی:

### گرنگی توێژینەوەکە لەم خاڵانەدا دەردەکەوێت:

١ـ نەبوونی سەرچاوەی زانستی و باوەڕپێکراوی ئەکادیمی دەربارەی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی بە زمانی کوردی بۆ ئەوەی لە لایەك قوتابیانی زانکۆ و لە لایەکی تـر سیاسەت داڕێژەران و دروستکەرانی بڕیاری حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراق کەڵکی لێوەربگرن.

٢ـ گرنگی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ ئێمەی کورد، کە دراوسێی هەرێمی کوردستانە و پەیوەندی مێژوویی و سیاسی و ئابووریمان پێکەوە هەیە و هەروەها کاریگەری گۆڕانکاریەکانی ناوخۆیی و سیاسەتی دەرەوەی ئەو دەوڵەتە لە سەر ئێمە بە هۆی بوونی بەشێکی بەرچاوی نەتەوەی کورد لەم وڵاتە و سیستەمی سیاسی - ئایینی کۆماری ئیسلامی ئێران کە بەشێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە چوارچێوەی عێراقی نوێدا کە پێکهاتەی شیعە زۆرینەن، کاریگەری لە سەر ئێستا و داهاتووی ئێمەی کورد دەبێت.

٣ـ چوارچێوەی تیۆری ئەم توێژینەوەیە، کە هەوڵێکە بۆ ئەوەی کە تیۆر و ڕوانگەی نوێ لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا بەکار بێنێت، بەتایبەت تیۆری کۆنستــراکتیڤیزم کە بە تیۆر و ڕوانگەیەکی تاڕادەیەك نوێ لەو بوارەدا هەژمار دەکرێت، بۆ ئەوەی کە توێژەر یاخود لێکۆڵەرانی تـر هانبدەین کە تەنیا لە چوارچێوەی تیۆرییە کلاسیکیەکاندا هەوڵی خوێندنەوەی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان نەدەن، بەڵکوو کەڵك لەم ڕوانگە و تیۆرە نوێیانەش وەربگرن و تەنانەت ڕوانگەیەکی ڕەخنەییان هەبێت.

٤ـ بەرجەستەکردنی ڕۆڵی بنەماکانی هزری و فاکتەرە مانایی و ناسنامەییەکان لە سیاسەتی دەرەوەدا، کە ئەمەش گرنگی تایبەتی خۆی هەیە بۆ لێکۆڵینەوە لە سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتان کە تائێستا کەمتـر گرنگی پێدراوە.

چوارچێوە:

ئەم توێژینەوەیە بێجگە لە پێشەکی و ئەنجامەکان دابەشکراوەتە سەر چوار بەشی سەرەکی بەم شێوەی خوارەوە:

**بەشی یەکەم:** کە بەشێکی تیۆرییە و ئاماژە بە چەندین چەمك، تیۆر و ڕوانگە دەدات کە پەیوەندی بە ڕوون کردنەوە و شیکردنەوەی بابەتەکەمانەوە هەیە، کە بـریتییە لە: ناساندن و پێناسەی سیاسەتی دەرەوە و چەمکەکانی، ریالیزم، ئایدیالیزم، نیوریالیزم، لیبـرالیزم، نیولیبـرالیزم، ڕەفتارگەرایی و پاش ڕەفتارگەرایی، تیۆری ڕەخنەیی، تیۆری کۆنستـراکتیڤیزم، عەقڵگەرایی و ڕەخنەگەرایی، تیۆری دروستکردنی بڕیار لە سیاسەتی دەرەوەدا و شیکردنەوەی فاکتەری پێکهاتەیی و بکەرایەتی و هەروەها ڕوانگە جیاوازەکان دەخەینە ڕوو.

**بەشی دووەم:** ئەم بەشە ئاماژەیە بە پێکهاتە و سیستەمی سیاسی کۆماری ئیسلامی ئێران و سیاسەتی دەرەوە. بۆ ئەم مەبەستە لەم بەشەدا سیستەمی سیاسی کۆماری ئیسلامی ئێران و پێکهاتەی فەرمی، دەستور و ڕۆڵی ڕێبەری و ئەنجومەنی شارەزایانی ڕێبەری و شورای پاراستنی دەستور و ئەنجومەنی شورای ئیسلامی و کۆمەڵەی دەستنیشان کردنی بەرژەوەندییەکانی سیستەم و ئەنجوومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی و سەرۆك کۆمار و ئەنجوومەنی وەزیران و وەزارەتی دەرەوە و هێزەچەکدار و سەربازیەکان و دەسەڵاتی دادوەری لە پەیوەندی لە گەڵ سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران دەخەینە ڕوو، هەروەها ڕەگەز و سەرچاوەکانی ناسنامەسازی کاریگەر لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، وەکو: مێژووی ئێران، تیۆری پیلانگێری و ترس لە بێگانە، سروشتی دەوڵەت و نەتەوە و بنەماکانی سەرووەری لە

کۆماری ئیسلامی، ئایینی ئیسلام و مەزهەبی شیعە، بنەماکانی دادپەروەریخوازی، ولایەتی فەقیە، بنەمای (تەوەلا و تەبـەڕی)، بانگەشەکردن، دارولئیسلام و دارولحەرب، تەقییە، شەهادەتخوازی، ڕۆحیەی بەرخودان و خەبات کردن، نەفی سەبیل، چاوەڕوانی بۆدەرکەوتن، گوتاری جیهانی سێیەمگەرایی و گوتاری شۆڕشگێرانەی ئیسلامی، جیۆپۆلەتیك، دەستنیشان دەکەین.

**بەشی سێیەم:** لەم بەشەدا سـتـراتیژی ڕەفتاری دەرەکی و چەند نموونەیەك لە پەیوەندییە دەرەکییەکانی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران دەخەینە ڕوو، وەکو: کۆماری ئیسلامی ئێران و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کۆماری ئیسلامی ئێران و ئیسرائیل، کۆماری ئیسلامی ئێران و یەکێتی ئەورووپا، کۆماری ئیسلامی ئێران و سیاسەتی بەرەوە ولاتانی ڕۆژهەلات، کۆماری ئیسلامی و رووسیا و ولاتانی ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز، کۆماری ئیسلامی ئێران و ولاتانی ناوچەیی و عەرەبی، هەروەها شۆرشەکانی ولاتانی عەرەبی، پرۆگرامی ئەتۆمی کۆماری ئیسلامی ئێران، دیپلۆماسی کولتووری کۆماری ئیسلامی ئێران.

**بەشی چوارەم:** لەم بەشەدا فاکتەر و ڕەگەزەکانی کاریگەر لە سەر سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی یان بە مانایەکی تـر، بە پێی تیۆری کۆنستراکتیڤیزم ڕەگەزەکانی کاریگەر لەسەر بکەرایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران شیدەکەینەوە، وەکو: وەلی فەقیە(ڕێبەری)، ئایدۆلۆژیای ئیسلامی ـ شۆڕشگێرانە، ، تێڕوانینی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ دامەزراوە نێونەتەوەییەکان و پێکهاتەی هێز، پرسی ئاسایش و پاراستنی بەرژەوەندی سیستەمی کۆماری ئیسلامی ئێران، دۆکتۆرینی (ام القری) و فاکتەرەکانی کۆمەلایەتی و کولتووری، ململانێیە ناوخۆییەکانی نوخبە ریالیست و ئایدیالیستەکان لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا و کاریگەری جیۆپۆلەتیکی ئێران، هەروەها فاکتەری ئابووری، بەتایبەت وزە (نەوت و غاز)، لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران دەخرێنە بەرباس و لێکدانەوە.

# (٢) ـ چوارچێوەی تیۆری

تیۆرییەکانی سیاسەتی دەرەوە، لە ڕوانگە و لە ئاستی جیاواز شیکردنەوە بۆ سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان دەکەن بۆ نموونە: سێ ئاستەکەی شیکردنەوەی دیڤید سینگێر[١]، یان سێ وێناکەی کنت واڵتز[٢]، بەڵام بە گشتی دەتوانین تیۆرییەکانی سیاسەتی دەرەوە لە سێ گروپدا پۆلین بکەین:

١ـ ڕوانگەکانی تیۆری لە ئاستی شیکردنەوەی ورد یان تاك، کە گرنگی بە سیاسەتمەداران و بڕیار وەرگران دەدات.

٢ـ ڕوانگەکانی تیۆری لە ئاستی نەتەوەیی، کە گرنگی بە پێکهاتەی ناوخۆیی دەوڵەتان دەدات.

٣ـ تیۆرییە سیستەمییەکان کە گرنگی بە شیکردنەوەی سیاسەتی دەرەوە لە ڕوانگەی کاریگەری سیستەمی نێونەتەوەیی و پێکهاتەکانی دەدات (دهقانی فیروزآبادی، ١٣٨٧: ص١٤٧). هەروەها بیرمەندانێك وەکو ریچار شنایدر و جۆزێف فرانکل، زیاتر گرنگی بە فاکتەر و ڕەگەزەکانی ناوخۆیی دەدەن و لەلای ئەوان بیروباوەڕ، بەهاکان و وێنا زەینییەکانی تاکی بڕیاروەرگر، گرنگی تایبەتی

---

١ـ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

Singer, David. (1977), “**the level of Analysis in international Relations**”, in Klaus knorr and Sidney verba, the international system: theoretical Essays; Princeton University press, Pp.20-29.

٢ـ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

Waltz, Kenneth. (2001)**, Man, the State and War**: A theoretical analysis; New York: Columbia University press, Pp.16-159.

هەیە. لە بەرامبەر ئەو ڕوانگەیەدا هەندێ لە زانایانی تـر وەکو: مەك کلاند، مۆدلێسکی، ریچارد ڕۆزکرانس و مۆرتۆن کاپلان، سیاسەتی دەرەوە لە ڕوانگەی سیستەمی نێونەتەوەیی شیدەکەنەوە و بڕوایان وایە کە دەوڵەتان تەنیا لە چوارچێوەی سیستەمی نێونەتەوەیی دەتوانن کارلێك بکەن و سیاسەتی دەرەوە بە پێی پێکهاتە وپرۆسەکانی سیستەمی نێونەتەوەیی یان تەعامولەکانیان سنووردار دەکرێت و دەبێت بۆ شیکردنەوەی سیاسەتی دەرەوە گرنگی بەپێکهاتە، تەعامول، پرۆسە، ڕێساکان، بەهاکان و ئامانجەکانی سیستەمی نێونەتەوەیی بدەین، هەروەها گروپێکی تـر لە زانایان، وەکو: هانریدەر و جێمزرۆزێنا، هەردوو ژینگەی ناوخۆیی و دەرەکی پێکەوە دەبەستنەوە و بۆ شیکردنەوەی سیاسەتی دەرەوە بە گرنگیان دەزانن (سیف زادە، ١٣٧٦: ص١٤٨).

## (١.٢)- سیاسەتی دەرەوە:

### (١.١.٢)- ناساندن و پێناسەی سیاسەتی دەرەوە:

بە گشتی سیاسەتی دەرەوە لە سەر چوار کردەوەی سەرەکی ڕاوەستاوە: ١- ناسینی ژینگەی نێونەتەوەیی. ٢-داڕشتنی سـتراتیژیەتی نەتەوەیی. ٣- داڕشتنی تاکتیکی جێبەجێ کردن. ٤- دیپلۆماسی. بەم پێیە سیاسەتی دەرەوە کۆمەڵە ئامانج، هەڵوێست، ڕێباز و ئامرازێکە کە حکومەتێك لە هەمبەر یەکە سیاسییەکانی تـری نێونەتەوەیی بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان، بەدواداچوونیان بۆ دەکات. سیاسەتی دەرەوە، هەوڵ دەدات کاریگەری لە سەر ڕەفتاری وڵاتانی تـر بکات یاخود کاریگەری لە سەر کۆی سیستەمی نێونەتەوەیی هەبێت کەئەمەش لە هەنگاوی دروستبوونی بیرۆکەکانی بەرژەوەندی نەتەوەیی و ڕێکخستنیان لە چوارچێوەی ئامانج و مەبەستی دیاریکراو و دواتـر دەستنیشان کردنی فاکتەرەکانی هەلومەرجی ناوخۆیی ودەرەکی کە کاریگەری لە سەر ئامانجەکان

هەیە و شیكردنەوەی تواناكانی دەوڵەت و دارشتنی پلان و ستــراتیژی بۆ بەكارهێنانی تواناكان بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەكاندا خۆی دەبینێتەوە (پلانو و روی، ١٣٧٥: ص٢١). سیاسەتی دەرەوە گرنگی بە پرسە جۆراوجۆركان وەكو: پرۆسەكانی هەنووكەیی لە ئاستی دامەزراوە فەرمی و نافەرمییەكانی حكومەت، پرۆسەی دروستكردنی بریار و بریار دروستكردن و ستــراتیژیەكانی هەڵبژاردنی عەقلانی، ئامانجەكان و ئامرازەكان، ژینگە و سروشتی سیاسی ناوخۆیی، بكەرەكان و رەگەزە دەروونییەكانیان و تێگەیشتنیان، ئایدۆلۆژیا، ژیۆپۆلیتیك و...هتد، دەدات. لەم روانگەیەوە سیاسەتی دەرەوە جەخت لەسەر پرۆسە ناوخۆییەكانی دروستكردنی بریار دەكات و سیاسەتی نێونەتەوەیی تەركیز لەسەر پەیوەندی نێوان دەوڵەتان وەك سیستەمێكی نێونەتەوەیی و تایبەتمەندیەكانی سیستەمەكە دەكات (آقایی و رسولی، ١٣٨٨: ص٧). لە راستیدا سیاسەتی دەرەوە ئەو دەستەیە لە پەیوەندییەكان دەگرێتەوە كە حكومەتەكان بەرپرسن تیایدا، بەڵام پەیوەندییە نێونەتەوەییەكان پەیوەندی نێوان حكومەتەكان، گروپەكان، رێكخراو و دامەزراوەكان و...هتد، دەگرێتەوە و بۆیە هەردەوڵەتێك كۆمەڵێك ستــراتیژی و رێوشوێن دەگرێتەبەر بۆ بەدیهێنانی ئامانجەكانی و سیاسەتی دەرەوەی خۆی بەو ئاراستەیەدا رێكدەخات (رضائی، ١٣٨٧: ص١٨٥).

پەیوەندی سیاسەتی دەرەوە و پەیوەندییە نێونەتەوەییەكان لەم سۆنگەیەوە دەستپێدەكات كە یەكێك لە پرسە گرنگەكانی تیۆرییەكانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەكان، خوێندنەوە و تێگەیشتنە لە فاكتەرەكانی كاریگەر لە سەر رەفتاری دەرەوەی وڵاتان، بەم مانایە كە پرسیاركردنە لە (چۆن) و (بۆچی)، لە رەفتاری سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان كە هەر روانگە و تیۆرییەك بە شێوەیەك وەڵامی دەداتەوە (حاجی یوسفی، ١٣٨١: ص ١٠٦).

هەروەها لێرەوە دەتوانین بڵێین کە سیاسەتی دەرەوە بـریتیە لە کۆمەڵێك ڕێڕەو، میکانیزم، میتۆد و هەڵوێست کە دەوڵەتێك لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ کاروبار و پرسەکانی دەرەوە، لە چوارچێوەی ئامانجە گشتییەکانی زاڵ لە سیستەمی سیاسیدا پەیڕەو و جێبەجێی دەکات (محمدی، ١٣٧٧: ص ١٨). بەڵام پەیوەندی دەرەکی بـریتیە لە تەعامول و پەیوەندییە سەروو سنووریەکان لە بوارەکانی سیاسی، ئابووری، کولتووری وزانستی، کە بە گشتی و زۆربەی کات ئەم پەیوەندیانە لە چوارچێوەی پلان و ستـراتیژیەتێکی تایبەتدا نییە و لە سەر بنەمای درێژخایەن و هێز نییە و زیاتـر کاردانەوەیە و لە ژێر کاریگەری ڕووداوەکاندایە (خلیلی، ١٣٨٧: ص ٧٦).

### (٢.١.٢)- ستـراتیژی لە سیاسەتی دەرەوەدا:

دەوڵەتان بە پێی ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەیان و هەروەها لە ژێر کاریگەری پێکهاتە و پرۆسەکانی سیستەمی نێونەتەوەیی، ستـراتیژی جیاواز بۆ گەیشتن و بەدیهێنانی ئامانجەکان هەڵدەبژێرن، لێرەدا ستـراتیژی بە مانای چۆنییەتی گەیشتن بەئامانجە نەتەوەییەکان و ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەیە، کە دەتوانین بە ستـراتیژی گۆشەگیری، بێلایەنی، پابەندبوون یاخود هاوپەیمانی دابەشی بکەین، کە ئەمەش لە ژێر کاریگەری فاکتەرەکانی چۆنیەتی دابەشبوونی هێز لە ئاستی سیستەمی نێونەتەوەیی، ژمارە و جۆری ئەکتەرەکانی نێونەتەوەیی، گرێدراوی و پێویستیەکانی ئابووری و تکنولۆژیا و...هتد، دایە (رضائی، ١٣٨٧: ص١٩٤). هەر دەوڵەتێك سیاسەتی دەرەوەی خۆی بە ئاراستەیەکدا ڕێکدەخات کە لە کۆتاییدا ویست و پێویستییە ئاسایشی، ستـراتیژیك، ئابووری، سیاسی، کولتووری و سەربازییەکانی لە مەودای کورتخایەن یان درێژخایەندا، دەستەبەر بکرێت و لە ڕاستیدا ئامانج و بەهاکانی

كۆمەڵگەكان، دروستكراوی كۆمەڵێك فاكتەر وەكو: مێژوو، بیروباوەڕ و ئایین، كولتوور، كولتووری سیاسی، پەروەردە و...هتد، لە ئەو وڵاتەیە و ئەم ئامانجانە لە چوارچێوەی بیروباوەڕێكی تایبەتدا پێناسە و ئاشكرا دەكرێت ( قوام، ١٣٨٥: ص١٣٦).

**(٣.١.٢) - پۆلین كردنی سیاسەتی دەرەوە:**

١- سیاسەتی دەرەوە وەك ڕەنگدانەوەی دەروونناسی سیاسی نوخبەكان:

لە ئەم ڕوانگەیەدا، سیاسەتی دەرەوە بـریتیە لە بەهاكان، حەز و ویست و پێوەرەكانی سیاسەت داڕێژەران كە بە گۆڕینیان، سیاسەتی دەرەوەش دەگۆڕێت. ئەم ڕوانگەیە بڕوای وایە كە فاكتەری جێگیر و نەگۆڕ لە سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتاندا بوونی نییە و دەبێت ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتان لە سەر بنەمای دەروونناسی و پاڵنەر و ئایدۆلۆژیای ڕێبەران و حكومەتەكان هەڵسەنگێنن (موسوی زادە و جاودانی مقدم، ١٣٨٧: ص١٩٤).

٢- سیاسەتی دەرەوە وەك ڕەنگدانەوەی جیۆپۆلەتیك و كولتووری سیاسی:

لەم ڕوانگەیەدا، سیاسەتی دەرەوەی هەر دەوڵەتێك بە بگۆڕی گریدراوی پێگەی جیۆپۆلەتیك، نەریتی مێژوویی، ئامانجەكان و پێداویستیەكانی دەوڵەت دەزانێت، ئەم ڕەگەزە نەگۆڕانەش(جێگیرانە) دەبنە هۆی بەردەوامی لە سیاسەتی دەرەوەدا، واتا جەخت لە سەر ڕەگەزە جێگیرەكان لە سیاسەتی دەرەوەدا دەكرێت (سجاد پور، ١٣٨٣: ص٧٤).

٣- سیاسەتی دەرەوە لە سەر بنەمای خود و بابەت:

ئەم ڕوانگەیە لە ڕەگەز و فاكتەرەكانی هەردوو ڕوانگەی پێشووتـر پێكدێت كە سیاسەتی دەرەوە هەم فاكتەر و ڕەگەزی بگۆڕی تێدایە، وەكو: كودەتا، شۆڕش،

حیزبەکان یاخود ڕێککەوتن و هاوپەیمانییەتیەکان و هەم ڕەگەزەکانی جێگیری تێدایە، وەکو: کولتوور، جوگرافیا، مێژوو و...هتد (قوام، ١٣٨٥: ص١٠٤) .

**(٤-١-٢)- پۆلین کردنی بەهاکانی سیاسەتی دەرەوە:**

بە گشتی بەهاکانی سیاسەتی دەرەوە بەم شێوەیە پۆلین دەکرێن :

**ا- بەها ئاشکراکان:**

١ـ ئاسایش: بوونی ئاسایش لە هەمبەر هەڕەشە و مەترسیە ناوخۆیی و دەرەکییەکان.

٢ـ مانەوە: گرنگترین بەهای بوونناسانەیە بۆ هەر کیانێك یان بوونەوەرێك.

٣ـ سەروەت و سامان: سەرچاوەکانی هێزی ماددی و دارایی و ئابووری دەگرێتەوە.

**ب- بەها نائاشکراکان یان بەها شاراوەکان:**

١ـ کولتوور/ ناسنامە: بەهاکانی پەیوەست بە ناسنامە، بیروباوەڕی کولتووری ، ئایینی و ئایدۆلۆژیا.

٢ـ یەکسانی / دادپەروەری: ڕەچاوکردنی دادپەروەری بۆ بەهاکان.

٣ـ سەربەخۆیی: توانای سەربەخۆیی لە جێبەجێکردنی سیاسەتەکاندا .

٤ـ پێگە/ نفووز: پاریزراوبوونی ڕێز وحورمەت و ویستراویەتی یان دڵخوازبوون.

ئەم بەهایانە بە پێی تێگەیشتنی ڕێبەران و جۆری سیستەمی سیاسی و بڕوایی کەم بایەخ یان پڕبایەخ دەبن (لطفیان، ١٣٨٧: ص١٩٦). هەروەها چەمکی بەرژەوەندی نەتەوەیی، چەمکی بنچینەیی سیاسەتی دەرەوەیە کە بەها

نەتەوەییەکان لە خۆ دەگرێت و ڕەفتاری دەوڵەتان لە پانتای پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان لە ژێر کاریگەری پێناسەیەکدایە کە لە بەرژەوەندییەکان و ئامانجەکانی دەوڵەت دەکرێت، کە لەم سۆنگەیەوە جیهانی دەرەوە دەبینرێت و دۆست و دوژمنانی دەرەکی و ناوخۆیی پێدەناسرێتەوە و کردەوەکانیان ڕەهەندی ئەخلاقی وەردەگرێت (کلینتۆن، ١٣٧٩: ص١٧).

### (٢-١-٥) - ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوە:

بە گشتی ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوە دەکرێت بەم دوو شێوەیە پۆلین بکرێن: ١- لە ڕووی مەوداوە. ٢- لە ڕووی بابەتەوە.

(٢- ١- ٥- ١)- ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوە لە ڕووی مەودا :

١- ئامانجە کورت مەوداکان: زیاتـر هەنووکەیی و کاتین یاخود کاردانەوەن بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکان.

٢- ئامانجە مەودا مام ناوەندییەکان: وەك حەڵقەی نێوان ئامانجە کورت مەودا و درێژخایەنەکانن کە ئامانجانەکانی خۆشگوزەرانی گشتی، پرستیژی نێونەتەوەیی و... هتد لە خۆ دەگرێت، بە جۆرێك کە کۆمەڵێك ڕەفتاری دەرەکی، ویست و داواکاریەکانی ناوخۆیی جێبەجێ بکات.

٣- ئامانجە درێژ مەوداکان: ئەم ئامانجانە لە چوارچێوەی ئایدیا و بەها و بەرژەوەندییە درێژخایەنەکاندایە و لە چوارچێوەی سنوورە جوگرافیاییەکانی دەوڵەتدا قەتییس ناکرێتەوە و لە سەروو سنوورە نەتەوەییەکاندا بەدواداچوونی بۆ دەکرێت، وەك دروستکردنی حکومەتی جیهانی کۆمونیستی لە وڵاتانی کۆمۆنیزمی پێشوو یان دامەزراندنی حکومەتی جیهانی ئیسلام لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە (رجائی، ١٣٨٧: ص١٨٩).

**(٢- ١- ٥- ٢)- ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوە لە ڕووی بابەتەوە:**

١- ئامانجە ئابووری و داراییەکان: کە بەرزکردنەوەی ئاستی گەشەپێدانی خۆشگوزەرانی ئابووری وڵاتی مەبەستە، بەم مانایە کە گەیشتن بەدۆخی خوازراوی ئابووری.

٢- ئامانجە کولتووری و ئایدۆلۆژیکەکان: سیاسەتی دەرەوە تەنیا پەیوەندی ماددی نییە، بەڵکوو هەوڵدانە بۆ پاراستن و بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێك بەها و باوەڕی کولتووری و ئایدۆلۆژی، کە خەڵك بڕوایان پێ هەیە، وەکو: دێموکراسی، کۆمونیزم، ئیسلام و...هتد ( فرانکل، ١٣٦٩: ص١٢٠).

٣- ئامانجە ئاسایشی و سەربازی و بەرگریەکان: ئەم ئامانجانە لە سیاسەتی دەرەوەدا باڵاتـرین ئامانجەکانی دەوڵەتن کە لە لایەك بوون و مانەوە و لە لایەکی ترەوە یەکپارچەیی وڵات، دانیشتوان و پاراستن و پارێزگاری لە مانەوەی دەوڵەت لە خۆ دەگرێت و هەروەها ئاسایشی نەتەوەیی لە ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی دەگرێتەوە (خوشوقت، ١٣٨٥: ص١٥٣).

## (٢.٢)- تیۆرییەکانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان و سیاسەتی دەرەوە:

### (٢-٢-١)- ریالیزم:

بیرۆکەی ریالیزم لە فەلسەفەی سیاسیدا دەگەڕێتەوە بۆ توسیدێد، ماکیاڤیلی و توماس هۆبز، لە پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانیشدا دەگرێتەوە بۆ بیرۆکەکانی هانس مورگێنتاو، کە دەتوانن بە سەر پێنج بنەمای گشتیدا دابەشی بکەین:

١ـ مرۆڤ لە جەوهەردا بوونەوەرێکی شەڕئەنگێزە و ئەم شەرئەنگێزیەش لە ڕەفتاری دەوڵەتدا دەردەکەوێت و بەرجەستە دەبێت.

٢ـ شانۆی پەیوەندی نێونەتەوەیی، شانۆی ململانێی نێوان دەوڵەتەکانە بۆ بەدەستهێنانی هێزی زیاتـر.

٣ـ ململانێ بۆ هێزی زیاتـر، دەبێتە هۆی دروستبوونی ژینگەیەکی نێونەتەوەیی نائارام و ئانارشیك.

٤ـ باشتـرین ڕێگای دەستەبەر کردنی ئاسایش لە ژینگەی نێونەتەوەیی ئانارشیك و نائارامدا، پێشگرتن لە سەر بنەمای پشت بەخۆبەستنە.

٥ـ باشتـرین ئامرازی پێشگیریش، هێزی سەربازی و چەکی ئەتۆمیە (خلیلی، ١٣٩٠: ص١٩٨).

هەروەها بە شێوەیەکی تـر دەتوانین چوارگریمانەی ریالیزم، بەم شێوەیە پۆلین بکەین:

١ـ دەوڵەتان ئەکتەری سەرەکیی یا گرنگتـرین ئەکتەرانی نێونەتەوەیین تەنانەت نیوریالیستەکانیش سیستەمی نێونەتەوەیی لە سەر بنەمای دەوڵەت ـ نەتەوە، پێناسە دەکەن.

٢ـ دەوڵەت وەك بکەرێکی یەکپارچە و یەکگرتوویە.

٣ـ دەوڵەت بکەرێکی عەقڵانییە، بەم مانایە کە لە سیاسەتی دەرەوەی خۆیدا هەموو ئالتەرناتیڤەکان لە بەرچاو دەگرێت و لە نێوانیاندا لە سەر بنەمای سوود ـ زیان، باشتـرینیان هەڵدەبژێرێت.

٤ـ ئاسایش و بە تایبەت ئاسایشی سەربازی بەشێکە لە سیاسەتە باڵاکان.

بەم پێیە دەکرێت بڵێین کە دەوڵەتان لە سیاسەتی دەرەوەی خۆیاندا دەبێت بەم شێوەیە بن:

١ـ دروستکەرانی بڕیار و بکەرانی عەقڵمەند بن.

٢ـ بەدوای بە دەستهێنانی هێز و سەروەت و سامان لە چوارچێوەی بەرژەوەندی نەتەوەیی بن.

٣ـ خاوەن میتۆدۆلۆژیای زانستی بن.

٤ـ ژینگەی نێونەتەوەیی بەو شێوەیەی کە هەیە لە بەرچاو بگرن.

٥ـ سیاسەتی ئەخلاقی یان بەهایی پەیڕەو نەکەن (ابـراهیمی، ١٣٨٨: ص١٢١).

بە گشتی دەتوانین بڵێین کە بنەماکانی سەرەکی ریالیزم بـریتین لە :

١- دەوڵەتگەرایی: ئەکتەری سەرەکی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان دەوڵەتە و کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان و ڕێکخراوە ناحکومییەکان و ئەکتەرەکانی تـر لە چوارچێوەی پەیوەندی دەوڵەتاندا کار دەکەن.

٢- مانەوە: ئامانجی سەرەکی دەوڵەتان مانەوەیە و ئەمە باڵاتـرین بەرژەوەندی نەتەوەییە و لەم ڕوانگەیەوە بەدواداچوون، بەدەستهێنان و زیاتـرکردنی هێز ئامانجێکی لۆژیکی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتانە.

٣- پشت بەخۆبەستن: هیچ دەوڵەتێك جێی متمانە نییە، بەڵکوو هاوکاری و دۆستایەتی و هاوپەیمانییەتیش سنووردارن و دەوڵەتان دەبێت بۆ پاراستنی ئاسایش و مانەوەیان پشت بە هێزی خۆیان ببەستن (ستودە و شیخون، ١٣٨٩: ص١٠). هانس

مۆرگێنتاو[٣]، یەكێك لە تیۆریسییەنەكانی سەرەكی ریالیزم، دەوڵەتان لە ڕووی سیاسەتی دەرەوەدا، دابەشدەكات بۆ سەر دوو گروپی دەوڵەتانی لایەنگری پاراستنی دۆخی هەنووكەیی و دەوڵەتانی لایەنگری پێداچوونەوەخوازی، هەروەها ناوبـراو چەمكی بەرژەوەندی نەتەوەیی بە پێوەریكی بەردەوامی دەزانێت كە دەبێت سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان بەم پێوەرە هەڵسەنگاندنی بۆ بكرێت، واتا ئامانجەكانی سیاسەتی دەرەوە بە پێی بەرژەوەندییە نێونەتەوەییەكان پێناسە دەكرێت و بەرژەوەندی نەتەوەیی بە پێی هێز پێناسە دەكرێت و بڕوای وایە ئەوە هێزی دەوڵەتانە كە سنووری بەرژەوەندی و فۆرمی سیاسەتی دەرەوە دەستنیشان دەكات.

تیۆری ریالیزم بۆ شیكردنەوەی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان چەند خاڵی لاوازی هەیە، وەكو جەخت كردنەوە لە سەر ڕەگەزی هێزی ماددی دەوڵەت لە ناوخۆ و گرنگی پێنەدان بە بەربەستە پێكهاتەییەكانی دەرەوە، جێگیر تەسەور كردنی ناسنامەی دەوڵەتان، سەرنج پێنەدان بە ئەكتەرەكانی تـری ناو دەوڵەت، تێگەشتن و یەكپارچە تەسەور كردنی دەوڵەت و عەقلانی تەسەوركردنی دەوڵەت (عطایی و رسولی ثانی آبادی، ١٣٨٩: ص٢١١).

### (٢-٢-٢)- نییو ریالیزم:

نییو ریالیزم یان ریالیزمی پێكهاتەیی لە ڕێگەی هزرەكانی كنت والتز ناسێندرا. لە ڕوانگەی والتزەوە، تایبەتمەندی سەرەكی سیاسەتی نێونەتەوەیی پێكهاتەی ئانارشیك (پشێوی) یان نەبوونی هەر جۆرە سەرووەریەكە، لە ڕوانگەی والتزەوە ئەەوە پێكهاتەی ئانارشیكە كە سەرمەشقی سەرەكی سیاسەتی نێونەتەوەیی پێكدێنێت نەك

١- بۆ زانیاری زیاتر بروانە:

Morgenthau, H.J. (1985), **Politics among Nations**; New York: Alfred Knoph, Pp. 145 – 148.

سروشتی مرۆڤ (لین جۆنز، ١٣٨٥: ص٩٦). بە بڕوای کنت والتز، ولآتان لە پێکهاتەی ئانارشیکدا زیاتــر لەوەی بە دوای زیاد کردنی هێزی خۆیان بن بە دوای پاراستنی مانەوەی خۆیانن، بەم مانایەی کە هێزخۆی ئامانج نییە بەڵکوو ئامرازێکە بۆ دەستەبەر کردنی مانەوەی دەوڵەتان وەك سەرەکیتــرین ئامانج، دەکرێت لێرەدا بیــرۆکە یان تیۆری نیوریالیزم لە چەند خاڵدا بەم شێوەیە کورت بکەینەوە:

١ـ پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی ئانارشیکە.

٢ـ پەیوەندی نێونەتەوەیی گۆڕەپانی هەوڵدانە بۆ مانەوە.

٣ـ هەوڵدان بۆ مانەوە لە پەیوەندی نێونەتەوەییدا دەبێتە هۆی بەردەوامبوونی نەبوونی ئاسایش.

٤ـ باشتــرین رێگەی دەستەبەر کردنی ئاسایش لەم ژینگەیەدا پێشگرتن لە سەر بنەمای پشت بە خۆبەستنە.

٥ـ بەرزتــرین ئامرازی پێشگرتن، هێزی سەربازی و چەکی ئەتۆمیە (خلیلی، ١٣٩٠: ص٢٠١). رەخنەگران لە ریالیزم و نییو ریالیزم، بڕوایان وایە کە ریالیزم بە گشتی شیکردنەوەیەکی گشتگیــر و دروستی نییە، چونکە ریالیزم ناتوانێت گۆڕانکاری سیستەمی نێونەتەوەیی ڕوون بکاتەوە و گرنگی نادات بە ڕۆڵ و گرنگی کولتوور و ناسنامە لە ڕەفتاری دەوڵەتان وەك ئەکتەری سیاسەتی نێونەتەوەیی و هەندێ لە بیرۆکەکانی وەکو قبوڵ کردنی دەسەڵات و هێژمونی و جەنگ، سیمایەکی نائەخلاقی بۆ ئەم تیۆرییە دروستدەکات و لە لایەکی تــرەوە ریالیزم بە گرنگی پێدانی لە ڕادە بەدەر بە ڕۆڵی دەوڵەتان وەك گرنگتــرین ئەکتەرەکانی گۆڕەپانی نێونەتەوەیی ڕۆڵی بکەرەکانی تــر، وەکو رێکخراوە نێونەتەوەییەکان، کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان و...هتد، ڕەچاو ناکات و پرۆسەکانی دروستبوونی سیاسەتی دەرەوەی ولآتان لە بەرچاو ناگرێت (لین جونز، ١٣٨٥: ص١٠١ـ٩٨).

**(٢-٢-٣)- ئایدیالیزم:**

ئایدیالیزم ریشەی هزری جۆراوجۆری هەیە و کەسانێك وەکو: ژان ژاك رۆسۆ، جێرمی بێنتام و ئیمانۆیل کانت و...هتد، هەموویان لە سەر گەشبینی بۆ پێکهینانی ژیانێکی بەختەوەر و پڕ لە ئاشتی و ئاسایش بۆ مرۆڤ جەخت دەکەنەوە و بڕوایان بە توانای عەقڵی مرۆڤ هەیە و بۆیەش بڕوایان وایە کە دەکرێت بە دامەزراندنی دامەزراوەکانی بەردەوامی نێونەتەوەیی ڕێگە لە جەنگ و قەیران و نائارامی بگرن (نصری وافتخاری، ١٣٨٣: ص١٦٩). بیرۆکەی ئایدیالیزم بۆ سەردەمی رۆشنگەری و لیبرالیزمی سەدەی نۆزدە دەگەڕێتەوە. ئایدیالیستەکان جەخت لە سەر ئەوەی (دەبێت) بکرێت دەکەنەوە، نەك ئەوەی (هەیە)، لە ڕەفتارەی ئەندامانی کۆمەڵگەی نێونەتەوەییدا، هەروەها جەخت لە سەر گرنگی دامەزراوە و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان بە مەبەستی دابینکردن و پاراستنی ئاشتی و هەروەها گرنگی بە پەیوەندی دوو لایەنە و چەند لایەنە و ئاڵوگۆڕی بازرگانی بۆ پەرەپێدانی پەیوەندییەکان دەدەن (ابراهیمی، ١٣٨٨: ص١٢٩).

بە گشتی لێرەدا دەتوانین بیرۆکەی ئایدیالیزم بەم شێوەیە پۆلین بکەین:

١- مرۆڤ لە جەوهەردا بوونەوەرێکی عاقڵ و باش و خێرخوازە. دەوڵەتیش دامەزراوەیەکی هەڵقوڵاوی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیە.

٢- پەیوەندی نێونەتەوەیی پانتای هاوکارییە بۆ بەدیهێنانی ئاشتی بەردەوام.

٣- هاوکاری بۆ بەدیهێنانی ئاسایش دەبێتە هۆی دروستبوونی ژینگەیەکی نێونەتەوەیی ئارام و ڕێسامەند.

٤- باشترین ڕێگەی دەستەبەر کردنی ئاسایش لەم ژینگەیەدا، دامەزراندنی ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکانە.

٥ـ بەرزتــرین ڕێگەی دروستکردن و پاراستنی ئەم ڕێکخراو و دامەزراوانە بڵاوبوونەوەی دیموکراسیە (خلیلی، ١٣٩٠: ص٢٠٠).

## (٢-٢-٤)- بنەماکانی لیبــرالیزم:

١- ئاشتی دێموکراتیك و گرنگی پێدان بە گۆڕینی پێکهاتەی سیاسی کۆمەڵگەکان بۆ گەیشتن بە ئاشتی.
٢- سەروو نەتەوەگەرایی و جەختکردنەوە لە سەر سەرهەڵدان و پەیدابوونی بکەری نوێ لە ئاستی نێونەتەوەیی.
٣- جەخت کردن لە سەر ڕۆڵی بازرگانی و پەیوەندییەکان لە سەر کەم کردنەوەی جەنگ و دروستبوونی ئاشتی.
٤- دامەزراوەگەرایی و جەختکردن لە سەر ڕۆڵی دامەزراوە نێونەتەوەییەکان (مشیرزادە، ١٣٨٥: ص٢٧). بەم پێیەش لە ڕوانگەی لیبــرالیزم، بە پێی بەرژەوەندی هاوبەش یان جیاوازی دەوڵەتان، سێ شێوە لە کارلێك : ا- هاوکاری. ب- ململانێ. پ- هاوکاری و ململانێ، دروست دەبێت (عطایی و رسولی ثانی آبادی، ١٣٨٩: ص٢١٣).

## (٢-٢-٥)- نییو لیبــرالیزم:

لیبــرالیزمی نوێ کۆمەڵێك لە تیۆرییەکانی گرنگ وەکو: وەزیفی نوێ، پێکەوە بەستــراوەیی، دامەزراوەگەرایی، نییو لیبــرال و لایەنگرانی ڕژێمە نێونەتەوەییەکان، لە خۆ دەگرێت. ئەم ڕوانگە و تیۆریانە لە پاش گۆڕانکاریەکانی جەنگی دووهەمی جیهانی، ئەکتەری نوێ وەکو: ڕێکخراوە نێونەتەوەییە حکومی و ناحکومییەکان، کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان و تەنانەت گروپەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ شیکردنەوەی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان لە خۆ دەگرن، واتا

جیاوازی نێوان لیبــرالیزم و نیبو لیبــرالیزم، لە گرنگی پێدانی نیبو لیبــرالیزم بە ئاشتیگەرایی دیموکراسیەکان و متمانە بە ڕژێم و نۆرم (پێوەر) و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکانە (خلیلی، ١٣٩٠: ص٢٠٣).

### (٢-٢-٦)- ڕە فتارگەرایی:

بە سەرهەڵدانی شۆڕشی ڕەفتاری لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی بیستەم، پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان بە سەر دوو بەشی سەرەکی سیاسەتی نێونەتەوەیی و شیکردنەوەی سیاسەتی دەرەوەدا دابەش بوو، کە دەوڵەت لە ناوەندی ئەم دابەشکردنەدا بوو، کە بۆ شیکردنەوە و لێکدانەوەی سیاسەتی دەرەوە گرنگی بە تایبەتمەندیەکانی ناوخۆیی دەوڵەت دەدرا، لە کاتێکدا سیاسەتی نێونەتەوەیی گرنگی بە پەیوەندی نێوان دەوڵەتان دەدرا تاوەکو تایبەتمەندی سیستەم ڕوون بکرێتەوە، واتا لەگەڵ شۆڕشی ڕەفتاری، سیاسەتی دەرەوە وەك بەشێکی جیاواز دەرکەوت و فەزایەکی عەقڵگەرا، چەندایەتیگەرا و زانستگەرا باڵی بە سەر شیکردنەوەکاندا کێشا، لێرەوە سیاسەتی دەرەوە وەك پرۆسەیەکی ئاڵۆزی چەند ئاست، هەم ئامانجەکان لە خۆ دەگرێت و هەم ئامرازەکانی گەیشتن بەم ئامانجانە (هادیان، ١٣٨٢: ص٥٠ ـ٤٩). شۆڕشی ڕەفتاری لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕۆژئاوا بە ناوەندیەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕەخنە لە ئایدیالیزم و ریالیزم دەگرێت و جەخت لە سەر میتۆدۆلۆژی دەکاتەوە و بڕوایان وابوو کە بۆ تێگەیشتن لە زانستی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان دەبێت لە میتۆدۆلۆژی چەندایەتی زانستەکان، وەکو: بیرکاری، زانستە سروشتیەکان، ئابووری، دەروونناسی و کۆمەڵناسی سوود وەربگرین (کلبون و سورنسون، ١٣٨٣: ص٦٧).

**(٢-٢-٧)- پاش ڕەفتارگەرایی:**

کاردانەوەی ریالیستەکان و ئایدیالیستەکان لە هەمبەر بزوتنەوەی زانستگەرایی بووە هۆی گفتوگۆی نوێ لەم نێوان تیۆرییەکانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان و سەرهەڵدانی ریالیزمی نوێ و لیبرالیزمی نوێ بەڵام لە گفتوگۆ نوێیەدا کۆمەڵێك گفتوگۆی تر سەریهەڵدا. لە کۆتایی دەیەی شەستی زایینی سەدەی رابردوو و دەرکەوتنی خاڵە لاوازەکانی زانستگەرایی، ئەم گفتوگۆیە دروستدەبێت و گفتوگۆکانی پێشووتری نەریتگەراکان و ڕەفتارگەراکان و مشتومرەکانیان لە سەر بابەتەکان وەکو: ((ئیمکانی دیراسەتی زانستی لە سیاسەتدا بوونی نییە)) یان ((زانستی سیاسەت بە بێ بەچەندایەتیکردن و رزگارکردن لە کۆت و بەندی بەهاکان سوودی نییە))، وەلاوەنا. پاش ڕەفتارگەراکان هەوڵیاندا کە هەندێ ڕەگەز و ڕوانگەی زانستی بۆ ئامانجە بەهاییەکان بەکاربێنن وەکو: کۆنترۆڵکردنی چەکی ئەتۆمی، چارەسەر کردنی ئاشتیانەی ناکۆکیەکان، کۆنترۆڵی دانیشتوان، بنەبڕکردنی هەژاری و نەخۆشیە سنووربڕەکان و پاراستنی ژینگە و...هتد، بەم مانایە کە ڕوانگەی پاش ڕەفتارگەرایی هەوڵ دەدات کە لە هەردوو جۆری شیکردنەوەی چەندایەتی و چۆنایەتی هەروەها دروستکردنی پەیوەندی وردتر لە نێوان ئاستەکانی شیکردنەوە و بکەرانی پەیوەندیدار وەکو: تاك، دەوڵەتان و سیستەمی نێونەتەوەیی دروستبکات (کولومبیس و وولف، ١٣٧٥: ص ١٠٩-١٠٨). هەندێ لە تیۆریسیەنەکانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان، وەکو: ئۆلە ویور[٤] و

---

١- بۆ زانیاری زیاتر بروانە:

Waever, Ole. (1997), **Figures of International Thought: introducing Persons instead of Paradigms**; London and New York: Routledge, Pp.1-29.

مایکل بێنکس، بڕوایان وایە کە گفتوگۆی نوێ لە نێوان سێ قوتابخانەی سەرەکی ریالیزم، لیبرالیزم و مارکسیزمدایە، هەروەکو ویور، لە ساڵی (١٩٩٧)دا ڕایدەگەێنێت کە گفتوگۆی نێوان سێ پارادایمی: پلۆرالیزم و وابەستەیی، کۆمەڵگەی جیهانی و رادیکاڵیزم و پێکهاتەگەرایی و گلۆبالیزم، لە کۆتایی دەیەی(١٩٧٠)ی زایینی دەرکەوت، لە کاتێکدا کە لە پارادایمی ریالیستی جەخت لە سەر بکەرایەتی دەوڵەتان دەکرێتەوە، لە پارادایمی لیبرالیستی تاکەکان و گروپەکان پەیوەندی نێوان دەوڵەتان باشتردەکەن، بەڵام لە پارادایمی مارکسیستیدا چینەکان و پێکهاتە ئابووریەکان ململانێ بە سەر پەیوەندی نێوان دەوڵەتان زاڵدەکەن (قنبرلو، ١٣٩١: ص٢٤٩). هەندێ لایەنیش گفتوگۆی نێوان ریالیزمی نوێ و پۆست پۆزیتیڤیزم بە گفتوگۆی نوێ دەزانن، کەئەمەش بە هۆی زاڵبوونی ریالیزمی نوێ و ڕەخنەکان لەم تیۆرییە لە لایەن قوتابخانەی ڕەخنەیی (فرانکفۆرت)، پۆست مۆدێرنیستەکان، کومەڵناسی مێژوویی و فمێنیزم وهەروەها پۆست پۆزیتیڤیزمەکان کە لە سەر مێژوویایەتی، کۆمەڵایەتی بوون و دروستکراوەیی بوونی ناسین (مەعریفە)جەخت دەکەنەوە و پێکهاتەگەرایی زانستی کنت والتز، رەتدەکەنەوە و بڕوایان وایە کە زانستی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان دەبێت بگۆڕدرێت بۆ هەلومەرجێکی دادپەروەرانەتر، ئەمنتر و مرۆڤانەتر، لە کاتێکدا مۆدێرنیستەکان بە گشتی زیاتر پارێزگارن و داکۆکی لە دۆخی هەنووکەیی دەکەن، بە گشتی ئەم ڕەوشە بە گفتوگۆی نێوان پۆزیتیڤیزم لە هەمبەر پۆست پۆزتیڤیزم، عەقڵگەرایی لە هەمبەر پێداچوونەوەخوازی، بنەماخوازی لە هەمبەر دژە بنەماخوازی و تیۆرییەکانی شیکردنەوە لە هەمبەر تیۆرییەکانی تەکوینی، ناوزەد دەکرێت (قنبرلو، ١٣٩١: ص٢٥١).

## (٢-٢-٨)- تیۆری دروستکردنی بڕیار لە سیاسەتی دەرەوەدا:

### (٢-٢-٨-١)- پێناسە و ناساندن:

بۆ پێناسەکردنی بڕیاردان و دروستکردنی بڕیار کۆمەڵێك پێناسەی جۆراوجۆر کراوە، بەڵام زۆربەیان لە سەر ئەم بابەتە جەختدەکەنەوە کە بڕیار لە سەر هەڵبژاردنی تاك ڕاوەستاوە و تاك ئەم هەڵبژاردنە لە نێوان ئەلتەرناتیڤەکانی بەردەست ئەنجام دەدات، ئەم پێناسانە بۆ نموونە دەخەینە ڕوو:

دروستکردنی بڕیار بـریتیە لە هەڵبژاردنی ڕێگەیەك لە نێوان ڕێگە جیاوازەکاندا (الوانی، ١٣٧٣: ص١٩٣). دروستکردنی بڕیار پڕۆسەیەکە لە ڕێگەیەوە چارەسەری پرسێکی دیاریکراو هەڵدەبژێردرێت (رضائیان، ١٣٧١: ص١٣٨). دروستکردنی بڕیار پرۆسەیەکە کە لە میانەی ئەم کارەدا، شێوازێکی تایبەتی کار بۆ چارەسەر کردنی پرس یان کێشەیەك هەڵدەبژێرێت (استونر، ١٣٧٩: ص ١٥٩). یان دەگوتـرێت دروستکردنی بڕیار تەنیا کاری هەڵبژاردنە لە نێوان ڕێگە چارەکانی بەدیل کە لە بەردەستە و دەربارەیانەوە دڵنیاییمان نییە، یان بە پێی بۆچوونی دیڤید ئیستێن، بڕیارەکان دەرچووەکان یان دەرهاویشتەکانی سیستەمی سیاسین کە لە ڕێگەی ئەوانەوە بەهاکان بە شێوەی دەسەڵاتدارانە لە نێو کۆمەڵگەیەکدا دابەشدەکرێن (دوئرتی و فالتزگراف، ١٣٨٨:ص٧١٩). بەکارهێنانی دروستکردنی بڕیار لە تیۆرییەکانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی پەنجای سەدەی بیستەم کە لە لایەن کەسانێك وەکو: ساپین، بـروك، هێربێرت سایمۆن و ریچاردشنایدر، داڕێژرا و دواتـر کەسانێك وەکو: جۆزێف فرانکل و گراهام ئالیسۆن، هاتنە ناو ئەم بازنەیەوە، ریچاردشنایدر و هاوکارەکانی تایبەتمەندییەکانی جیاکەرەوەی دروستکردنی بڕیار لە سیاسەتی دەرەوەدا بەم شێوەیە باسی لێوە دەکەن:

- رێژەیەکی بەربلاوتـر لە ئامانجەکان و پلانی مومکین و لە ئەنجامدا رێژەیەکی زیاتـر لە تێگەیشتنە مومکینەکان.

- رێژەیەکی بەرفراوانتـر لە موخاتەب کە یەك جۆر نین و کاردانەوە و خواستی زیاتـری دژبەیەك چاوەڕوان دەکرێت.

- بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتن دەبێت ڕێژەیەکی بەرفراوان لە ڕوانگەکان لەگەڵ یەکتـر ئاوێتە بکرێن.

- هەلومەرج و بارودۆخی وەرگرتنی بڕیار جگە لە ئالۆزی زیاتـر بەردەوامی و دڵنیایی کەمتـریان هەیە و لەم ڕووە کۆنتـرۆڵی دەرئەنجام و پێشهاتەکان زەحمەتتـر دەبێت.

- سەرچاوەکانی زانیاری بەربلاون و دڵنیایی کەمتـریان لە سەرە بەم هۆیەشەوە پۆلین کردنی زانیارییەکان گرنگی زۆری هەیە.

- نەبوونی ڕێژەیی دەرفەتی ئەزموونکردن و کەمتـربوونی ژمارەی بارودۆخەکانی دووبارەبوونەوە.

- پێویستی لێکدانەوە و شیکردنەوەی هەڵبژاردە جۆراوجۆرەکان کە بە ئاسانی ناسەلمێندرێن.

- بوونی مەودای زەمەنی لە نێوان ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ کێشە یان دۆخێك وئاشکرابوونی ڕەهەندەکانی

- ئەگەری بەربلاوتـربوونی ململانێیە بەهاییە بنەڕەتیەکان و لە ئاکامدا پێویستی گەیشتن بە ڕێککەوتنی گشتگیر (اسنایدر، ١٣٨٩: ص١٤٦).

(٢ـ٢ـ٨ـ٢)- پێکهاتەی دروستکردنی بڕیار:

پێکهاتەی دروستکردنی بڕیار یان سیاسەت دارشتن بە مانای پۆلین کردنی ریزبەند و پێگەیەکە کە سیاسەت داڕێژەران و دامەزراوەکانی دروستکەری بڕیار لە

پرۆسەی دارشتن وجێبەجیێ کردنی سیاسەتی دەرەوەدا ڕەچاوی دەکەن. دروستکردنی بڕیار لە سیاسەتی دەرەوەدا لە لایەن ئەکتەرەکان و دامەزراوەکان و ڕێکخراوەکانەوە دەکرێت کە لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاردا پێگە و ئاستی دیار و دەستنیشانکراویان هەیە (دهقان فیروز آبادی، ١٣٨٨: ص٢٤٧). لە پێکهاتەی دروستکردنی بڕیار سەرنج پێدان بە دوو پرس گرنگە: یەکەم: پێکهاتە و دامەزراوەی فەرمی و نافەرمی دروستکردنی بڕیار. دووەم: سەرنج پێدان بە ڕۆڵ و گرنگی ڕەگەزەکانی دروستکردنی بڕیار لە سیاسەتی دەرەوەدا. بۆیە هەندێ لە لێکۆڵەرانی سیاسەتی دەرەوە سەرنجی خۆیان لە سەر ڕەگەزەکانی کاریگەر و شوێندانەر لە بڕیار وەگرتن دادەنێن، ئەوان جیاوازی لە ڕۆڵ و پێگەی ڕەگەزەکانی دروستکردنی بڕیار دەگەڕێننەوە بۆ جۆری سیستەم و سیستەمی سیاسی، کە لەم زانایانەش دەتوانین ئاماژە بە جیمز رۆزینا، بکەین (سلیمانی، ١٣٩٠: ص ٣٣٣).

### (٢-٢-٨-٣)- پرۆسەی دروستکردنی بڕیار:

پرۆسەی دروستکردنی بڕیار، شێوازی گۆڕینی پێدراوەکانی سیستەمی سیاسی بۆ بڕیار وەرگرتن لە خۆ دەگرێت، بە مانایەکی تـر پرۆسەی دروستکردنی بڕیار باس لە کەناڵ و ڕەوتێکە کە بڕیارێك لە قۆناغی سەرەتایی تا قۆناغی وەرگرتنی بڕیار تێدەپەرێت و لە چوارچێوەی پرۆسەی دروستکردنی بڕیار دەبێت گرنگی بدەین بە ڕۆڵی وەزارەتی دەرەوە وەکو دامەزراوە و بەرپرسی سەرەکی دروستکردنی بڕیار لە سیاسەتی دەروەی دەوڵەتدا (خوشوقت، ١٣٨٢: ص٩٢).

**(٢ـ٢ـ٨ـ٤)- فاكتەرەكان و سەرچاوەكانی كاریگەر لە سەر دروستكردنی بڕیار:**

مەبەست لە فاكتەرەكانی كاریگەر لە سەر دروستكردنی بڕیار لە ڕاستیدا ئاماژەیە بۆ ئەو توانا و ئیمكانیات و بەربەستانەی كە بڕیار وەرگر دەبێت لە كاتی وەرگرتنی بڕیاری مەبەست ڕەچاویان بكات. كە گرنگترینیان ئاست و ڕادەی هێز و توانای دەوڵەت لە بواری ناوخۆ و دەرەوە، هەروەها كۆمەڵە فاكتەر و هۆكاری ناوخۆیی ودەرەكی لە خۆ دەگرێت و هەر دەوڵەتێك كە سەرچاوەی هێزی زۆری هەبێت، ئەوە سەرچاوەی كاریگەری بۆ بڕیاردان هەیە (رمضانی، ١٣٨٠: ص٣٨).

**(٢ـ٢ـ٨ـ٥)- مۆدێلەكانی دروستكردنی بڕیار:**

ئالیسۆن، چەند مۆدێلیك بۆ دروستكردنی بڕیار دادەنێت وەكو سەرمەشق یان نموونەیەك وایە بۆ دروستكردنی بڕیار لە سیاسەتی دەرەوەدا، وەكو: ئەكتەری عەقڵمەند، پرۆسەی ڕێكخراوەیی و سیاسەتەكانی بیرۆكراسی، هەرچەند ئالیسۆن بڕوای وایە كە مۆدێلی زاڵ هەر مۆدێلی ئەكتەری عەقڵمەند یان مۆدێلی عەقلانییە (سیف زادە، ١٣٨٤: ص ٣٤٨). ئەم مۆدێلە لە سەر ئەم بنەمایە دروستبووە كە مرۆڤ وەك بوونەوەرێكی ئابووری و عاقڵ لە ژینگەیەك كە بە تەواوی بۆی دیار و ئاشكرایە باشترین هەڵبژاردن دەكات و باشترین هەڵبژاردنیش بریتیە لە سەركەوتن لە بەدەستهێنانی هەموو ئامانجەكانی ڕێكخراوەكە و گەیشتن بە ئامانجی ویستراو، ئەم هەڵبژاردنەش لە سەر ئەم گریمانانە راوەستاوە:

١- دروستكردنی بڕیار لە هەلومەرجێكی دڵنیایی تەواودا دەبێت.

٢- بڕیار وەرگر هەموو زانیارییەكانی بە شێوەی تەواو لەبەردەستیدایە و توانای پێویستی بۆ كەڵك لێوەرگرتنیانی هەیە.

٣- پێوەرەکانی هەڵبژاردن ئاشکرا و ڕوونە و بڕیار وەرگر خاوەن سیستەمێکی لۆژیکیە کە دەتوانێت بە ڕێکخستنی بەهاکانی ڕێگە جیاجیاکان پۆلین بکات.

٤- بڕیار وەرگر لەگەڵ ئەوەی کە دەتوانێت دەرئەنجامەکان لە ڕووی ئابووری و بەهاکانی تـرەوە هەڵبسەنگێنێت و لەگەڵ ڕێگەکانی تـر بەراوردیان بکات، لە هەڵبژاردنیشدا ئازادی تەواوی هەیە.

٥- لە چوارچێوەی ئەم گریمانانەدا بڕیار وەرگر دەتوانێت ڕێگەیەك هەڵبژێرێت کە باڵاتـرین بەهای لە ڕووی ماددییەوە هەیە (استونر و دیگران، ١٣٧٩: ص١٦٦). هەروەها لیتێل دەربارەی مۆدێلی ئەکتەری عەقڵمەند بە شێوەی هەڵبژاردنی عەقڵانی، بڕوای وایە کە لەم مۆدێلەدا وا گریمان دەکرێت کە مرۆڤەکان لە نێوان چەند ڕێگەدا، ئەو ڕێگەیە کە لەگەڵ مەبەستەکانیان هاوتەریبە هەڵدەبژێرن و بۆ تێپەڕین لە هەر ڕێگەیەك هەڵسەنگاندنی سوود و زیان دەکەن و لە دوای لێکدانەوە بە ڕێگەیەکدا دەڕۆن (لیتل، ١٣٨٨: ص٦٤).
لە سیاسەتی دەرەوە و پەیوەندییە نێونەتەوەییەکاندا، تیۆری هەڵبژاردنی عەقڵانی لە لایەن ئالیسۆنەوە لە ژێر ناونیشانی ئەکتەری عەقڵمەند، دارێژراوەتەوە و بە بڕوای ئالیسۆن، هەوڵدان بۆ گۆڕانکاری لە ڕووداوە نێونەتەوەییەکان لە سەر بنەمای ئامانجەکان و هەڵسەنگاندنی نەتەوەکان و دەوڵەتان نیشانەی مۆدێلی ئەکتەری عەقڵمەندە (الیسون، ١٣٦٤: ص٣٦). بە شێوەیەکی گشتی فاکتەرەکانی کاریگەر لە سەر دروستکردنی بڕیار لە سیاسەتی دەرەوەدا بـریتین لە: بەها کۆمەڵایەتییەکان، تایبەتمەندیەکانی بڕیار وەرگران، ناسیۆنالیزم، ئایدۆلۆژیا، ڕای گشتی، گەڕانەوە بۆ بڕیارەکانی ڕابـردوو، پێویستیەکانی دەوڵەت و گروپەکانی بەرژەوەندی و گوشار، کەسایەتی ڕێبەرانی باڵای نەتەوەیی، جۆری حکومەت وسیستەم ، پێگەی هێز و توانای دەوڵەت، پێگە و ڕۆڵی دەوڵەت لە پانتای نێونەتەوەیی و هەلومەرجی نێونەتەوەیی (سلیمانی، ١٣٩٠: ص٣٣٥).

### (٢-٢-٨-٦)- ڕەخنە لە مۆدێلی ئەکتەری عەقڵمەندی دروستکردنی بڕیار:

لە پاڕادایمی ریالیستیدا دەوڵەتان وەك ئەکتەری هاوشێوە و هاوئامانج پێناسە دەکرێن کە بەدوای زیاتـرین ڕادەی قازانج و کەمکردنەوەی زیانن لە فەزای ئانارشیکی سیستەمی نێونەتەوەییدا، کە ئەمەش هەڵقولاوی گریمانەکانی سەردەمی رۆشنگەری و ڕوانگەی سوودگەراییە. لەگەڵ جەختکردنەوەیان لە سەر گرنگی عەقڵ و پەروەردە لە هەڵبژاردنەکانی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتیدا، کە ئەم مرۆڤە بە پێی ریزبەندی بەهاکانی خۆی هەڵبژاردن دەکات، کە ڕاستی و دروستی ئەم گریمانەیە ئێستا لە ژێر پرسیاردایە (دوئرتی و فالتزاك، ١٣٨٨: ص٧٢٧). تێڕوانینی ئابووری بۆ سروشتی مرۆڤ وایکردوە کە ڕۆڵ و کاریگەری هەست و سۆزەکان و بەها و سیستەمی بیروباوەڕەکانی مرۆڤ لە دروستکردنی بڕیار کە ڕۆڵی کاریگەریان هەیە پشتگوێ بخرێت. بە گشتی ڕەخنەکان بەم شێوەیە پۆلین دەکەین:

١- ڕەخنەی میتۆدۆلۆژی: ئەم ڕەخنانە دەگەرێتەوە بۆ ئەو میتۆد و شێوازانەی کە مۆدێلی ئەکتەری عەقڵمەند لە بەدەستهێنانی زانیاری و لێکدانەوە و شیکردنەوەیان پەیڕەوی دەکات، دەروونناسی ناسین، گریمانەکانی مۆدێلی ئەکتەری عەقڵمەند لە کردەوەدا بە قابیلی جێبەجێ کردن نازانێت، چونکە زەین توانای ئەنجامدانی ئەو هەموو لێکدانەوە ئاڵۆزەی نییە، هەروەها تێچووی ماددی کۆکردنەوەی ئەو قەبارە زۆرە لە زانیاری، گوشار و دڵەڕاوکێ، ناڕوونی، کێشە لە وەبیرهێنانەوە، بە هەڵە تێگەیشتن و پێکهاتەی ڕێکخراوەیی، کاریگەریان لە سەر بڕیاردان دەبێت (Mintz and Derouen,2010:p.8). هەروەها ناڕوونی ئامانجەکان لە واقعدا، نامومکین بوونی ناسینی هەموو بەدیلە بەردەستەکان و دەستپێڕانەگەیشتن بە هەموو زانیارییەکان کە وادەکات بە هۆی قەبارەی زانیارییەکان، ئاستی توانا تاکەکەسیەکان، سەرچاوەکانی بەردەست، کات و جیاکردنەوەی واقع لە بەهاکان، لە کردەوەدا نەتوانین هەڵبژاردنێکی تەواو و عەقڵانیمان هەبێت

(سعادت،١٣٧٢: ص٢٤ ـ٢٣). هێربێرت سایمۆن، بە شێوەیەکی بنەڕەتی ڕەخنەی لە بنەماکانی میتۆدۆلۆژی مۆدێلی دروستکردنی بڕیاری عەقڵانی گرتووە، سایمۆن بڕوای بە عەقڵانییەتێکی سنووردار هەیە و بۆیە چەمکی (ڕەفتاری باوەڕپێهێنانی) لە جێگەی (ڕەفتاری زیاتـرین و باشتـرین) داناوە، بەم مانایەکە یەکەی وەرگرتنی بڕیار کاتێك بە کەمتـرین ئاست و ڕادەی باوەڕپێهێنان بە بەدیلێك یان هەڵبژاردنێك دەگات، ئەوە بڕیار وەردەگرێت (دوئرتی و فالتزاك، ١٣٨٨: ص٧٢٩).

٢- ڕەخنەکانی بوونناسی: ڕەخنە بوونناسییەکان زیاتـر لە هەر شتێکی تـر لە سەر ڕەخنەگرتنە لە پێناسەی ماددیگەرایانە لە گەوهەر و سروشتی مرۆڤ، کە گرنگی نادات بە ڕۆڵی بیروباوەڕ و بەهاکانی مرۆڤ لە دروستکردنی بڕیاردا و زیاتـر ڕوانگەکانی ماتـریالیستی، چەندایەتیگەرا و ئابووریانەی دروستکردنی بڕیار ڕەچاو دەکرێت (تسلیمی، ١٣٧٨: ص٨٥). هەروەها لە ڕەخنەگرتن لە تێگەیشتنی ماددیانە لە عەقڵانییەت دەبێت ئەوە ڕەچاو بکەین کە ناتوانین ڕەفتاری مرۆڤەکان تەنیا لە ڕووی سوود و زیان ڕاڤە بکەین، چونکە بەرپرسیارەتی تاکەکەسی و سیاسی و ئەخلاقی چەمکی عەقڵانییەت ئاڵۆزتـر دەکات، چونکە نۆرم، بەها، بنەماکانی کولتووری، بیروباوەڕەکان و ئایین، ڕەفتاری مرۆڤ ئاراستەدەکەن و مرۆڤ کۆمەڵێك بەرژەوەندی بۆ خۆی پێناسە دەکات کە تەنیا تایبەت نییە بە سوودی ماددی و تاکەکەسی (لیتل، ١٣٨٨: ص٩٩). بە گشتی دروستکردنی بڕیار بە تایبەت لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا زۆر لە مۆدێلە سادەکراوەکانی باو ئاڵۆزتـرە بە هۆی ئەوەی کە هۆکاری تـری ژینگەیی و سیستەمی و بیروباوەر و بەهاکانی کۆمەڵگە کاریگەریان لە سەر دەبێت« بەتایبەت کاتێك کە بازنەی بەهاکان لە بڕواکانی تاکەکەسی بڕیار وەرگر سەرووتـر بچێت و لەگەڵ سروشتی سیستەمی سیاسی گرێدرابێت.

**(٢-٢-٩)- ڕەخنەگەرایی و عەقلگەرایی :**

بە شێوەیەکی گشتی ئێمە دەتوانین تیۆرییەکانی سیاسەتی دەرەوە و پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان بە سەر دوو ڕەوتی گشتی عەقڵگەرایی و ڕەخنەگەراییدا دابەش بکەین. تیۆرییەکانی ڕەخنەگەراییش لە چەند ڕوانگەی تر وەکو: پۆست مۆدێرنەکان، پاش پێکهاتەگەرایی، قوتابخانەی ڕەخنەیی فرانکفۆرت و فێمێنیستەکان و کۆنستراکتیڤیستەکان پێکدێت. جیاوازی نێوان تیۆرییەکانی ڕەخنەگەرایی و تیۆرییەکانی عەقڵگەرایی بە شێوەیەکی گشتی لەو ڕەخنانەدا دەردەکەوێت کە ڕەخنەگەراکان لە تیۆرییەکانی عەقڵگەرایی دەیگرن کە بە سەر سێ بواری سەرەکیدا دابەشدەبێت أ- **ڕەخنەی بووناسی**. ب- **ڕەخنەی مەعریفەناسی**. ت- ڕەخنەی میتۆدۆلۆژی.

**أ- ڕەخنەی بووناسی:**

ڕەخنەگەراکان بە گشتی و کۆنستراکتیڤیستەکان بە تایبەت، سێ پێدراوی بووناسی سەرەکی عەقڵگەراکان دەربارەی ژیانی کۆمەڵایەتی و دەرهاویشتە سیاسییەکانی دەخەنە ژێر پرسیار، یەکەمیان: ڕەخنەگەراکان گرنگی بە پێکهاتە هزرییەکان و هەروەها پێکهاتە بەهایی و پێوەرییەکان دەدەن لە پاڵ پێکهاتە مادديیەکانی پەیوەندیدار (wendt,1992:p.397). دووەمیان: ڕەخنەگەراکان بڕوایان وایە کە ناسنامەکان, بەرژەوەندی و ڕەفتارەکان دروست دەکەن (wendt,2003:p.36-37). سێیەمیان: بڕوایان وایە کە پێکهاتەکان و بکەرەکان بە شێوەی دوو لایەنە دروستدەکرێن، بۆ نموونە: تیۆری کۆنستراکتیڤیزم بە جەخت کردنەوە لە سەر گرنگی نۆرم یان پێوەرە زەینییەکان لە پاڵ پێکهاتە مادديەکان، تەرکیز لە سەر ڕۆڵی ناسنامە لە دروستکردن یاخود فۆرم پێدان بە

کردەوەی سیاسی و پەیوەندی دوو لایەنەی بنیاتنەر لە نێوان پێکهاتە و بکەردا دەکات (Ruse-Smit, 2005:p.188-189).

**ب- ڕەخنەی مەعریفەناسی:**

لە ڕووی مەعریفە ناسییەوە، عەقڵگەراکان پابەندن بەو ڕوانگەیەوە کە بە پۆزێتیڤیزم دەناسرێت، ئەوان بڕوایان وایە کە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان کە بەها و راستی جیاوازیان هەیە دەتواندرێت لە سەر بنەمای ڕێبازی سروشتی شیبکرێنەوە و پێداچوونەوەی زانستی دەبێت لە سەر ڕاستی و ناڕاستی ئەزموونی بێت بۆ دۆزینەوەی ڕێساکان، بەم مانایە کە ئەکتەرەکان لە جیهانێکدا کار و چالاکی دەکەن کەپێشتــر دیاریکراوە، لە کاتێکدا ڕەخنەگەراکان و بە تایبەت کۆنستــراکتیڤیستەکان، ئەمانە دەخەنە ژێر پرسیار و جەخت لە سەر ناسنامەکان لە بنیاتنان و دروستکردنی بەرژەوەندی و ڕەفتار و کردەوەی سیاسی بکەر یان ئەکتەرەکان دەکەنەوە (Wendt, 2003:p.37-38).

**ت- ڕەخنەی میتۆدۆلۆژی:**

لە ڕووی میتۆدۆلۆژییەوە، ئەگەر ئێمە ناسنامە و بەرژەوەندی بە پێشووتــر و پێشتــرپێدراو بزانین، ئەوە گرنگی فاکتەر و ڕەگەز و هێزە ماددیەکانمان بۆ دەردەخات، بۆ نموونە: نییو ریالیزم بڕوای وایە کە بەرژەوەندی دەوڵەتان لە پێکهاتەی ماددی ئانارشیکەوە سەرچاوە دەگرێت، لە کاتێکدا ڕەخنەگەراکان بە تایبەت کۆنستــراکتیڤیستەکان نیشاندەدەن کە بە چ شێوەیەك بارودۆخە نێوان زەینییەکان بە شێوەی سەرەتایی بەرژەوەندی و هێزی ماددی بنیات دەنێن یاخود دروستیدەکەن (Wendt, 2003:p.34-35).

### (٢-٢-١٠)- تیۆری ڕەخنەگەرایی:

تیۆریسییەنەكانی ڕەخنەگەرایی پەیوەندییە نێونەتەوەییەكان، وەكو: ڕۆبێرت كۆكس[٥]، ئەندرۆلینكلێتەر[٦]، هەروەها ئێستیێفان گیل و ریچارد ئاشلی، لە ژێر كاریگەری قوتابخانەی ڕەخنەگەرایی فرانكفۆرتدا، ئەگەری گۆڕانكاری لە پەیوەندییە نێونەتەوەییەكانیان خستۆتە بەر باس و لێكۆلینەوە (قنبرلو، ١٣٩١: ص٢٦١). گرنگترین ئامانج و بەرنامەی كاری تیۆری ڕەخنەگەرایی بۆ نموونە قوتابخانەی فرانكفۆرت كە ریشەی لە بیروڕا فەلسەفیەكانی بیرمەندانێك وەكو: تیۆدۆر ئۆدرنۆ، هۆركهایمێر، هێربێرت ماركۆز، یۆرگن هابێرماس و مارك هافمەن دایە، كە لە بواری سیاسەتی نێونەتەوەییدا بەكاریان هێناوە. بە شێوەی گشتی تیۆری ڕەخنەگەرایی، ڕەخنە لە ئایدۆلۆژیا و گوتاری زاڵی عەقڵگەرایی لە پەیوەندییەنێونەتەوەییەكاندا دەگرێت. تیۆری ڕەخنەگەرایی لە ڕووی بووناسییەوە سیما و تێگەیشتنی بكەرە كۆمەڵایەتییەكان بە شێوەی خۆویست و ئەتۆمیزەكراو دەخاتە بەر ڕەخنە كە تەنیا بۆ دەستەبەر كردنی ئامانج و ویستەكانیان پێشتر لە پرۆسەی تەعامولی كۆمەڵایەتی دروستبووە، لە بەرامبەردا تیۆری ڕەخنەیی وا گریمان دەكات كە ناسنامە و بەرژەوەندی بكەرەكان بە شێوەی كۆمەڵایەتی دروستدەكرێت و بەرهەمی پێكهاتە كۆمەڵایەتییەكانی نێوان زەینینە، هەروەها لە ڕووی مەعریفە ناسییەوە تیۆری ڕەخنەیی، ڕوانگەی پۆزێتیڤیزمگەراكان

---

١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

Cox, Robert, W. (1981), **Social Forces, States and World order: Beyond International Relation Theory**; Millennium, Pp.55-126.

٢- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

Linklater, Andrew. (2007), **Critical Theory and World Politics: Citizen Ship, Sovereignty and Humanity**; London and New York: Routledg, Pp.15-29.

دەخاتە ژێر پرسیار و میتۆدەکانی تەفسیری لە تێگەیشتن دەکاتە بنەما بۆ دیاردەکان (دهقانی فیروزآبادی، ١٣٨٧: ص١٣٠-١٢٩).

لە ڕوانگەی تیۆری ڕەخنەگەراییەوە سیاسەتی دەرەوە لە سەر ئەم بنەمایانە راوەستاوە:

١ـ میتۆدێکی گشتگیر بۆ شیکردنەوەی سیاسەتی دەرەوە بوونی نییە.

٢ـ تیۆرێکی تاقانە بۆ شیکردنەوەی ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەی بکەرەکان لە هەر کات و شوێنێك ڕاست و دروست نییە.

٣ـ وڵاتانی جیاواز بە هۆی ناسنامەی جیاوازەوە، ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەیان جیاوازە لە یەکتری.

٤ـ پێکهاتە کۆمەڵایەتییە نامادديەکان ڕۆڵی کاریگەریان لە ئاراستەکردنی سیاسەتی دەروەی وڵاتاندا هەیە. تیۆری ڕەخنەیی سیاسەتی دەرەوە، گرنگی بە پەیوەندی دوولایەنەی پێکهاتە (نەتەوەیی و نێونەتەوەیی) و بکەر یان ئەکتەر دەدات لە سیاسەتی دەرەوەدا. بە وتەی ڕۆبێرت کۆکس، سیاسەتی دەرەوە بەرهەمی تەنیا دەوڵەتان یان سیستەمی نێونەتەوەیی نییە، بەڵکوو بەرهەمی پرۆسە و تەعامولی فاکتەر و هێزە کۆمەڵایەتییەکان و پێکهاتەی دەوڵەت و سیستەمی نێونەتەوەییە (دهقاني فیروزآبادی، ١٣٨٧: ص١٤٨-١٤٧).

### (٢-٢-١١)- کۆنستراکتیڤیزم:

کۆنستراکتیڤیزم لە دەیەی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو لە لایەن نیکۆلاس ئۆنف هاتە ناو بواری تیۆری پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان. ئۆنف لە ساڵی (١٩٨٩)، لە کتێبێکدا بە ناوی (جیهانی دروستکراوی ئێمە)[٧]، جەختی لە سەر

---

١ـ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

ڕۆڵی ڕێساکان لە دروستکردنی جیهانی ئێمە کرد و ڕایگەیاند کە هەموو کردەوە و ڕەفتارە مرۆییەکان لە پانتای کۆمەڵایەتیدا واتا پەیدا دەکات و ئێمە بە شێوەی سەربەخۆ ناتوانین تێگەیشتنمان بۆ جیهان هەبێت (عسگرخانی و منصوری مقدم، ١٣٨٩: ص١٩٥). کۆنستــراکتیڤیستەکان کردەوە و ڕەفتاری وڵاتان پەیوەندیدار بە پێگە و هەلومەرجی ئەو دەوڵەتانە نازانن، بەڵکوو بڕوایان وایە کە ڕەفتاری دەوڵەتان لە لایەن پێوەرەکان (نۆرم) و بەهاکانیانەوە ئاراستە دەکرێت و ئەکتەرەکان لە سەر بنەمای ئەم بەهایانە بڕیار وەردەگرن و لە سەر بنەمای فاکتەرە زەینی و ئەزمونە کولتووری و مرۆییەکان سیاسەت دادەڕێژن (اسکندریان، ١٣٨٣: ص١٨٠). هەروەها زانایەك بە ناوی ئەلێکساندر ونت، لە کتێبی (تیۆری کۆمەڵایەتی سیاسەتی نێونەتەوەیی)دا هەوڵ دەدات تیۆری کۆنستــراکتیڤیزم لە بواری پەیوەندییە نێونەتەوەییەکاندا بەکاربێنێت. ناوبــراو ڕەخنە لە تێگەیشتنی کنت واڵتز و بە گشتی تیۆری ریالیزم دەگرێت و ڕۆڵی درك و تێگەیشتن و فاکتەرە مانابییەکان لە سەر بکەر یان ئەکتەرەکان دەردەخات، بۆ نموونە دەڵێت: ((ڕژێمی گۆرباچۆف، بە تێگەیشتنی جیاواز لە چۆنیەتی پەیوەندی لەگەڵ ڕۆژئاوا، بە تەنیایی کۆتایی بە شەڕی سارد هێنا)) (ونت، ١٣٨٦: ص١١٢). ئەلێکساندرونت، بڕوای وایە کە کێشە ئاسایشییەکان و سەرهەڵدانی جەنگەکان لە نێوان ئەکتەرەکاندا سروشتی نین، بەڵکوو لە ئەنجامی بەجێهێنانی ئەرکێکی پیرۆزە کە بۆ خۆیان، قەناعەتیان پێهێناوە و ڕازیان دەکات (بیلیس واسمیت، ١٣٨٣: ص٥٩٨).

لە ڕوانگەی تیۆری کۆنستــراکتیڤیزم، بۆ ناسین و شیکردنەوەی ڕەفتاری دەوڵەتان لە سیستەمی نێونەتەوەییدا دەبێت پێش هەر شتێك گرنگی و سەرنج

---

Onuf, Nicholas. (1989), **World of our Making: Rules in Social Theory and International Relation**s; Colombia: University of South Carolina Press, Pp.33-65.

بدرێتە ناسنامەی ئەو وڵاتانە کە بۆ خۆیان پێناسەیان کردووە، کە دروستکەری عەقڵانییەتی ئەم دەوڵەتە و پێناسە کردنی واقعییەتە لە ڕوانگەی ئەو ئەکتەرەیەوە کە بەرژەوەندی و ویستەکان وداخوازیەکانی لە پەیوندی لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا بنیات دەنێت، هەروەها بەرگری کردن لەم ناسنامەیە دەبێتە ئەولەویەتی سەرەکی سیاسەتی دەرەوەی هەر دەوڵەتێك کە ئەمەش ڕەوایەتی بە ڕەفتارەکانی ئەو دەوڵەتە دەدات و لەوانەیە بە پێچەوانەکەی ڕاست بێت بۆ دەوڵەتێکی تــر (رسولی ثانی آبادی، ١٣٩٠: ص١١٢). لە ڕوانگەی کۆنستــراکتیڤیستەکان دژایەتی ناسنامەیی فاکتەری سەرەکی جەنگ و پەشێویە و قەیران و پەشێویش بەرهەمی دروستکراوی ململانێیە ناسنامەییەکانە. بەم هۆیەشەکە هاوکاری وەك پڕۆسەیەکی فێربوونی کۆمەڵایەتی سەیر دەکرێت، کە دەبێتە هۆی تێگەیشتنی یەکسان و هاوبەش لە واقعییەت، هەروەها دەبێتە هۆی دووبارە پێناسە کردنەوەی بەرژەوەندییەکان کە ئەمەش دەبێتە هۆی پەرەسەندنی ناسنامەکانی بە کۆمەڵ، کە دەتوانێت هاوکێشەی ئاسایشی چارەسەر بکات (اسکندریان، ١٣٨٣: ص١٨٤). ئەلێکساندرونت، بە ڕەخنەگرتن لە چوارچێوەی نییو ریالیزمی پێکهاتەگەرا، کەبڕوای وایە دوو فاکتەری کێبــرکێ و بەکۆمەڵایەتیبوون لە پەیوەندی نێوان ئەکتەرەکان لە ژێر کاریگەری پێکهاتەی زاڵی سیستەمی نێونەتەوەییدا ئاراستەی ڕەفتارەکانیان دەکات، کە بە بڕوای کنت واڵتز، پڕۆسەی کێبــرکێ بە ڕێگەی ئامرازەکانی پاداشت وسزا، ڕەفتاری یەکەکان دەخاتە ژێرکاریگەری خۆیەوە و پڕۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونیش بە فۆرم پێدان بە ڕێساکان و نۆرمەکان و سەرمەشقە ڕەفتاریەکان دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕەفتاری هاوشێوە لە نێوان ئەکتەرەکان، لێرەوە ئەلێکساندرونت، بە ڕەخنە گرتن لەم ڕوانگە تاك ڕەهەندیە بڕوای وایە کە کاریگەری پێکهاتەی زاڵی ماددیانە و ناکۆمەڵایەتی، هیچ شوێنێك بۆ ڕەفتاری پێچەوانەی پێوەر(نۆرم) و ڕێساکانی

پێکهاتەیی ناهێڵێتەوە، چونکە بە بڕوای کنت والتز، ئەم جۆرە ڕەفتارانە زۆر خێرا لە ڕێگەی سزای پێکهاتەییەوە دەسڕدرێتەوە، بەڵام ئەلێکساندرونت دەربارەی پرسی بەکۆمەڵایەتیبوونی کنت والتز، بابەتی هەڵبژاردنی کولتووری دێنێتە ئاراوە کە پرۆسەی تەقلید و فێربوونی کۆمەڵایەتی لە خۆدەگرێت، تەقلید دەبێتە هۆی دووبارە کردنەوەی هەمان ڕەفتاری بکەری سەرکەوتوو بەڵام فێربوونی کۆمەڵایەتی پرۆسەیەکی ئاڵۆزە کە لەم ڕێگەیەوە بکەرەکان لە کارلێکێکی دوو لایەنە هەم فۆرم بە ناسنامەی خۆیان و هەم ناسنامەی ئەوی تـر دەدەن، بەڵام بە پێی هێز و تواناکانیان کاریگەریان لە سەر یەکتـر جیاوازە، لە ڕوانگەی ئەلێکساندرونتەوە، بکەر بە پێناسەکردنێکی سەرەتایی لە خۆی دێتە ناو تەعامول و لە سەر بنەمای ئەو ڕۆڵەی کە بۆ خۆی پێناسەی کردووە یان هەیەتی لە هەمبەر ئەوی تـردا، دواتـر ئەوی تـر مانای کردەوەی خۆی هەڵدەسەنگێنێت و ئەو دوو ڕەفتار یان پەیوەندییەیان دەبێتە هۆی تەفسیر کردنی پێگە و دۆخی نوێ، بەم پێیە بەردەوام دەبن لە ڕەفتار کردن و تەفسیر کردنی دۆخی پێکهاتووی نوێ لە هەمبەر یەکتـریدا، تاوەکو بگەنە فەهم و تێگەیشتنی هاوبەش یان ناسینی هاوبەش لە یەکتـری (شوری، ١٣٩٠: ص٨٦ـ٨٥). تیۆری کۆنستـراکتیڤیزم بۆ شیکردنەوەی سیاسەتی دەرەوە دەتوانێت زۆر گونجاو بێت، بە هۆی ئەوەی کە بەم گریمانەوە دەستپێدەکات کە بکەران جیهانی خۆیان دروستدەکەن و سیاسەتی دەرەوەش بواری هەڵبژاردنەکانە و ژینگەیە کە تیایدا بکەرەکان تەفسیر دەکەن، بڕیار وەردەگرن، رادەگەیەنن و جێبەجێ دەکەن، بۆیە سیاسەتی دەرەوە جۆرێکە لە بنیاتنان و دروستکردن، واتا بکەران بڕیار دەدەن کە وابن، هەروەها کاریگەری بەها و پێوەر(نۆرم) لە سەر سیاسەتی دەرەوە لە ڕێگەی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونەوە دەبێت، لە هەردوو ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدا، واتا پێوەرە ناوخۆیی و پێوەرە سەروو نەتەوەییەکان (جوادی ارجمند، ١٣٨٩: ص٤٣).

### (٢-٢-١١-١)- گریمانەکانی کۆنستـراکتیڤیزم:

کۆنستـراکتیڤیزم بە گشتی لە سەر سێ گریمانەی سەرەکی ڕاوەستاوە کە بـریتیین لە:

**ا- بنیاتنەرایەتی و دروستکراویەتی ناسنامە:**

ناسنامەی بکەرەکان لە ناوەندی تیۆری کۆنستـراکتیڤیزمدایە، ناسنامە بـریتییە لە تیگەیشتنەکان و چاوەڕوانییەکان دەربارەی (خود) کە تایبەتە بە ڕۆڵ بینین (مشیرزادە، ١٣٨٥: ص٣٣٢). کۆنستـراکتیڤیزم وەك لقێك لە تیۆرییە ڕەخنەگەراییەکان بە خستنەڕووی تێگەیشتنێك لە سیاسەتی ناسنامەیی هەوڵ دەدات چۆنیەتی ڕۆل و کاریگەری کۆمەڵە نێوان زەینییەکان وەکو: ناسیونالیزم، ئەتنیك، نەژاد، مەزهەب و پرستیژ لە سیاسەتی دەرەوەدا شیکردنەوەیان بۆ بکات، هەروەها کۆنستـراکتیڤیستەکان بڕوایان وایە کە گرنگی بابەتەکانی ناسنامەیی لەوەدایە کە ناسنامە بەشێکە لە پرۆسەکانی پێکهێنەری وڵاتێك و لە ئەنجامدا ڕەفتارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان ئاراستە دەکات (کیانی، ١٣٨٦: ص١١١). تیۆرییە سەرەکییەکانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان و سیاسەتی دەرەوە واتا عەقڵگەراکان، توانای ڕوونکردنەوەی ڕۆڵی بنیاتنەری ناسنامەی نەتەوەیی لە پرۆسەی دروستکردنی بەرژەوەندی نەتەوەیی دەوڵەتەکانیان نییە، بە هۆی ئەوە کە عەقڵگەرایی لە سەر بنەمای تیۆری هەڵبژاردنی عەقڵانی دامەزراوە، بۆ نموونە ئەکتەرێك وەك ئێران، بە یەکەیەکی سیاسی خۆویست و بەرژەوەندیخواز و عاقڵ دەزانێت، کە لە سەر بنەمای لێکدانەوەی سوود ـ زیان، هەوڵی زۆرتـر کردنی بەرژەوەندی ماددی پێشتـر دەستنیشانکراوی خۆی دەدات. واتا کۆماری ئیسلامی ئێران بە بەرژەوەندی پێشتـر داڕێژراو دەچێتە ناو تۆری

پەیوەندی لەگەڵ ئەکتەرەکانی تـر، بە پێی ئەم ڕوانگەیەوە تەعامولی کۆمەڵایەتی نێونەتەوەیی فاکتەرێکی گرنگ لە دەستنیشان کردنی بەرژەوەندی ئێران نییە و وڵاتان لە جەوهەردا کۆمەڵایەتی نین و بەرهەمی ژینگەی کۆمەڵایەتی خۆیان نین و تەنیا ئەکتەرێکی عەقڵمەندن کە پێکهاتەی پەیوەندی نێونەتەوەیی بە مەبەستی زیاتـر کردنی بەرژەوەندییەکانیان پێکدێنن (آدمی، ١٣٨٩: ص١٠٠). بەڵام بە پێچەوانەی ڕەوتی سەرەکی لە بواری پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان و سیاسەتی دەرەوەی وڵاتاندا، کە ناسنامەی بکەرەکان لە سیستەمی نێونەتەوەیی بە نەگۆڕ و جێگیر دادەنێت، کۆنستـراکتیڤیستەکان لە سەر دروستکراویەتی ناسنامەی بکەرەکان و ڕۆڵی ناسنامە لە بنیاتنەرایەتی بەرژەوەندییەکان و ڕەفتارەکان جەختدەکەنەوە. یەکێك لە زاناکان بە ناوی ئیمانۆئێل ئادلێر[٨]، بە جەختکردنەوە لە سەر ناسنامەی دەوڵەتان بڕوای وایە کە گرنگی پێدانی دەوڵەتان بە ناسنامە، دەربـڕی ئەوەیە کە وەك تاکەکان، دەوڵەتیش لە چوارچێوەی کۆمەڵە بەهاکان و ناسنامەی خۆیدا، جیهان مانادار دەکات و لەم سۆنگەیەوە، ناسنامەی دەوڵەتان، تەوەری سەرەکی پێناسە کردنی ئەوان لە واقعییەت و هەروەها هێز و بەرژەوەندی نەتەوەیی و دۆست و دوژمن و ئاسایش و...هتد، دروستدەکات و لە ئەنجامیشدا دروستکردنی بڕیار و کردەوەکان لە سەر ئەم بنەمایە دروستدەبن (عابدی اردکانی، ١٣٩٠: ص١٤٩). بە بڕوای کۆنستـراکتیڤیستەکان، بنیاتی کۆمەڵایەتی ناسنامەی دەوڵەتان، دەتوانێت لە دوو ئاستی گشتی نۆرم و ماناکانی نێوان زەینی ناوخۆیی و هەروەها نۆرمەکان و پێکهاتەکانی نێونەتەوەییدا، لە دروستبوون و جێگیربوون یاخود گۆڕانکاری

---

١ـ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

Adler, Emanuel. (2005), **Communitarian International Relations: the Epistemic Foundations of International Relations**; London – New York: Routledge, Pp.29-62.

ناسنامەییدا ڕۆڵی هەبێت. بە گشتی نۆرم یان پێوەرەکان لە ئاستی نێونەتەوەییدا بـریتییە لە: یاساکانی نێونەتەوەیی، دامەزراوەکان، پرۆسە و ڕەوتە نێونەتەوەییەکان و ڕێکخراوەکانی نێونەتەوەیی و...هتد و لە ئاستی ناوخۆییدا وەکو: کولتووری سیاسی، ڕای گشتی، یاسای بنچینەیی، ڕوانگەی حیزبی و...هتد، هەروەها ناسنامەکان هاوکات دەبنە هۆی هەڵبژاردنی عەقلانی، هەروەها مۆدێل و پێوەرەکانی سیاسەتی نێونەتەوەیش کاریگەریان لەسەر ناسنامەکاندا هەیە، ناسنامەکان ئەو دەرفەتە بۆ نەتەوەکان دەخولقێنن کە جیهان واتادار بکەن و واقعییەتێك دروستبکەن کە خۆیان و ئەوی تـری پێ پێناسە بکەن و سنوورەکانیان دیاریبکەن (پیریا، ١٣٨٧: ص٦٥).

لە ڕوانگەی کۆنستـراکتیڤیزمەوە، ڕەفتارەکان لە هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی و نێوان زەینی مانا پەیدا دەکەن و پێکهاتەکان لە ریزبەندێك لە تێگەیشتن و چاوەڕوانی و ناسینی کۆمەڵایەتی دروستدەکرێن، بۆ نموونە: شەڕی سارد پێکهاتەیەکی نێوان زەینی بوو کە لەم چوارچێوەیەدا دەوڵەتان لە دوو بلۆکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، لەم تێگەیشتن و ناسینەی یەکتـری بەشداربوون و کاتێك شەری سارد کۆتایی پێهات کە ڕوانگەی ئەم ئەکتەرە سەرەکییانە سەبارەت بە یەکتـری گۆڕانی بەسەردا هات (قوام، ١٣٨٤: ص٧). بە بڕوای کۆنستـراکتیڤیستەکان، ناسنامەی دەوڵەت پرسێکی تاکەکەسی یان تەنیا دەروونناسانە نییە، بەڵکوو پەیوەندییەکە، کە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەکتەرەکانی تـر و بەشداری لە ماناکانی بەکۆمەڵ یاخود مانا هاوبەشەکان لەناو جیهانی کۆمەڵایەتی دەردەکەوێت یاخود دەگۆڕدرێت (کرمی، ١٣٨٣: ص١٦٩).

**ب- پەیوەندی نێوان بکەر و پێکهاتە:**

پەیوەندی نێوان پێکهاتە و بکەر لە بواری کۆمەڵناسیدا سەری هەڵداوە، ئەنتۆنی گیدێنز، پەیوەندی نێوان پێکهاتە و بکەرایەتی شیدەکاتەوە. بە بڕوای گیدێنز

هەرشتێك لە ژیانی كۆمەڵایەتی، لە سیستەمەكانی جیهانی تا بارودۆخی هزری تاك، كردەوەیەكی كۆمەڵایەتییە، هەروەها هەر كردەوەیەكی كۆمەڵایەتی پێكهاتەیەك لە خۆدەگرێت و هەرپێكهاتەیەكیش پێویستی بە كردەوەیەكی كۆمەڵایەتی هەیە بۆیە بكەرایەتی و پێكهاتە بە شێوەیەكی جیانەكراو لە چالاكییەكانی ڕۆژانەدا تێكئالاون (استونز، ١٣٧٩: ص١٤٣). كۆنستـراكتیڤیزم جەخت لە سەر پێكهاتنی دوو لایەنەی بكەر و پێكهاتە دەكاتەوە و بە پێچەوانەی ریالیستەكان تەنیا لە ڕەهەندی ماددیدا كورتی ناكاتەوە و تەنانەت ڕەهەندی مانایی و زمانیش دەداتە پێكهاتە. لەم ڕوانگەیەوە سیستەمی نێونەتەوەیی كۆمەڵگەیەكە تیایدا بكەرەكان تەعامولیان پێكەوە هەیە و ئەم كارلێككردنانە لە سەر بنەمای یاسا و نۆرم یان پێوەرەكان بەڕێوە دەچێت كە نێوان زەینییە و ئەم كۆمەڵگەیەش وەك هەر كۆمەڵگەیەكی تـر تاكەكان و بكەرەكان دروستدەكات و ئاراستەیان دەكات، لە هەمان كاتدا ئەوە كردەوە و ڕەفتاری تاكەكان و بكەرەكانە كە فۆرم بەم كۆمەڵگەیە دەدات و دروستی دەكات و ئەم پێكهاتە پێوەری و ماناییانە بە ڕادەی پێكهاتە ماددیەكان لە دروستكردن و ئاڕاستە كردنی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتاندا كاریگەرن (دهقانی فیروز آبادی، ١٣٨٨: ص٤٦ـ٤٥). لە ڕوانگەی كۆنستـراكتیڤیستەكانەوە، بوونەوەرە كۆمەڵایەتییەكان خاوەن دوو ڕەهەندی عەینی و زەینین، واتا جگە لەوەی كە خاوەن ڕەهەندی ماددین لە درك و تێگەیشتنی بكەرەكانیش بە دوور نین، بەڵام ئەوە بە مانای ئەوەنییە كە بە هەمان شێوەی بكەرەكانی تـر ڕەفتار دەكەن (بیلیس واسمیت، ١٣٨٣: ص٥٤١). ئەم تێگەیشتنە دیالێكتیكیە لە پەیوەندی نێوان پێكهاتە و بكەر لە لایەن بیرمەندانی زانستە كۆمەڵایەتییەكان باسی لێوە كراوە، وەك (ئانتۆنی گیدنز) كە باس لە چەمكی ستـراكچرەیشێن (Structuration) دەكات كە پەیوەندی نێوان پێكهاتە و بكەر بە دیالێكتیكی دەزانێت و بە دوو ڕووی یەك دراویان دەزانێت (عابدی اردكانی، ١٣٩٠: ص١٥١). هەروەها زانایەك بە ناوی باب جسوب، لەم بارەیەوە بڕوای وایە كە

پێکهاتەکان و بکەرەکان پەیوەندی ستــراتیژیکی و ڕێژەییان پێکەوە هەیە و هیچ کام بە تەنیایی واقعییەتیان نییە، لە بەر ئەوەی کە هیچ کامیان بە جیا لە یەکتــر بوونیان نییە، بەم مانایە کە بە شێوەی ڕێژەیی یەکتــری دروستدەکەن و بە شێوەی دیالێکتیکی کار و کارلێك دەکەن و تەنانەت بڕوای وایە کە پێکهاتە و بکەر کانزای دراوەکەن (های، ١٣٨٥: ص٢١٢).

ئەو خاڵەی کە ئەلێکساندرونت لە ریالیستە نوێیەکان جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە ئەلێکساندرونت بڕوای بە کاریگەری هۆکاریەتی پێکهاتە لە سەر بکەر نییە، بەڵکوو بڕوای بە کاریگەری دوو لایەنەیان هەیە لە سەر یەکتــری و خاڵی دووەم ئەوەیە کە سیستەمی نێونەتەوەیی بە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دەزانێت نەك ماددی، بەم مانایە کە پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی لە سەر بنەمای ناسینی هاوبەشە و ئەو تێگەیشتن و بیروباوەڕ و چاوەڕوانیانە کە دەوڵەتان لە یەکتــری هەیانە، واتا نێوان زەینییە، خاڵی سێیەم ڕۆڵی پێکهاتە لە سەر دروستکردنی ناسنامە و بەرژەوەندی و بە پێچەوانەوەکەشی هەر ڕاستە و خاڵی چوارەم گرنگی بە تەعامول و پرۆسە لە سیستەمی نێونەتەوەیی دەدات کە دەوڵەتان ناسنامەی یەکتــری دادەرێژنەوە و بەم پێیەش ڕەفتار دەکەن، بەڵام ئەو بنەمایەی کە دەوڵەتان گرنگتــرین ئەکتەرن لە سیستەمی نێونەتەوەییدا قبوڵی دەکات، بەڵام لە سەر ئەم بڕوایەیە کە دەوڵەت-نەتەوە فۆرمی زاڵی بکەرایەتیە لە سیاسەتی هاوچەرخدا (عسکرخانی و منصوری مقدم، ١٣٨٩: ص١٩٦). هەروەها بیرمەندانی بواری زانستە سیاسییەکان و پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان لە سەرەتای دەیەی هەشتای سەدەی ڕابــردوو مشتومڕێکی زۆریان لە سەر بابەتەکانی تیۆری و میتۆدۆلۆژیای ناسین لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا هێنا ئاراوە، بەڵام کۆنستــراکتیڤیستەکان پێشوازیان لە حەزی بکەر یان بڕیاردەرانی بواری سیاسەتی دەرەکی لە سیاسەتی نێونەتەوەیی کرد، بە هۆی ئەوەی کە ئەوان

بڕوایان بە جیایی پێكهاتە و بكەر نەبوو. بە گشتی كۆنستــراكتیڤیزم لە بواری پەیوەندی نێونەتەوەییدا ڕوانگەیەكی ناسنامەتەوەری بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی و سیاسەتی دەرەوە هەیە، بەم مانایە كە كۆنستــراكتیڤیزم لە جێگەی جەختكردنەوە لە سەر توانای دەوڵەتان یاخود شیكردنەوەی چۆنیەتی دابەشبوونی هێز لە ئاستی پێكهاتەی سیستەمی نێونەتەوەییدا، جەخت و تەركیز لەسەر ناسنامەی دەوڵەتان دەكات (Wendt, 2003: p.379).

**ت- ڕۆڵی ناسنامە لە بنیاتنان و دروستكردنی بەرژەوەندییەكان:**

كۆنستــراكتیڤیستەكان بۆ ڕوون كردنەوەی چۆنیەتی دروستبوونی بەرژەوەندییەكان جەخت لە سەر ناسنامەكانی كۆمەڵایەتی بكەر و ئەكتەرەكان(تاكەكان و دەوڵەتان) دەكەنەوە و لە ڕوانگەی ئەوانەوە بەرژەوەندی دەرئەنجامی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانە و ناتوانێت بە شێوەی پێش كۆمەڵایەتی قسە لە سەر بەرژەوەندی بكەین، ئەمەش بە پێچەوانەی بڕوای عەقڵگەراكانە كە بە پێی لۆژیكی سوود - زیان و هەڵبژاردنی عەقڵانی پێناسەیەكی دیاریكراویان لە بەرژەوەندی هەیە (عابدی اردكانی، ١٣٩٠: ص١٥٢). لە ڕوانگەی كۆنستــراكتیڤیستەكان نۆرم و بەهاكانی نێوان زەینی لە كۆمەڵگە مرۆییەكاندا ڕۆڵی سەرەكی لە پرۆسەكانی سیاسەتی دەرەوە و دروستكردنی ناسنامە و بەرژەوەندییە نەتەوەییەكانی دەوڵەتان دەبینن، بەم مانایە كە بیروباوەڕە هاوبەشەكان و مانا و بەها هاوبەشەكانی نێوان گروپە كۆمەڵایەتییەكان، جۆری تێگەیشتنی دەوڵەتێك لە خۆی و لە ژینگەی نێونەتەوەیی دروستدەكات، واتا چۆن وڵاتێك دەڕوانێتە خۆی و جیهانی دەرەوەی، پەیوەندی بەو پێوەر یاخود نۆرم و بەها زاڵانەی كۆمەڵگەكانەوە هەیە و كاریگەری لە سەر سیاسەت داڕێژەران و بڕیار وەرگرانی سیاسەتی دەرەوەشدا دەبێت، بەم واتایە كە دەوڵەتان لە ڕێگەی تەعامولی كۆمەڵایەتی نێونەتەوەیی و

بەشداری لەو چەمك و مانا هاوبەشە نێوان زەینیانە ناسنامەی خۆیان پێناسە دەکەن و بە هۆی گۆڕانکاری لە نۆرم و بەها ناسنامەییەکانیان، بەرژەوەندییەکانیان دووبارە پێناسەدەکەنەوە (آدمی، ١٣٨٩: ص١٠٢). هەروەها عەقڵگەراکان، ئەکتەرەکان وەك یەکەی هاوتا و یەکسان دەزانن کە پارێزگاری لە مانەوە و پاراستنی ئاسایش سەرەکیترین ئامانجیانە و هیچ جیاوازیەك لە نێوان وڵاتانی جیاواز بە کولتوور، پێوەر، بەها و ئایدولۆژیا جیاوازەکانیاندا نییە و تەنیا ئەوەی کە لە یەکتری جیایان دەکاتەوە ئاستی توانای سەربازی، ئابووری و تەکنۆلۆژیانە و ئەگەر ناسنامە بریتی بێت لە جیاوازبوون لە ئەوانی تر، ئەوە ئەم تیۆریانە چۆنیەتی بنیاتنان و دروستبوونی ناسنامەی نەتەوەیی وڵاتێك ناتوانن شیبکەنەوە، چونکە ناسنامەی وڵاتان لەم تیۆرییە عەقڵگەرایانەدا یەکسان و جێگیرە و بەرژەوەندییەکانیشیان ناگۆردرێت و پێشتر بۆدارێژراوە (کیانی، ١٣٨٦: ص١٠٩). ئەلێکساندر ونت، لە کتێبی (تیۆری کۆمەڵایەتی سیاسەتی نێونەتەوەیی) دا، دەربارەی چەمکی ناسنامە بڕوای وایە کە ناسنامە بریتیە لەو شتەی کە شتێك دەکاتە ئەو شتەی کە هەیە و ئەم ناسنامەیە تایبەتمەندیەکە لە بکەری ئامانجداردا، کە دەبێتە هۆی هاندان وپاڵنەری ڕەفتاری بۆی، بەم واتایە کە ناسنامە تایبەتمەندیەکی زەینییە کە ریشەی لە تێگەیشتنی بکەر لە خۆی هەیە و ئەمەش لە سەر ئەوە رادەوەستێت کە ئایا بکەرانی تر(ئەوانیتر) هەمان تێگەیشتنیان لەو بکەرە هەیە یان نا؟ کەواتا نێوان زەینییە، خود و ئەوی تر. کەوابوو هەردوو پێکهاتەکانی دەرونی و دەرەکی ناسنامە دروستدەکەن (ونت، ١٣٨٦: ص٢٣٠ ـ٢٢٩). لە لایەکی ترەوە بە پێی تیۆری کۆنستراکتیڤیزم، ناسنامەکان لە جووڵە و گۆڕاندان و تێگەیشتنی بکەرەکان لە خۆیان و بەرژەوەندی و ئامانجەکانیان دەگۆڕدرێت و بە دروستبوونی ناسنامەی نوێ، بەرژەوەندی نوێش بۆ دەوڵەت دروست دەبێت، بە بڕوای

ئەلێكساندرونت، بەرژەوەندی و ناسنامە هەموو كات لە ڕێگەی پڕۆسەی تەعامولكردن لەگەڵ یەكتری گۆڕانكاریان بە سەردادێت، جاچ لە ڕێگەی هاوكاری بێت كە گۆڕانكاری لە ناسنامەكان دروستدەكات و دواتریش دەبێتە هۆی گۆڕانكاری لە بەرژەوەندییەكان و تەنانەت سەروەری وڵاتان یاخود چوون بەرەو ناسنامەی بەكۆمەڵی نوێ بێت (ونت، ١٣٨٦: ص٥٣٤). بە گشتی كۆنستراكتیڤیستەكان بڕوایان بە دوو جۆرە ناسنامە بۆ دەوڵەت هەیە: یەكەمیان، ناسنامەی بەكۆمەڵ. دووەمیان، ناسنامەی كۆمەڵایەتی. ناسنامەی بەكۆمەڵی دەوڵەت بنەمای ماددی هەیە، وەكو: تایبەتمەندی وڵات وجوگرافیا و دانیشتوان و...هتد، لە كاتێكدا ناسنامەی كۆمەڵایەتی، لە تەعامولی دەوڵەتان لەگەڵ یەكتری دروستدەبێت و دەبێتە هۆی جیاوازی دەوڵەتان لە یەكتری لە سیستەمی نێونەتەوەیی (عطایی و رسولی ثانی آبادی، ١٣٨٩: ص٢٢١).

### (٢-٢-١١-٢)- ڕوانگە جیاوازەكان لە تیۆری كۆنستراكتیڤیزم:

بەشێك لە كۆنستراكتیڤیستەكان بە نوێنەرایەتی ئەلێكساندر ونت، جەخت لە سەر ڕۆڵی پێكهاتەكانی مانایی سیستەمی نێونەتەوەیی، ڕێساكان و نۆرمە نێونەتەوەیەكان لە پێكهێنانی ناسنامەی دەوڵەتان دەكەنەوە. ئەم گروپە كە بە (كۆنستراكتیڤیستەكانی سیستەمی) ناسراون بڕوایان وایە كە لە ژینگەی ئەنارشێكی سیستەمی نێونەتەوەییدا هەم هاوكاری و هەم ئەنارشی دەتواندرێت شیبكرێتەوە، بۆیەشە كە دەبێت هەر بكەر یان ئەكتەرێك لە پانتای سیستەمی نێونەتەوەییدا ڕەفتار و سیاسەتەكانی خۆی بە سەرنج پێدان بە پێكهاتە ماناییەكانی سیستەمی نێونەتەوەیی و ڕێساكان و نۆرم یان پێوەرەكانی سیستەم كە لە چوارچێوەی یاسای نێونەتەوەیی و ڕژێمە نێونەتەوەییەكاندا دەردەكەوێت،

ئەنجام بدات تا نەبێتە هۆی دژایەتی ئەندامانی تــری سیستەمی نێونەتەوەیی (مشیرزادە، ١٣٨٧: ص٢١٣)

کەسانێك وەك کاتزێنشاین، کە بە (کۆنستــراکتیڤیستەکانی ئاستی یەکە) ناسراون، گرنگی بە کاریگەری ڕێساکان و نۆرمەکانی ناوخۆیی لە سەر بنیاتنان و دروستبوونی ناسنامە و بەرژەوەندی و سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان دەدەن، واتا ریشەکانی ناوخۆیی پێکهینانی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان شی دەکەنەوە، بەم هۆیەش بڕوایان وایە کە ناسین و دەستنیشان کردنی ڕێسا و نۆرم یان پێوەرەکان لە دەستووری وڵاتان، کولتووری گشتی یاخود کولتووری سیاسی دەردەکەوێت و دەبێت گرنگیان پێبدرێت. (مشیرزادە، ١٣٨٥: ص١٧).

کەسانێکی تــر وەکو: کراتۆچویل و رۆگی، کە بە (کۆنستــراکتیڤیستە گشتگەراکان) دەناسرێن، بڕوایان وایە کە دەبێت گرنگی بە هەر دوو ئاستی ڕێساکان و نۆرم یان پێوەرەکانی نێوخۆیی و نێونەتەوەیی بدرێت. لە ڕوانگەی ریالیزمی نوێ، نۆرم یان پێوەر و بەهاکان تا ئەورادەیە لە سەر ڕەفتاری ئەکتەرەکان کاریگەریان هەیە کە قبوڵ کراوبن و لە ئاراستەی بەرژەوەندییەکانیان دابێت و لە لایەن ئەکتەرە بەهێزەکانەوە جێبەجێ بکرێن واتا ئەوە خودی بەها و نۆرم یان پێوەرەکان نین کە کاریگەری لە سەر ڕەفتار دادەنێن بەڵکوو هێزی پشت ئەم بەهایانەیە، بەڵام لە ڕوانگەی کۆنستــراکتیڤیستەکانەوە نۆرم و بەهاکان ڕەوایەتی دەدەنە بەرژەوەندی و ئامانجی ئەکتەرەکان و هەروەها بەرژەوەندییەکانیان پێناسە دەکەن (اسکندریان، ١٣٨٣: ص١٨٢). کۆنستــراکتیڤیزم نیشاندەدات کە دەوڵەتان جگە لە پاراستنی ئاسایشی ماددی خۆیان بەدوای ئاسایشی ناسنامەیی خۆیانن و لێرەوە چەمکی (ئاسایشی ناسنامەیی)، دەتوانێت ململانێی نێوان دەوڵەتان ڕوون بکاتەوە، لە لایەکی تــرەوە بە هەر ڕێژەیەك ئاستی گونجانی نێوان ڕێساکان و نۆرم یان پێوەرەکانی

ناوخۆیی دەوڵەتان لەگەڵ ڕێساکان و نۆرم یان پێوەرە نێونەتەوەییەکان زیاتــر بێت، باشتــردەکرێت ڕەفتارەکان و سیاسەتی دەرەوەیان پێشبینی بکرێت، بەڵام بە پێچەوانەکەی کێشە بۆ پێشبینی ڕەفتاری دەرەوەی دەوڵەتان لە سیستەمی نێونەتەوەییدا و لە کاردانەوەیان لە هەمبەر دەوڵەتانی تـر ڕوودەدات (هادیان، ١٣٨٢: ص٦٩). لە ڕوانگەی کۆنستــراکتیڤیستەکان، دەوڵەتێك لەوانەیە ناسنامەی جیاجیای هەبێت و لە سەر بنەمای هەر ناسنامەیەك، بەرژەوەندی و ڕەفتارێکی تایبەتی هەبێت، ئەلێکساندرونت پەیوەندی نێوان ناسنامە و بەرژەوەندی لە ڕێگەی چەمکی (ڕۆڵ) شی دەکاتەوە و بڕوای وایە کە ئەو ڕۆڵانەی کە دەوڵەت لە ئەستۆی دەگرێت، دەوڵەتان بەرەو کۆمەڵە ڕەفتار و کردەوەیەك ئاراستە دەکات کە لەگەڵ ئەم ڕۆڵانەدا هەماهەنگ و گونجاو بێت. ئەم ڕۆڵانە لە سەر چۆنیەتی دروستکردنی بڕیاری سیاسەتی دەرەوە و ڕەفتاری دەرەکی دەوڵەتان کاریگەری هەیە (کرمی، ١٣٨٣: ص٣٠). ئەلێکساندرونت جگە لە بەرژەوەندییە گشتییە نەتەوەییەکان وەکو: مانەوەی فیزیکی(ژیان)، سەربەخۆیی(ئازادی) و خۆشگوزەرانی ئابووری (خاوەنداریەتی)، ڕێزگرتن لە خودی بەکۆمەڵ، وەك بەرژەوەندی نەتەوەیی دەستنیشان دەکات، کە دەبێت ڕێزی لێبگیرێت و حورمەتی بپارێزرێت (جوادی ارجمند، ١٣٨٩: ص٤٤). لە شیکردنەوەی سیاسەتی دەرەوە لە ڕوانگەی کۆنستــراکتیڤیستیەوە، پاڕادایمە هزریەکان فاکتەری دەستنیشانکەری سیاسەتی دەرەوەن و ئەم پرسە لە ڕێگەی دانانی بابەتی ناسنامەی سیستەمی سیاسی لە ناوەندی شیکردنەوەی سیاسەتی دەرەوەدا دەبێت و بەم پێیە بکەرەکان بە پێی ناسنامە و ئەو ڕۆڵانەی کە بۆ خۆیانیان پێناسە کردووە یاخود پێیان دراوە، ڕەفتار دەکەن و بڕیار وەردەگرن (آقايي و رسولی، ١٣٨٨: ص٩).

لە ڕوانگەی مەعریفە ناسیەوە، کۆنستــراکتیڤیزم، توانای گەیشتن بە حەقیقەتی عەینی، گەوهەری و لە پێشتــر دیاریکراو، ڕەتدەکاتەوە و ئەگەری

ناسینی سەربەخۆ، گشتی و ئازاد لە بەهاکان و هەروەها سەربەخۆبوونی عەین لە زەین ڕەتدەکاتەوە و بڕوای وایە کە جیهان لە ناوخۆی خۆماندا دروستدەکرێت و ناسینیش لە ڕێگەی بەشداری چالاکانە لە جیهاندا دروستدەبێت، هەروەها ئانارشی بابەتێکە کە دەوڵەتان بەم شێوەیە تێیدەگەن، هەروەها ئەو ڕۆڵەی کە دەوڵەتان لە پێناسە کردنی ناسنامە و بەرژەوەندی لە چوارچێوەی دۆست و دوژمندا دەیبینن و ئەو تەعامولەی کە لە نێوان دەوڵەتان لەگەڵ یەکتری و لەگەڵ کۆمەڵگەی نێونەتەوەییدا دەیکەن، مانای سیادە(سەروەری) دەگۆڕێت (عابدی اردکانی، ١٣٩٠: ص١٥٤).

لەم سۆنگەیەوە، کۆنستراکتیڤیستەکان بڕوایان وایە کە مرۆڤ بە ماناپێدان بە خۆی، کردەوەکانی خۆی مانادار یان واتادار دەکات و لەم پرۆسەیەی مانا پەیدا کردن و ماناپێداندا، خۆی و ئەوی تر پێناسە دەکات، لێرەوە ناسنامە وەك سەرچاوەیەکی مانا و ئەزموون بۆ مرۆڤ، تایبەتمەندی پەیوەندیکەرایەتی و کۆمەڵایەتی هەیە کە سنوورەکانی خود و ئەویتر نیشاندەدات، ئەم سنووربەندیە شێوەی تەعامول لە ژینگەی کۆمەڵایەتی دەستنیشان دەکات. ناسنامە بە تەعامول لەگەڵ بکەری تر دروستدەکرێت و ناسنامەی دەوڵەت یاخود ناسنامەی نەتەوەیی لە سەر بنەمای پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەت و نەتەوەکانی تر دروستدەکرێت. هەر دەوڵەت و نەتەوەییەك ناسنامەیەکی بەکۆمەڵی هەیە کە لەم ڕێگەیەوە ئەو تاکانە یان گروپ و نەتەوانە تێگەیشتنیان لە خۆیان بنیاتدەنێن، لێرەوە ئەگەر ئەم ناسنامەیە لە سەر جیاوازی قوولی نۆرم و بەهاکان و دژایەتی و ناکۆکی لەگەڵ ئەوی تر بێت، ئەوە بەردەوام هەرەشە و ململانێ و ئەگەری جەنگ هەیە، بەڵام ئەگەر ئەم ناسنامەیە لە سەر وێکچوون و تێگەیشتنی هاوبەش لەگەڵ ئەوی تر بێت ئەوە تارمایی شەڕ دەرەوێتەوە (مشیرزادە و صلواتی، ١٣٩٢: ص٨١).

بە گشتی کۆنستـراکتیڤیستە سەروو نەتەوەییەکان گرنگی بە کاریگەری نۆرم یان پێوەر و بەهاکانی کۆمەڵگەی جیهانی دەدەن کە قبوڵ کراون، وەکو: یاسای نێونەتەوەیی، بەڵگەنامە و ڕێسا و یاسایەکانی ڕێکخراوەکان و دامەزراوە نێونەتەوەییەکان و...هتد، بەڵام کۆنستـراکتیڤیستە کۆمەڵایەتییەکان، جەخت لە سەر گرنگی نۆرم یان پێوەرەکانی ناوخۆیی قبوڵ کراوی کۆمەڵگە دەکەنەوە و بڕوایان وایە کە بڕیاروەرگرانی سیاسەتی دەرەوە دەیانەوێت بگەنە قۆناغێك کە سیستەمی نێونەتەوەیی بە پێی هەمان بەها و بنەمایانە کە لە سیستەمی کۆمەڵایەتی خۆیاندا هەیە دروستبکرێت، بەم واتایە کە سیستەم و ڕێکخستنی نێونەتەوەیی لە سەر بنەمای نۆرم یان پێوەرە ناوخۆییەکانیان بێت (اسکندریان، ١٣٨٣: ص١٠٣).

## (٢-٣)- پێکهاتە و بکەر لە سیاسەتی دەرەوەدا:

شیکردنەوەی سیاسەتی دەرەوە بـریتیە لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی پرۆسەکان لە چەند ئاستیکدا، کە ئامانجی حکومەتەکان لە پەیوەندیکردن لەگەڵ یەکتر لە خۆدەگرێت. لە ڕوانگەی تیۆری کۆنستـراکتیڤیسم، سیاسەتی نێونەتەوەیی بـریتی نییە تەنیا لە تەعامول و ڕەفتاری عەقلانی لە چوارچێوەیەکی ماددی و دامەزراوەیی لە ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدا (قوام، ١٣٨٤: ص٥). هەریەکە لە ڕوانگەکانی ماددیگەرا و ماناگەرا یاخود بکەرایەتی و پێکهاتەگەرا، بە هۆی ئەوەی کە تەنیا گرنگی بە یەك یان دوو ڕەگەز وەك فاکتەری سەرەکی دیاریکەری ڕەفتار لە ئاستی سیستەمی نێونەتەوەیی دەدەن، ڕەگەزەکانی تـر فەرامۆش دەکەن و ناتوانن شیکردنەوەی دروست لە سیاسەتی دەرەوەی وڵاتاندا بکەن بە هۆی ئەوەی کە ماددیگەراکان ڕەگەزە ماناییەکان پشتگوێ دەخەن و ڕوانگە ماناگەراکان گرنگی بە ڕەگەزە ماددیەکان نادەن و ڕوانگەکانی بکەرایەتی یان بکەرتەوەر تەنیا گرنگی بە دەوڵەت و

تایبەتمەندیەکانی ئەو بکەرە دەدەن. هەروەها ڕوانگەی پێکهاتەگەرایی گۆڕانکاریەکانی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتان تەنیا لە سەر بنەمای پێکهاتە و ڕەهەند و ڕەگەزەکانی سیستەمی نێونەتەوەیی شی دەکەنەوە (سیف زادە، ١٣٧٦: ص١٣٢). بەڵام بە پێچەوانەی ئەو تیۆریانەی کە سیستەمی نێونەتەوەیی لە سەر بنەمای تواناییەکانی ماددی شی دەکەنەوە، لە ڕوانگەکانی ماناتەوەرەدا ئەوەی کە گرنگی تایبەتی هەیە فاکتەری ناماددی یان ماناییەکانە، کەوابوو سیستەمی نێونەتەوەیی وەك سیستەمی کۆمەڵایەتی هەژمار دەکرێت و ئەوەی کەئەم کۆمەڵگە نێونەتەوەییە دروستدەکات، زیاتر فاکتەری زمانی، مانایی، نۆرم یان پێوەرەکان و ڕێساکانن. قوتابخانەی ئینگلیزی و کۆنستراکتیڤیسم دوو نموونەی ئەم جۆرە تیۆریانەن. کۆنستراکتیڤیستەکان پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان وەك بینایەکی کۆمەڵایەتی پێناسەدەکەن و گرنگی بە فاکتەرەکانی مانایی وەکو: کولتوور، نۆرم یان پێوەر و بەهاکان دەدەن و ڕێگە بە بکەر دەدەن کە کردەوەی دووبارە هزراندن و خولقاندنی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی سنوورە پێکهاتەییەکاندا ئەنجام بدات (سلیمی، ١٣٨٤: ص ٢٣٤).

لە سەر دەستنیشان کردنی ڕەگەزەکانی پێکهاتە و بکەرایەتی، لە نێوان تیۆریسییەنەکاندا جیاوازی هەیە و هەر کامەیان لە ڕوانگەی تایبەتی خۆیەوە دەڕوانێتە ئەم بابەتە، ماددیگەراکان تەنیا گرنگی بە فاکتەری ماددی سیستەمی نێونەتەوەیی دەدەن و لە فاکتەر وڕەگەزەکانی واتایی خۆلادەدەن، لە ڕوانگەی ئەوانەوە سیستەمی نێونەتەوەیی بە گشتی لە فاکتەرەکانی ماددی دروستبووە و لە ئەنجامیشدا هێز و بەرژەوەندی ماددی و چۆنیەتی دابەشکردنی لە ناو سیستەمدا گرنگی هەیە. دەتوانین ریالیستەکان و نییو ریالیستەکان و مارکسیستەکان و تەنانەت نییو لیبرالیستەکانیش نوێنەری ئەم ڕوانگەیە بزانین، هەروەکو چۆن کنت والتز، بڕوای وایە کە پێکهاتە لە ڕێگەی ڕێساکانی فەرمان

پێکەری سیستەمی نێودەوڵەتی، واتا ئانارشی، ئاژاوە و پەشێوی و دابەشکردنی تواناکان، لە نێوان یەکەکاندا پێناسە دەکرێت و جیاوازییەك لە نێوان ڕەفتاری یەکە جیاوازەکاندا نییە (آقامحمدی، ١٣٩٠:ص١٥). ئەمەش وادەکات کە لە هەرکام لە پێکهاتەکانی جیاوازی تاك جەمسەری و دوو جەمسەری و فرەجەمسەری و...هتد، شێواز و ڕێسای ڕەفتاری تایبەت زاڵ بێت کە بەربەست و سنوورەکانی ڕەفتاری پێکدێنن (بیلیس، ١٣٨٣: ص٤١٧).

نیکۆلاس ئۆنف وەك زانایەك لەم بوارەدا، گرنگی بە دروستکردنی دوو لایەنەی بە بێ سەرەتا و کۆتایی پێکهاتە و بکەر دەدات و دەڵێت: ((تاکەکان کۆمەڵگەکانیان لە ڕێگەی کردەوەکانیان دروستدەکەن و کۆمەڵگەکانیش تاکەکان لە ڕێگەی تێگەیشتن لە خۆیان و ئەوانی تـر دروستدەکەنەوە)) (ونت، ١٣٨٦: ص٢٦٦). بیرمەندێك بە ناوی(کلین وایت)، بڕوای وایە کە پێکهاتە و بکەر لە ڕێگەی چالاکی کۆمەڵایەتی گرێدراوی یەکتـرن، بەڵام لە هەمان کاتدا بکەرەکان پێکهاتەی کۆمەڵایەتی نین و ئێمە دەتوانین لە ڕێگەی ڕەهەندی بووnnاسانە و شیکردنەوەوە، جیاوازیان لە نێواندا بکەین (مشیرزادە، ١٣٨٥: ص٣٣١).

لە ڕوانگەی ئەلێکساندرونتەوە، لە بەرامبەر تێگەیشتنی تاك لایەنەی بکەر تەوەر یان پێکهاتە تەوەردا، ڕوانگەی کۆنستـراکتیڤیستی گرنگی بە یەکێکیان لە سەر حیسابی ئەوی تـر نادات، بەڵکوو تەعامولی نێوان هەردووکیان بەرجەستە دەکات و دەڵێت: ((ئەوە تاکەکان و دەوڵەتەکانن کە پێکهاتە دروستدەکەن بەڵام خۆیانیش لە ڕێگەی پێکهاتەوە دروستدەکرێن))، واتا پەیوەندی و کاریگەری دوولایەنە، هەروەها بە بڕوای ئەلێکساندرونت، مرۆڤەکان و ڕێکخراوەکانیان، بکەرێکی ئامانجدارن، کە کردەوەکانیان دەبێتە هۆی دووبارە بەرهەم هێنانەوە یان گۆڕانکاری لە کۆمەڵگە و خودی کۆمەڵگەش لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی دروستکراوە کە پێکهاتەی ئەو هەڵسوکەوتەی نێوانیان دروستدەکات (ونت، ١٣٨٦: ص٢٦٦). هەروەها بە بڕوای

ئۆنف، ڕێسا و نۆرم یان پێوەر و بەهاکان و دامەزراوەکان بە هۆی فۆرم پێدان بە ناسنامە و مانای هاوبەش لە نێوان ئەندامانداندا لە گرنگترین ڕەگەزەکانی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیین (بیلیس، ١٣٨٣: ص٩٥). هەروەها ڕوانگەکانی بکەرتەوەر لە شیکردنەوەی ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەی وڵاتاندا لە سەر فاکتەر و ڕەگەزەکانی ناوخۆیی جەخت دەکەنەوە، وەك تیۆریسیەنەکانی دروستکردنی بڕیار و هەڵبژاردنی عەقڵانی (مشیرزادە، ١٣٨٥: ص٢١٧). لە لایەکی ترەوە قوتابخانەی ئینگلیزی جەخت لە سەر گرنگی دامەزراوەکان، ڕێساکان و فاکتەرە ماناییەکان لە ئاستی نێونەتەوەییدا دەکاتەوە، بۆ نموونە لە ڕوانگەی هێدلی بۆڵ، کۆمەڵگەی دەوڵەتان یان کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی کاتێك دەردەکەوێت کە گروپێك لە دەوڵەتان بە ئاگایی لە بەرژەوەندی و بەها هاوبەشەکان، هەستن بە پێکهێنانی کۆمەڵگەیەك و بڕوایان وابێت کە لە پەیوەندیکردن لەگەڵ یەکتری و چالاکییەکانی دامەزراوە هاوبەشەکانیان، پەیڕەوی لە ڕێسا هاوبەشەکانیان دەکەن (یٚقامحمدی، ١٣٩٠: ص١٦).

لە ڕوانگەی مارکسیستەکانەوە سیستەمی نێونەتەوەیی بە ڕەچاوکردنی ئەو سەرچاوە گرنگانەی کە دەوڵەتەکان هەیانە، پەیوەندی نێوان دەوڵەتەکان لە سەر بنەمای هێزی ئابووری پۆلین دەکەن، هەروەها ئیمانوئێل والێرشتاین، پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی بە سەرمایەداری دەزانێت کە سەرووتر لە سنوورە جوگرافیایی، سیاسی و ئابووریەکانە، کە وادەکات وڵاتان بە سەر ناوەند، نیوە پەراوێز و پەراوێزدا دابەشبن (حسینی اسفید واجانی، ١٣٨٤: ص١١٦). هەروەها نیولیبرالەکان سیتسەمی نێودەڵەتی بە ئاڵۆز و پڕ لە ئاژاوە دەزانن کە دەوڵەتەکانیش بە دوای بەرژەوەندی خۆیاندان, بەڵام بە پێچەوانەی نیوریالیستەکان کاریگەری تەعامولی نێوان ئەکتەرەکان بە ئەرێنی دەزانن (دهقانی، ١٣٨٤: ص٤١).

بە شێوەی گشتی شیکردنەوەی پێکهاتە ـ بکەر لە سیاسەتی دەرەوەدا، جێگەی سەرنجی کۆمەڵێك نووسەر و توێژەر بووە، یەکێك لەم توێژینەوانە

بەرهەمی زانایەکە بە ناوی کریستۆفێرهیل، لە کتێبی (سروشتی گۆڕاوی سیاسەتی دەرەوە)[٩]، لەم کتێبەدا نووسەر گرنگی بە شیکردنەوە و خوێندنەوەی پرسی تەعامول لە نێوان فاکتەرەکانی دەرەکی و ناوخۆیی دەدات لە ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەدا. کریستۆفێر هیل بڕوای وایە کە سیاسەتی دەرەوە دەرئەنجامی کار و کارلێکی نێوان سیستەمی نێونەتەوەیی و ئەکتەرەکانی تری ناوخۆی ئەو سیستەمەیە بە هەموو تایبەتمەندیەکانیانەوە.

پاش خستنەڕووی ئەم ڕوانگە و تیۆریە جیاوازانە بۆ سیاسەتی دەرەوە، لەم توێژینەوەیەدا هەوڵ دەدەین کە بە پێی تیۆر یان ڕوانگەی کۆنستراکتیڤیزم شیکردنەوە بۆ سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران بکەین. بە واتایەکی تر، بە کەڵك وەرگرتن لە چوارچێوەی تیۆری کۆنستراکتیڤیزم، هەوڵ دەدەین کە بنەماکانی هزری کاریگەر لە سەر سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران بخەینەڕوو و بەم پێیەش ڕۆڵی ئەم بنەمایانە لە بنیاتنان و دروستکرنی ناسنامەی تایبەتی کۆماری ئیسلامی ئێران و تێگەیشتنی بڕیار وەرگرانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە خۆیان و بەگشتی لە جیهانی دەرەوەیان، هەروەها دەوڵەت و بکەرەکانی تری ناوچەیی و نێونەتەوەیی و پێکهاتە، بەها و پێوەرە نێونەتەوەییەکان(پێکهاتە و بکەر) ئاشکرا بکەین. بە شێوەیەکی گشتی لەم سۆنگەیەوە هەوڵ دەدەین، ڕۆڵی بنەماکانی هزری و بەها و پێوەرەکانی بنیاتنەری ناسنامەی کۆماری ئیسلامی ئێران و سیاسەتی دەرەوەی ئەم دەوڵەتە لە چوارچێوەی تیۆری کۆنستراکتیڤیزمدا لە ئاراستە کردنی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران نیشان بدەین.

---

١ـ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

هیل، کریستوفر، (١٣٨٧)، **ماهیت متحول سیاست خارجی**، مترجم: علیرضا طیب و وحید بزرگی، تهران: پژوهشکده مطالعات راهبردی.

## (٣)-پێكهاتـــە و بنـــەماكانی سیاســـەتی دەرەوەی كۆمـــاری ئیسلامی ئێران:

لە كۆماری ئیسلامی ئێراندا، ڕێبەری باڵای شۆڕش، سەرۆكایەتی كۆمار، ئەنجومەنی وەزیران، ئەنجومەنی شورای ئیسلامی، ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی، شورای پاراستنی دەستور، كۆمەڵەی دەستنیشان كردنی بەرژەوەندی سیستەم، دەسەڵاتی دادوەری و وەزارەتی دەرەوە، لە پڕۆسەی دیاری كردن و ڕێكخستن و جێبەجێ كردنی سیاسەتی دەرەوەدا بەشدارن، كە ئەمە تەنیا لە ڕووی فەرمییەوەیە، بەڵام لە ڕاستیدا ڕێبەری شوڕشی كۆماری ئیسلامی ئێران شوێندانەرتـرین ڕۆڵی لە سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێراندا هەیە و دەستوری كۆماری ئیسلامی ئێرانیش یارمەتیدەر و پاڵپشتی ئەم ڕۆڵ و پێگەیەی ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامی ئێرانە (ملكی، ١٣٨٢: ص١٠٣ـ١٠٢). لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین زیاتر ئەوە ڕوون بكەینەوە.

### (٣ . ١)- پێكهاتەی فەرمی كۆماری ئیسلامی ئێران:

بە پێی سیستەمی فەرمی و یاسایی لە كۆماری ئیسلامی ئێران، ئەنجوومەنی شورای ئیسلامی، (٢٩٠) ئەندامی هەیە و سەرۆك كۆمار، هەرچوار ساڵ جارێك لە لایەن خەڵكەوە هەڵدەبژێردرێت و بیست و دوو وەزارەت لە ئێراندا هەیە، كە ئەنجوومەنی شورای ئیسلامی متمانەیان پێدەدات. هەشتاوسێ كەسی (مەلا) بۆ ماوەی هەشت ساڵ دەبنە ئەندامی ئەنجومەنی شارەزایانی ڕێبەریی كە كاریان هەڵبژاردن و چاودێری ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامی ئێرانە و ڕێبەریش سەرۆكی دەسەڵاتی دادوەری و

فەرماندە باڵاکانی هێزە چەکدارەکانیش دەستنیشان دەکات. شورای پاراستنی دەستور، بەرپرسیارەتی دەستنیشان کردنی پاڵێوراوانی سەرۆکایەتی کۆمار و پەرلەمان و هەروەها چاودێری یاساکانی ئەنجوومەنی شورای ئیسلامی دەکات لە ڕووی دەستور و بنەماکانی ئیسلامەوە و هەروەها چاودێری هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی و سەرۆکایەتی کۆمار و ئەنجومەنی شارەزایانی ڕێبەری دەکات، کە ئەوانیش لە لایەن ڕێبەرەوە دادەندرێن، هەروەها کۆمەڵەی دەستنیشان کردنی بەرژەوەندی سیستەم، بە پێی دەستوری هەموار کراوی ساڵی (١٩٨٩) دامەزرا و سی وهەشت ئەندامەکەی لە لایەن ڕێبەرەوە دادەندرێت کە ناکۆکیەکانی نێوان ئەنجوومەنی شورای ئیسلامی و شورای پاراستنی دەستور و هەروەها ڕاوێژپێدان بە ڕێبەر و دانانی سیاسەتە گشتییەکان لە بەرپرسیاریەتی ئەم کۆمەڵەیە دایە. هەروەها ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی، سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە پاش پەسندکردنی ڕێبەر، لە ڕووی سیاسی و ئاسایشی و سەربازی دادەڕێژێت (ملکی، ١٣٨١: ص ٦).

### (١-١-٣)- سیستەمی سیاسی کۆماری ئیسلامی ئێران:

سیستەمی حوکمرانی کۆماری ئیسلامی ئێران بە پێی دەستور، کۆماری و ئیسلامییە و لە سەر کۆمەڵێك بنەما دامەزراوە:

١- ئیمان بە خوای تاقانە و بە تاقانە زانینی لە حوکمرانی و یاسادانان و رازیبوون بە ڕەزای ئەو خوا تاقانەیە

٢- باوەڕ بە وەحی خوا و ڕۆڵی سەرەکی لە داڕشتنی یاساکاندا .

٣- باوەڕ بە ڕۆژی دوایی و ئەو ڕۆڵەی کە لە ڕێبازی مرۆڤایەتیدا، لە کامڵ بوون بەرەو خوا هەیەتی.

٤- باوەڕبوون بە دادپەروەری خوا لە دروستکردن و دانانی یاساکان .

٥ـ باوەڕ بە ئیمامەت و ڕێبەری بەردەوامی و ڕۆڵی سەرەکی لە درێژە پێدانی شۆڕشی ئیسلامی.

٦ـ باوەڕ بە کەرامەت و بەهای بەرزی مرۆڤ و ئازادبوونی بە ڕەچاوکردنی بەرپرسیارەتیی مرۆڤ بەرامبەر بە خوا (دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران، هەموارکراوی ساڵی ١٩٨٩).

## (٢.١.٣)- دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران:

دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران، دەربارەی سیاسەتی دەرەوە و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی دەوڵەت لە چەند مادە و بڕگەدا ئاماژەی پێداوە، وەکو: بڕگەی(ج) مادەی دووەم، بڕگەکانی (٥، ١٦) مادەی سێیەم، مادەی (٨٢) ، بڕگەی (٥) لە مادەی (١١٠)، مادەی (١٢٥)، مادەی (١٢٨)، مادەی (١٣٩)، مادەی (١٤٥)، مادەی (١٤٦) و بڕگەکانی (١، ٢) لە مادەی (١٧٧) (دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران، هەموار کراوی ساڵی ١٩٨٩). هەروەها لە بڕگەی (ج) لە مادەی (٢)دا، هەرچەشنە چەوساندنەوە و زوڵملێکردن، ملهوڕیکردن و قبوڵی چوونە ژێردەسەڵات، ڕەتدەکاتەوە و دادپەروەریخوازی و سەربەخۆیی سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، کەلتوری و یەکیتی نەتەوەیی بە بنەماکانی بڕوایی کۆماری ئیسلامی دەزانێت. مادەی (٣) لە دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران، حکومەت بە بەرپرسیار دەزانێت و ڕایدەسپێرێت تا هەموو تواناکانی خۆی بۆ گەیشتن بە ڕادەی بەرزی هێزی تەواوی بەرگری نەتەوەیی لە ڕێگەی پەروەردەی سەربازی بۆ پاراستنی سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خاك و سیستەمی ئیسلامی وڵات، بەکاربێنێت. لە بڕگەی (١٦) لە مادەی سێیەم، ڕێکخستنی سیاسەتی دەرەوەی وڵات لە سەر بنەمای پێوەرەکانی ئیسلامی، بەرپرسیاریەتی برایانە لە هەمبەر هەموو موسوڵمانان و پاڵپشتی و پشتیوانی بێوچان لە زوڵملێکراوانی هەموو

جیهان بە ئەرکی دەوڵەت دەزانێت (دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران، هەموارکراوی ساڵی ١٩٨٩).

**(٣ـ١ـ٣)- ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران:**

ڕێبەر یان (وەلی فەقیه) لە کۆماری ئیسلامی بە پێی دەستور، بەرزترین دەسەڵاتە و لە مادەی (١١٠) لە دەستور دا، بەم شێوەیە دەسەڵاتەکانی باسکراوە:

١ـ سەرپەرشتیکردنی باش بەڕێوەچوونی سیاسەتە گشتییەکانی وڵات.

٢ـ دیاری کردنی سیاسەتە گشتییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران پاش ڕاوێژکردن لەگەڵ کۆمەڵەی دەستنیشان کردنی بەرژەوەندییەکانی سیستەم.

٣ـ ڕاگەیاندنی جەنگ و ئاشتی.

٤ـ ڕێگەدان بە ئەنجامدانی ڕاپرسی (دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران، هەموار کراوی ساڵی ١٩٨٩). هەروەها لە ساڵی (١٩٨٢) دا لە هەموار کردنێکی دەستوری، وشەی (رەها) خرایە پاڵ ولایەتی فەقیه (ولایت مطلقه فقیه) کە دەسەڵاتەکانی ڕێبەری بێ سنوور و بەرفراوان کرد. بە شێوەیەکی گشتی بڕیارە گرنگەکانی سیاسەتی دەرەوەی هەر وڵاتێك لە ڕێگەی باڵاترین بەرپرسی جێبەجێ کردن وەردەگیرێت، وەکو: سەرۆك کۆمار، سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران، کابینە و...هتد (الموند، ١٣٧٦: ص١٣). بەڵام لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا، ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامی بە هۆی پێگە ئایینی و سیاسی و یاساییەکەی ئەم ڕۆڵە سەرەکییە دەبینێت.

**(٤ـ١ـ٣)- ئەنجوومەنی شارەزایانی ڕێبەری:**

ئەم ئەنجومەنە بە پێی دەستور ئەرکی دیاریکردن و چاودێری کردنی ڕێبەری لە ئەستۆ دایە، ئەم ئەنجومەنە لە سەرەتای شۆڕشی ئیسلامی بۆ پێداچوونەوە بە

دەستوری کۆماری ئیسلامی دامەزرا، کە لە (٨٣) مەلا پێکدێت، کە لە لایەن خەڵکەوە بۆ ماوەی هەشت ساڵ هەڵدەبژێردرێن و دەبێت شارەزا بن لە فیقهیی ئیسلامی(شیعی) دا، ئەم ئەنجومەنە بە پێی دەستور دەسەڵاتی لابـردنی ڕێبەری هەیە، ئەگەر لە کارەکانی سەرکەوتوو نەبوو یان پێشێلی دەستووری کرد، هەروەها ئەرك و چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە و دەسەڵاتەکانیان لە مادەکانی (١٠٧، ١٠٩، ١١١)ی دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێراندا هاتووە.

### (٣-١-٥)- شورای پاراستنی دەستور:

بە پێی مادەکانی (٩١، ٩٤، ٩٧، ٩٩)ی دەستور، ئەم شورایە لە دوازدە کەس پێکدێت کە شەشیان لە فەقیهەکانن (مەلا) و بۆ ماوەی شەش ساڵ لە لایەن ڕێبەرەوە دادەندرێن و شەش کەسی تـریان کە پسپۆر و شارەزای بواری دەستور و یاسادانان بە پێشنیازی سەرۆکی دەسەڵاتی دادوەری کە لە لایەن ڕێبەرەوە پەسند دەکرێت دادەندرێن، واتا ڕێبەر ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی لە دامەزراندنیان هەیە. ئەم شورایە، چاودێری کاروبار و بڕیارەکانی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی دەکات کە ئەو بڕیار و یاسایانەی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی بە پێچەوانە یان دژی بنەما و حوکمەکانی ئیسلام و مەزهەبی شیعە و دەستوری کۆماری ئیسلامی نەبن و ئەگەر بە بڕوای ئەم شورایە وابوو، ئەوە دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئەنجومەنی شورای ئیسلامی بۆ پێداچوونەوە و هەمووارکردنی، بەم مانایە کە ئەم شورایە باڵاتـرین دەسەڵاتە بۆ ڕاڤە کردنی دەستوری کۆماری ئیسلامی، هەروەها لە مادەی (٩٩)ی دەستوردا، ئەم شورایە ئەرکی سەرپەرەشتی و چاودێری کردنی ڕاپرسی گشتی و هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی و ئەنجومەنی شارەزایانی ڕێبەری و سەرۆکایەتی کۆمار و بە گشتی هەموو هەڵبژاردنەکانی لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا هەیە، هەروەها ئەم شورایە

سەلاحیەتی پالێوراوان پێش هەڵبژاردنەکان دیاری دەکات (دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران، هەمواركراوی ساڵی ١٩٨٩). بەم پێیەش نفووز، ڕۆڵ، گرنگی پێگە و دەسەلاتی ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامی، زۆر بە ئاشکرا و بە ڕوونی لە سیستەمی سیاسی کۆماری ئیسلامی ئێراندا دەردەکەوێت.

**(٦-١-٣)- ئەنجومەنی شورای ئیسلامی:**

لە دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێراندا، دەسەلاتی یاسادانان، پێگەیەکی بەرزی هەیە کە هەم چاودێری پێکهاتەی هێز دەکات و هەم یاسا دادەنێت، بەلام لە ڕووی سیاسەتی دەرەوەدا ئەو پێگە بەهێزەی لە کردەوەدا نییە، بەڵکوو تەنیا دەتوانێت متمانە بدات بە وەزیری دەرەوە یان پرسیاری لێبکات یان متمانە لە ئەو و سەرۆك کۆمار وەربگرێتەوە. هەروەها لە پرسی پەسندکردنی بودجەی وەزارەتی دەرەوەدا دەتوانێت کاریگەری هەبێت، هەرچەندە بە پێی دەستور دەتوانێت پەیماننامە و ڕێککەوتننامە نێونەتەوەییەکان پەسند یان ڕەتبکاتەوە، بەلام لە کردەوەدا بەم شێوەیە نییە و سیاسەتی دەرەوە کە دەکەوێتە چوارچێوەی سیاسەتە بالاکانەوە، ئەوە ناوەندی بالای تـر، کاریگەریان هەیە لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا و تەنانەت لە دەستنیشان کردنی وەزیری دەرەوەدا، سەرۆك کۆماریش دەبێت ڕەزامەندی یان ڕای وەربگرێت (محمدی، ١٣٧٧: ص٩٦ـ٩٥). کەئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە لایەك ئەنجومەنی بالای ئاسایشی نەتەوەیی بوونی هەیە، کە بە هۆی ئەو دەسەلاتە بەرفراوانەی هەیەتی کە بـریتییە لە: دیاریکردنی سیاسەتی بەرگری و ئاسایشی وڵات، هەماهەنگی هەموو چالاکییەکانی سیاسی، هەواڵگری، کۆمەلایەتی، کولتووری و ئابووری لە پەیوەندی لەگەڵ ڕێکارەکانی بەرگری و ئاسایش و هەروەها کەڵك وەرگرتن لە هەموو تواناکانی وڵات بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هەڕەشە و مەتـرسییە ناوخۆیی و

دەرەکییەکان. بۆیە دەتوانین بڵێین دەسەڵاتێکی سیاسی و ئاسایشی بەرزی هەیە، بە تایبەت کە بڕیارەکانی لە لایەن ڕێبەرەوە پەسند دەکرێن و هەموو دامەزراوەکان لە وڵات دەبێت جێبەجێی بکەن (مدنی، ١٣٨٧: ص٣٨١ـ٣٨٠). لە لایەکی تــرەوە، دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردن و یاسادانان و دادوەری هیچ جۆرە چاودێری و بەدواداچوونێکیان بۆ ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی و بڕیارەکانی نییە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە دەسەڵاتەکانی تــر دەبێت بە پێی ئەم بڕیارانەی ئەنجومەنەکە کار بکەن، بەم مانایە کە پاش پەسندی ڕێبەری، بڕیارەکانی دەسەڵاتەکانی تــر بە تایبەت جێبەجێ کردن و یاسادانان لە ژێر کاریگەری بڕیارەکانی ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەییدایە (هاشمی،١٣٨٧: ص٦٥٠). ئەنجومەنی شورای ئیسلامی، لێژنەی کاروباری دەرەوەی هەیە کە خوێندنەوە بۆ سیاسەتی جیهانی وپەیوەندییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران دەکات لەگەڵ دەوڵەت و لایەن و گەلانی دیکە، ئەم لێژنەیە هەندێ جار پرسیار لە وەزارەتی دەرەوە دەکات لە هەمبەر کاروبارە دەرەکییەکان و داوای ڕوون کردنەوەی لێدەکات (ایزدی، ١٣٧١: ص٤٥).

بە گشتی لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا، دەسەڵاتی یاسادانان دەربارەی ڕۆڵ بینین و شوێندانەری لە سەر سیاسەتی دەرەوەدا، بە سێ شێوە لە ژێر کاریگەری ناوەندەکانی تــر دایە:

١- کاریگەری یاسایی: بەم مانایە کە دامەزراوەی ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی، کە بڕیارەکانی لە لایەن ڕێبەرەوە پەسند دەکرێت، بە شێوەی ئاشکرا و یاسایی کاریگەری لە سەر ئەنجومەنی شورای ئیسلامیدا هەیە بە پێی مادەی (٥٧، ١١٠)ی دەستور، لێرەوە ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی پێگەیەکی باڵاتــری لە ئەنجومەنی شورای ئیسلامی هەیە.

٢- کاریگەری ناڕاستەوخۆ: بەم مانایە کە ئەنجومەنی شورای ئیسلامی بە شێوەی ناڕاستەوخۆ لە ژێر هێژمونی ناوەڕۆکی سیاسەتە گشتییەکانی سیستەمدایە، کە لە لایەن کۆمەڵەی دەستنیشان کردنی بەرژەوەندییەکانی سیستەم دیاریدەکرێت، چونکە بڕیارەکانی ئەم دامەزراوەیە لە لایەن ڕێبەرەوە پەسند دەکرێت و بۆیە ئەنجومەنی شورای ئیسلامی دەبێت ئەم بڕیارانە لە بواری یاسادانانندا ڕەچاو بکات.

٣- کاریگەری پسپۆڕی و کردەیی: بەم مانایە کە هەرچەندە لە ڕووی یاساییەوە دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و یاسادانان بەرابەرن، بەڵام بە هۆی ئاڵۆزی و پسپۆری ئەرکەکانی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن وادەکات کە لە کردەوەدا دەسەڵاتی جێبەجێ کردن لە سەروو دەسەڵاتی یاسادانانەوە بێت (خلیلی، ١٣٨٧: ص٧٥). لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا بە پێی مادەی (٧٧)ی دەستور، دەکرێت ڕۆڵی فەرمی ئەنجومەنی شورای ئیسلامی لە سیاسەتی دەرەوەدا بەم شێوەیە پۆلین بکەین:

ا- چاودێری ئەنجومەنی شورای ئیسلامی بە سەر ڕێککەوتننامە نێونەتەوەییەکان.

ب- یاسادانان لە بواری سیاسەتی دەرەوە.

پ- ڕۆڵی لیژنەی سیاسەتی دەرەوە (سیف زادە، ١٣٨٧: ص١٦١).

### (٧.١.٣)- کۆمەڵەی دەستنیشان کردنی بەرژەوەندی سیستەم:

کۆمەڵەی دەستنیشان کردنی بەرژەوەندی سیستەم لە ئێران، سیاسەتە گشتییەکان بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران دیاریدەکات، بەم مانایە ئەم سیاسەتانە ئامانجە باڵاکان بۆ چەمکی کردەیی و جێبەجێ کردن نزیك دەکاتەوە و هەموو دامەزراوەکانی حکومەت، دەسەڵاتەکانی دادوەری، جێبەجێ کردن، یاسادانان، هێزە چەکدارەکان و ڕاگەیاندن و...هتد،

دەبێت جێبەجێی بكەن، واتا كۆمەڵەكە وەك باسكی راوێژكاری ڕێبەری لە سیاسەتە ناوخۆیی و دەرەكییەكاندا كار دەكات (مهرپور، ١٣٨٠: ص٣٨١). بە لێوردبوونەوە لە مادەی (١١٠) لە دەستوری ئێران، دەردەكەوێت كە دیاریكردنی سیاسەتە گشتییەكان لە لایەن كۆمەڵەی دەستنیشان كردنی بەرژەوەندی سیستەم جۆرێك زیاد كردنی دەسەڵاتەكانی ڕێبەر بووە، چونكە كۆمەڵەكە وەك باسكێكی بەهێزی ڕێبەری لە دوو بواری سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەدا، هەژمار دەكرێت (یزدی، ١٣٧٥: ص٥٥٣). ئیمڕۆ لە كردەوەدا دەبینرێت كە كۆمەڵەی دەستنیشان كردنی بەرژەوەندی سیستەم، بە پاڵپشتی بنەمای دیاریكردنی سیاسەتە گشتییەكان و لە لایەكی تـرەوە بە پاڵپشتی جەختكردنەوە لە سەر بەرژەوەندی سیستەم بۆ چارەسەر كردنی ناكۆكییەكانی نێوان ئەنجومەنی شورای ئیسلامی و شورای پاراستنی دەستور، دەبێتە هۆی كەمتــركردنەوەی هێزی یاسادانان لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا، بۆ نموونە: كاتێك كە سیاسەتی گشتی گەشەپێدان و پەرەسەندن دادەڕێژرێت، ئەنجومەنی شورای ئیسلامی ناتوانێت دژی راوەستێت یاخود بۆ نموونە لە كاتی بە ئەندامبوونی ئێران لە دامەزراوە یان ڕێكخراوێكی نێودەوڵەتی یان دروستكردنی پەیوەندی و بــڕینی پەیوەندی لەگەڵ لایەنێك، بە هۆی ئەوەی كە سیاسەتە گشتییەكان پەسندكراوی ڕێبەرین، شورای پاراستنی دەستوریش ناتوانێت رەتی بكاتەوە و بڵێت ئەوە بە پێچەوانەی دەستور و بنەماكانی ئیسلامە، كە لە ڕاستیدا ئەوەش ڕۆڵ و پێگەی ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران نیشاندەدات (خلیلی، ١٣٨٧: ص٨٤). بەم پێیە چەمكی دەستنیشان كردن و دیاریكردنی سیاسەتە گشتییەكانی سیستەم دەتوانێت فاكتەرێكی سنووردار‌كردنی دەسەڵاتەكانی دادوەری و جێبەجێ كردن و یاسادانان بێت و جۆرێك لە بەرفراوانتــربوونی دەسەڵات بۆ ڕێبەری شورش بێت كە لە ڕێگەی كۆمەڵەی دەستنیشان كردنی بەرژەوەندی سیستەم ئەنجام دەدرێت (هاشمی،

١٣٨٧: ص٨٩ـ٨٨). لێرەوە دەتوانین بڵێین لە سەرەتای شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا نەبوونی دامەزراوەی سیاسەت دانانی پسپۆر و پیشەیی لە هەموو بوارەکانی ناوخۆ و دەرەکیدا، بووە هۆی ئەوەی کە لە پێداچوونەوەی دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران، دامەزراوەیەك دابمەزرێت کە سیاسەتە گشتییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە بواری ناوخۆ و دەرەکی دابـرێژێت یاخود ڕێبەری راوێژیان پێبکات، هەرچەندە کە لە ئێران دەستنیشان کردن و دیاریکردنی سیاسەتە گشتییەکان ئەرکی ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامییە، بە تایبەت لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا (یزدی، ١٣٧٥: ص٦٥٧).

### (٨ـ١ـ٣)- ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی:

لە دەستوری ساڵی (١٩٧٩) دا، دامەزراوەیەك بەم ناوە بوونی نەبوو، بەڵکوو تەنیا ئەنجومەنی باڵای بەرگری هەبوو، بەڵام لە هەموارکردنەوەی دەستوردا لە ساڵی(١٩٨٩)، ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی دامەزرا تاوەکو بوارەکانی ئابوری و سەربازی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و...هتد، لە چوارچێوەی ئاسایشی نەتەوەیی ئێراندا خوێندنەوەیان بۆ بکرێت یاخود پرس و بابەتی پەیوەندی لەگەڵ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە سیاسەتی دەرەوەدا کە تا ساڵی (١٩٨٨) و بە تایبەت سیاسەتی دەرەوە، لە لایەن ئ‌یتاللەخومەینییەوە دیاریدەکرا، بەڵام بە شێوەی تیۆریك و دارێژراو نەبوو، بۆیە ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی دامەزرا تا لە سەر بنەمای بڕیارەکانی کۆمەڵەی دەستنیشان کردنی بەرژەوەندییەکانی سیستەم هەم لە بواری سیاسەتەکانی ناوخۆیی بڕیار بدات و هەم لە بواری سیاسەتەکانی بەرگری و ئاسایشی و بە تایبەت دەرەکی و پەیوەندییەکاندا بڕیاری پێویست وەربگرێت. کۆمەڵەی دەستنیشان کردنی بەرژەوەندییەکانی سیستەم ڕەهەندە گشتییەکان و ئامانجەکان و ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی، هەنگاوە

کردەییەکان لە بواری بڕیارە ستــراتیژیك یاخود هەنووکەییەکان لە بواری ئاسایشی نەتەوەییدا کە سیاسەتی دەرەوە و پەیوەندییەکان بەشێکن لێی دیاریدەکەن، کە بە هۆی پێگەی ڕێبەری شۆڕش لە دەستوردا ئەم بڕیارانە گرنگی تایبەتیان هەیە (خلیلی، ١٣٨٧: ص٨١). ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی بە پێی مادەی (١٧٦)ی دەستوری (١٩٨٩)، لە لایەن سەرۆك کۆمارەوە سەرۆکایەتی دەکرێت، ئەم مادەیە دەڵێت: ((بە مەبەستی دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی نەتەوەیی و پاراستنی شۆڕشی ئیسلامی و یەکپارچەیی وڵات و سەرچاوەکانی نەتەوەیی ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی بە سەرۆکایەتی سەرۆك کۆمار پێکدەهێنرێت)). ئەم ئەنجومەنە لەم کەسانە پێکدێت: سەرۆکەکانی هەر سێ دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێ کردن و دادوەری، سەرۆك ئەرکانی هێزە چەکدارەکان، وەزیری پلاندانان و بودجە، وەزیری ناوخۆ، وەزیری هەواڵگری، فەرماندەی سوپای پاسدارانی شۆڕشی ئیسلامی و فەرماندەکانی هێزە دەریایی و ئاسمانی و وشکایی ئەم سوپایە، فەرماندەی ئەرتەش و فەرماندەکانی هێزە دەریایی و ئاسمانی و وشکایی ئەم هێزە و هەروەها لە کاتی پێویست وەزیری پەیوەندیدار (دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران، هەموار کراوی ساڵی ١٩٨٩).

### (٣-١-٩)- سەرۆك کۆمار:

بە شێوەی فەرمی سەرۆك کۆماری ئیسلامی ئێران بەرپرسی یەکەمی دەسەڵاتی جێبەجێکردنە و لە پاش ڕێبەر بەرزتــرین پێگەی دەستوری هەیە، بەڵام بە پێی مادەی (١٢٢)ی دەستور، سەرۆك کۆمار لە بەرامبەر گەل و ڕێبەر و ئەنجومەنی شورای ئیسلامیدا بەرپرسیارە و ئەنجومەنی شورای ئیسلامی ئێران دەتوانێت بە زۆرینەی دوو لە سەر سێی دەنگەکان سەرۆك کۆمار لە سەر کارەکەی لاببات، هەروەها ڕێبەری باڵای ئێرانیش دەتوانێت متمانە لە سەرۆك کۆمار

وەربگرێتەوە. دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران سەرۆك کۆمار بە بەرپرسی جێبەجێ کردنی دەستور دەزانێت، هەروەها بە پێی مادەی (١٢٨، ١٢٥)ی دەستور، واژوی رێککەوتننامە نێونەتەوەییەکان، ناردنی باڵیۆز و قبوڵ کردنی باڵیۆزی بیانی لە ئەستۆی سەرۆك کۆمارە، هەرچەندە بە پێی مادەی (١٢٥) دەبێت رێککەوتننامەکان لە لایەن ئەنجومەنی شورای ئیسلامی پەسند بکرێت (دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران، هەموارکراوی ساڵی ١٩٨٩).

### (٣-١-١٠)- ئەنجومەنی وەزیران و وەزارەتی دەرەوە:

پاش هەموار کردنی دەستور لە ساڵی (١٩٨٩) ئەنجومەنی وەزیران راستەوخۆ لە ژێر دەسەڵاتی سەرۆك کۆماردایە و بە پێی مادەی (٣) لە بڕگەکانی (٥، ١٦) دەسەڵاتەکانی دیاریکراوە و لە مادەی (١٣٣)ی دەستوردا بەم شێوەیە دەڵێت: ((سەرۆك کۆمار وەزیرەکان دیاریدەکات و داوا لە ئەنجومەنی شورای ئیسلامی دەکات کە متمانەیان پێبدات و ئەگەر ئەنجومەنی شورای ئیسلامی گۆڕدرا، ئەوە پێویست بە متمانە لێوەرگرتنەوە لە وەزیرەکان ناکات و بە پێی یاسا ژمارەی وەزیرەکان و دەسەڵاتەکانیان دیاری دەکرێت)). وەزارەتی دەرەوە گرنگی تایبەتی هەیە لە کاروباری دەرەوەدا، بۆ ئەم مەبەستەش وەزیری دەرەوە لە ناوەندە گرنگەکانی ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی و ئەنجومەنی وەزیران و هەروەها لە کاتی پێویستدا لە ئەنجومەنی شورای ئیسلامی و کۆمەڵەی دەستنیشان کردنی بەرژەوەندییەکانی سیستەم ئامادە دەبێت یان نوێنەری ئامادە دەبێت(ایزدی، ١٣٧١: ص١٠٠). هەروەها وەزارەتی دەرەوە کاری چاودێری و دامەزراندنی پەیوەندی و نوێنەرایەتی دەرەوە و ئامادەکردن و کۆکردنەوەی زانیارییە و بە پێی پێویست بڕیار وەردەگرێت و سیاسەتی دەرەوە جێبەجێ دەکات (محمدی، ١٣٧٧: ص٩٥). یەکێك لە گرنگترین سەرچاوەکانی وەرگرتنی زانیاری بۆ داڕشتنی

سیاسەتی دەرەوەی ئێران كەناڵە دیپلۆماتیكەكانن لە ڕێگەی نوێنەرایەتی و باڵیۆزخانەكانی ئێرانەوە، هەروەها زانیارییەكانی دەزگا ئەمنییەكان، سەرچاوەكانی ڕاگەیاندن، هاووڵاتیانی ئەو وڵاتانە و گروپە فكریەكان و پاشكۆ كولتووریەكانی ڕێكخراوی كولتوور و پەیوەندییە ئیسلامییەكانە و لە سەر بنەمای پەیڕەوی ناوخۆی وەزارەتی دەرەوەی ئێران، پرس و بابەتەكان دەچێتە بەردەم سەرۆك كۆمار و كابینە و ئەگەر هەستیار و ئاسایشی بێت، ئەوە دەچێتە بەردەم ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی و ئەگەریش لە پرسە باڵاكانی وڵات بوو ئەوە دەچێتە بەردەم ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران (ملكی، ١٣٨١: ص ٦).

### (١١-١-٣)- دەسەڵاتی دادوەری:

هەرچەندە ئەم دەسەڵاتە بە شێوەی ڕاستەوخۆ كاریگەری لە سەر سیاسەتی دەرەوەدا نییە، بەڵام بە پێی مادەكانی (١١٠، ١٥٧) لە دەستوری كۆماری ئیسلامی ئێران سەرۆكی دەسەڵاتی دادوەری وەك بەرزترین دامەزراوەی دادوەری لە ئێران لە لایەن ڕێبەرەوە هەڵدەبژێردرێت، هەروەها سەرۆكی دەسەڵاتی دادوەری ئەندامی كۆمەڵەی دەستنیشان كردنی بەرژەوەندییەكانی سیستەمە و هەروەها ئەندامە لە ئەنجوومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی و بە پێی مادەی (١٥٦)ی دەستوری ئێران، چاودێری یاساكان دەكرێت كە بە باشی جێبەجێ بكرێن، كە ئەمە یاساكانی بواری سیاسەتی دەرەوەش دەگرێتەوە (دەستوری كۆماری ئیسلامی ئێران، هەمواركراوی ساڵی ١٩٨٩).

### (١٢-١-٣)- هێزە چەكدار و سەربازییەكان:

مادەكانی (١٤١، ١٤٣، ١٥٠) لە دەستوری كۆماری ئیسلامی ئێراندا ئەركی هێزە چەكدارەكانی كۆماری ئیسلامی كە بریتیین لە سوپای پاسدارانی شۆڕشی

ئیسلامی و ئەرتەش، دیاریدەکات کە بـریتییە لە پاراستنی سەربەخۆیی و یەکپارچەیی وڵات و پاراستنی سیستەمی کۆماری ئیسلامی ئێران و شۆڕشە ئیسلامییەکە و دەسکەوتەکانی، هەروەها لە دیباجەی دەستوری ئێراندا هاتوە کە: ((ئەرکی سوپای پاسداران و ئەرتەش تەنها پاراستنی سنوورەکان نییە، بەڵکوو ئەرکی بڵاوکردنەوەی بیروباوەر، جیهاد لە رێگای خودا و خەباتکردن لە پێناو پەرەسەندنی دەسەڵاتی یاساکانی خوا لە جیهاندا لە ئەستۆی سوپای پاسداران و ئەرتەشدایە)) (دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران، هەموار کراوی ساڵی ١٩٨٩).

سوپای پاسداران وەك هێزێکی خاوەن ئەزموون لە جەنگ و لە لایەکی تـرەوە لە ناوخۆش خاوەن پێگە و نفوزی سیاسی و ئابوورییە، دامەزراندنی سوپای پاسداران لە ساڵی (١٩٧٩) لە لایەن ئایەتوڵڵا خومەینییەوە بۆ ئەم مەبەستە بوو کە لە لایەك ئەرتەشی شاهەنشاهی کۆنتـرۆڵ بکات و لە لایەکی تـرەوە لە ناوخۆ مەتـرسی نەیارەکان لەسەر شۆڕش نەهێڵێت. جەنگی هەشت ساڵەی ئێران و عێراق ڕۆڵی سوپای پاسدارانی زیاتـر کرد و دواتـر سوپا و بەرژەوەندییەکانی بوون بە بەشێکی دانەبـڕاو لە سیستەمی سیاسی و نوخبە باڵاکان و ڕێبەری کۆماری ئیسلامی، ڕۆڵی سوپای پاسداران جگە لە بواری چەکداری و کۆنتـرۆڵی دەرەکی و ناوخۆیی، لە ڕووی ئابوورییەوە وایکردووە کە تەنانەت کۆنترۆڵی دەرهێنان و هەناردە کردنی نەوت وغازیشی کردووە، سوپای پاسداران ئەمە لە سەر بنەمای مادەی (١٤٧) ی دەستوری ئێران دەکات، هەروەها سوپای پاسداران هەموو کاڵا ئێلێکتـرۆنییەکانی ئێران خۆی بەرهەم دێنێت و یان لە ڕێگەی کۆمپانیاکانی گرێدراوی خۆی کۆمپیوتەر و تەلەفون و مۆبایل و سیم کارت و... هتد، بەرهەم دێنێت و بازاری قۆرخ کردووە، لە لایەکی تـریشەوە سوپای پاسداران بە پێی تەفسیری مادەی (١٤٧)ی دەستور دیسانەوە وەك بەڵێندەرێك لە پڕۆژە گەورەکانی ئاوەدانکردنەوە کار دەکات، ئەمە جگە لەوەی کە سوپای

پاسداران کۆنترۆڵی زۆربەی فرۆکەخانەکانی ئێرانی کردووە و لە هەموو جومگەکانی دەسەڵات لە ئێراندا بوون و نفووزی هەیە و تەنانەت کۆنترۆڵی ئاسایشی ناوخۆ و دەرەوە و دەستێوەردان لە کاروباری سیاسی دەکات (آلفونە، ١٣٨٦: ص٥ـ٤). گرنگتـر لەمانە، سوپای پاسداران کۆنترۆڵی زۆربەی دامەزراوەکانی مووشەکی و پرۆگرامی ئەتۆمی ئێرانی کردووە (محمدی، ١٣٧٤: ص٢١). هەروەها بە پێی دەستور فەرمانده باڵاکانی سوپا و ئەرتەش ئەندامن لە ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی نەتەوەیی و ئەمە جگە لە ڕۆڵی هێزێکی میلیشیایی سەر بە سوپای پاسداران بە ناوی (بەسیج) لە سەرکوتکردنی نارەزایەتیەکان کە هەندێ جاریش وەك گروپی گوشار کاردەکات، هەروەها ڕۆڵی گرنگی سوپای قودسی سەر بە سوپای پاسداران کە لە دەرەوەی سنوورەکانی کۆماری ئیسلامی لە وڵاتانی ناوچەکە چالاکی دەکات. هەروەها بە پێی دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران فەرمانده گشتییەکانی هێزەکانی ئەرتەش وسوپای پاسداران لە لایەن ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامییەوە دادەندرێن یان لادەبـردرێن و ڕێبەری شۆڕش خۆی ڕاستەوخۆ فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانە. لێرەوە ڕۆڵی وەلی فەقیه (ڕێبەر) لە ڕووی بەرفراوانی دەسەڵاتەوە دەردەکەوێت، جێگەی ئاماژەیە کە سوپای پاسداران تەنیا خۆی لە بەرامبەر ڕێبەری شۆڕش بە بەرپرس دەزانێت. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا ڕێبەر بە پێی دەستور ڕۆلێکی هەرە سەرەکی هەیە لە پێکهاتەی فەرمی و یاساییدا و هەموو جومگەکانی دەسەڵاتی کۆنترۆڵکردووە و سیاسەتی دەرەوەش لە ڕێگەی ئەو کەناڵانەوە لە ژێرەستی ڕێبەردایە، بەم مانایە کە ڕۆڵی ئایینی و یاسایی ڕێبەر ئەم پێگەیە دەستەبەر دەکات و سەرچاوەی ئەم هەموو دەسەڵاتەش لەو ناسنامە ئایینییەوە سەرچاوە دەگرێت، کە باسی دەکەین.

**(٢.٣)- سەرچاوەکانی ناسنامەسازی لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران:**

مەبەست لە سەرچاوەکانی ناسنامەساز، کۆمەڵێك ڕەگەزی بنیاتنەرانەیە لە سیستەمەکانی بەهایی و پێوەریدا، کە دەبێتە هۆی دروستبوون و پێکهاتن و بەرجەستەبوونی تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵایەتی، سیاسی و کولتووری دەولەتی ئێران، کە ئەم دەوڵەتە لە دەوڵەتەکانی تـر جیاواز دەکات. ئەم سەرچاوە ناسنامەسازانە، بنەمای لێکدانەوە و تێگەیشتنی سیاسەت داڕێژەرانە لە بواری پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان و سیاسەتی دەروە، ڕووداوەکان و هەروەها ئامانج و مەبەستەکانی ئەکتەرەکانی تـر، کە لە قۆناغی دواتـردا، کاردانەوەی گونجاو لە هەمبەر ئەواندا پێناسە دەکات. مێژووی ئێران، ئایینی ئیسلام و مەزهەبی شیعە، گوتاری شۆڕشی ئیسلامی، جیهانی سێیەمگەرایی و جیۆپۆلەتیك، وەك بەشێك لە سەرچاوەکانی ناسنامەساز، لە سیاسەتی دەروەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا دەناسرێت (دهقانی فیروز آبادی ونوری،"کتاب"، ١٣٩١: ص٧٠).

لە ڕوانگەی کۆماری ئیسلامییەوە سنوورە بڕوایی و ئایدۆلۆژیکەکان جێگەی سنوورە جوگرافیاییەکان دەگرێتەوە و ناسنامەی کۆماری ئیسلامی لە ڕەگەزەکانی ناسنامەی ئیسلامی، ناسنامەی شۆڕشی ئیسلامی و ناسنامەی ئێرانی پێکدێت، ئەوانەش پێکەوە گرێدراو و تێکئالاّون و لە کاتە جیاوازەکاندا لەوانەیە ڕەگەزێکیان بەهێزتـر بێت. کاریگەری ناسنامەی نەتەوەیی لە کۆماری ئیسلامی لە سەر سیاسەتی دەرەوەدا لە ڕێگەی پێناسە کردن و دەستنیشان کردنی ڕۆڵە جیاوازەکاندا دەبێت و چونکە پێکهاتەکانی ناسنامەی کۆماری ئیسلامی جیاواز و فرەن، ئەوە ئەم دەوڵەتە ڕۆڵی فرە و جیاوازی دەبێت لە سیاسەتی دەرەوەدا، بۆ نموونە ڕۆڵەکانی: دەوڵەتی دادپەروەر تەوەر و دژی زوڵم،

بکەری دژە دەسەڵاتی زاڵی ناوچەیی ونێونەتەوەیی، دژی ئیمپریالیزم و سەهیۆنیزم، دژی ئیستکبار، سەنگەری شۆڕشی رزگارکەرانە، بەرگریکاری ئیسلام و شیعە، پشتیوانی موستەزعەفین، ئیلهام بەخشی لە جیهانی ئیسلامدا، ناوەندی جیهانی ئیسلام، دەوڵەتی نموونە و سەرمەشق، یارمەتیدەری یەکێتی و یەکگرتوویی جیهانی ئیسلام، دەوڵەتی پێداچوونەوەخواز و پێکهاتەشکێن، دەوڵەتی سەربەخۆ، پشتیوانی بزوتنەوە رزگاریخوازەکان، هاوپەیمانی وەفادار و...هتد (دهقانی فیروزآبادی، ١٣٨٦: ص٧٩). بەم پێیەش لێرەدا هەوڵ دەدەین کەگرنگتــرین و شوێندانەرتــرین سەرچاوەکانی ناسنامەساز، لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا بخەینەڕوو.

### (١-٢-٣)- مێژووی ئێران:

یەکێك لە سەرچاوەکانی بنیاتنەری ناسنامە یان ناسنامەساز لە ئێراندا مێژووی هەزاران ساڵەی ئەم وڵاتەیە، کۆماری ئیسلامی ئێران وەك دەوڵەتانی تــر بە گێڕانەوەی مێژوو بە شێوەی ویستــراو و تایبەتی خۆی، مێژووی ئێرانی کردۆتە پاڵپشتی سیاسەت و کردەوەکانی ئەمرۆی خۆی (متقی و کاظمی، ١٣٨٦: ص٢١٩).

لە ڕوانگەیەکی تــرەوە، ئێرانییەکان هەروەك چۆن خۆیان بەرهەمی ئەم مێژوویەن، بەڵام دووبارە ئەم مێژووە بەرهەم دەهێننەوە و بە گێڕانەوەی دووبارەی مێژوو، شانازی پێوە دەکەن یاخود هەست بە شەرمەزاریی دەکەن، کە ئەم هەست بە شانازی یان شەرمەزاریە، یەکێکە لە سەرچاوەکانی گرنگی ڕەوایەتی پێدان یان ڕەوایەتی لێوەرگرتنەوە لە ڕووداو و ڕەفتارەکانی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران (توکلی طرقی، ١٣٨٢: ص٩). لە ڕەگەزەکانی پەیوەندیدار لەگەڵ مێژووی ئێران، ئەفسانە و ئۆستوورە ئێرانییەکانن، ئەفسانە جۆرێکە لە لێکدانەوەی فەلسەفی بۆ جیهان یان شیکردنەوەی رابــردوو بە شێوەی میتافیزیکی

کە بە جێگرەوەی لێکۆڵینەوەی زانستی دادەندرێت کە کۆنەست (لاشعور)ی بەکۆمەڵ، گرێدەداتە هەست(شعور)ی بەکۆمەڵی ئێرانییەکان. ئەفسانە و ئۆستوورەکانی ئێرانی فراوانن و دیاردەی جۆراوجۆر لە خۆ دەگرێت، وەکو چۆنیەتی خولقاندنی جیهان و دابەشکردنی بۆ دوو ڕەهەندی ئەهورایی(خودایی) و ئەهریمەنی(شەیتانی)، ململانێی ئەم دوو لایەنە کە یەکێك هێمای باشە و تیشك و ڕووناکیە و ئەوەی تریان هێمای خراپە و تاریکیە، هەموو کات باڵی بە سەر کولتووری ئێرانیدا کێشاوە (نقیب زادە، ١٣٨١: ص٧٤-٧٣). ڕەگەزێکی تری گرنگ لە مێژووی ئێراندا ئیمپراتۆریەت و ئەو شارستانییەتە حەوت هەزار ساڵەیەیە کە بەرفراوانی سنوورەکانی و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی و فرەیی نەتەوەکانی ئەم ئیمپراتۆریەتە و پێکەوە هەڵکردنیان بۆتە جێگەی شانازی ئێرانییەکان (هوار، ١٣٦٣: ص٢١٠). هەروەها ئێرانییەکان شانازی بەوەوە دەکەن کە ئەفلاتۆن فەیلەسوفی یۆنانی، کورش ئیمپراتۆری ئێرانی بە بێ وێنە زانیوە و بە سەرمەشقی یۆنانییەکانی داناوە (خدادادیان، ١٣٨٣: ص٢٠٩). لە پەنا شانازیەکانیش، مێژووی ئێران زۆر ڕووداوی پڕ لە شکست و داگیرکردنی تێدایە، وەکو هێرشی ئەسکەندەری مەقدۆنی و چەنگیزخان و تەیموری لەنگ و دواتر داگیرکاریەکانی رووسیا و بەریتانیا لە باکوور و باشووری ئێران (فولر، ١٣٧٣: ص١٥٨). هەروەها دابڕانی بەشێك لە خاکی ئێران لە لایەن ڕووسەکانەوە و بەشێکی تری لە لایەن بەریتانییەکانەوە، هەمووکات لە یادەوەری و بیرەوەری ئێرانییەکاندا بۆتە مایەی ئازار و شەرمەزاری (موسوی، ١٣٨٤: ص٧٥). یەکێکی تر لە ڕەگەزەکانی ناسنامەی ئێرانی ئەوەیە کە ئێرانییەکان لە مێژووی خۆیاندا جیهان وەك چوارچێوەیەکی مەعنەویگەرایانە یاخود ئەخلاقی درك پێدەکەن و گەرانەوە بۆ ئۆستوورە مێژوویەکان نیشاندەری ئەو ڕاستییەن کە ئەوان خۆیان بە هەڵگرانی پەیام و ئەمانەتی ئیلاهی دەزانن لە

سەر زەوی و بۆیە چاوەڕوانیان لە حکومەت، سیاسەت، دەوڵەت، شا و ڕێبەر، ئەخلاقی و مەعنەویە، کە دەبێت ئەم پەیامە ئیلاهیە لە سەر زەوی جێبەجێ بکەن (رچائی راد، ١٣٧٨: ص١١٤).

## (٢.٢.٣)- تیۆری پیلانگێری و ترس لە بێگانە:

موریس دۆڤێرجە، لە کتێبی (بنەماکانی زانستی سیاسەت)دا دروستکردنی دوژمن بە یەکێك لە شێوازەکانی شاردنەوەی ئامانج و پاڵنەرە سیاسییەکان دەزانێت و بڕوای وایە کە گرنگی دوژمن لە ئاست و قەبارەی خۆی گەورەتر دەکرێت و بە ناوی ڕێگرتن لە مەترسی ئەو دوژمنە، ڕێوشوێنی پێویست دەگرێتە بەر کە لە بەرژەوەندی چینی دەسەڵاتداراندایە (دوورژە، ١٣٧٩: ص١٩٩). لە ڕووی دەروونناسیەوە، دانە پاڵی تایبەتمەندیە خراپەکان بە کەسێك یان گروپێك یان ژینگەیەك جۆرە میکانیزمێکە کە یارمەتی تاك یان گروپێك دەدات، کە نەهامەتی و کەم وکورتیەکانی بتوانێت ساناتر قبوڵ بکات، واتا باشتر ڕووبەڕووی واقعە تاڵەکەی خۆی ببێتەوە، لە کاتێکدا ئەم داوەریە دەربارەی دوژمنەوە، داوەری ناوشیارانەیە دەربارەی بەشە نادیارەکانی خۆمان (صادقی، ١٣٨٨: ص١٥٣). نووسەرێکی شارەزا لە مێژوو و کولتووری ئێرانی بە ناوی ئەحمد ئەشرف، دەربارەی تیۆر یان وەهمی پیلانگێری دەڵێت: (( هەرکەس یان گروپ و نەتەوەییەك کە واقعبین نەبێت ئەوە هەموو ڕووداوە سیاسی و مێژوییەکان بە کاری هێزەکانی بێگانە و دەرەکی دەزانێت، کە لە ڕووی سیاسی وئابووری و تەنانەت مەزهەبیشەوە خەریکن ئەو وڵاتە بروخێنن یان کاریگەری سلبیان لە سەر وڵاتەکە هەیە و بڕوایان وایە کەحوکمرانەکانی ئەو وڵاتەش هیچ ئیرادەیەکیان لە خۆیانەوە نییە بەڵکوو ئەوە تەنیا ئەجێندای دەرەکییە کە جێبەجێی دەکەن)) (اشرف و دیگران، ١٣٧٦: ص٦٩). هەروەها د. صادق زیبا

کلام، نووسەر و مامۆستای زانستە سیاسییەکانی زانکۆی تاران، بڕوای وایە کە وڵاتێك لە باکوورەوە بەردەوام بە درێژایی مێژوو لە ژێر هێرش و هەڕەشەی ڕووسەکان بووە و لە باشووریشەوە بەریتانییەکان و لە ڕۆژئاوا لە ژێر کۆنترۆڵی عوسمانییەکاندا بووە و بەردەوام بێگانە و دەرەکییەکان دەستێوەردانیان لە کاروباریدا کردووە، ئەم کۆمەڵگەیە بەرەبەرە بڕوای بە هێزێکی دەرەکی دەبێت کە لە سەرووی ئیرادەی خەڵکدایە و کۆنترۆڵی هەموو ڕووداوەکان دەکات و ڕاستییە مێژوویەکانیش هەر ئەوە دەسەلمێنن و ئەوەش وایکردووە کە ئێرانییەکان یادەوەری و بیرەوەری مێژووییەکەیان ئەوە دووپاتبکاتەوە کە ئەوە بێگانەکانن بڕیار بۆ ئێرانییەکان دەدەن، کە ئیمڕۆکە ئێمە ئەوە بە تیۆری پیلانگێری دەناسین. ئەمەش وادەکات کە خەڵکی ئێران بڕوا و متمانەیان بە ڕووداو و پێشهاتە سیاسییەکان و کاروباری سیاسی نەمێنێت، بەڵکوو بەردەوام هەوڵ بدەن کە ئەم ڕووداوانە بگەڕێننەوە بۆ دەستە نادیار و شاراوەکان کە لە خزمەت ئەجێندای دەرەکیدان و لەم ڕووە خۆیان بە بەرپرسیار نەزانن، بەڵکوو هۆکاری هەموو گیروگرفت و کێشە و نەهامەتی خۆیان بدەنە پاڵ بێگانەکان و هەموو کەم وکورتی و شکستە سیاسییەکانیشیان بخەنە ئەستۆی بێگانەکان یاخود پیاوە بەکرێگیراوە ناوخۆییەکانیان. لەم هەلومەرجەشدایە کە تۆمەتی خیانەت و پیاوی بێگانە و بە خائین ناسینی ئەوانی تر دەبێتە بەشێك لە کولتووری سیاسی کۆمەڵگە کە دەرئەنجامەکەشی لە ناوچوونی متمانەی کۆمەڵایەتی و سیاسییە (زیباکلام، ١٣٧٨: ص٣٠ـ٢٩).

مێژوونوسێك بە ناوی گراهام فولێر، لە کتێبی خۆیدا بە ناوی (قیبلەی جیهان: جیۆپۆلەتیکی ئێران)، دەڵێت: ((کاتێك کە کولتووری دوژمنێکی بێگانە و هێزە سەربازییەکانی بە سەر نەتەوەیەکدا دەسەپێت، ئەوە گۆڕانکاری گەورە لە کولتووری سیاسی ئەو نەتەوەییە ڕوودەدات و ئەوەش لە ئێراندا وایکردووە کە

هزری ئێرانییەكان ئاراستەی بەرەو پیلانگێری هەبێت و ئەم كولتووره سیاسییە وابكات ئێرانییەكان دەربارەی ڕۆڵی بێگانەكان لە كولتوور و سیاسەتی خۆیان زۆر هەستیار بن و لە ئەنجامدا ڕەشبینبن.)) (فولر، ١٣٧٣: ص٢٣). ئەم ڕابــردووە مێژووییەی ئێران و ئۆستوورە و ئەفسانە مێژوویەكانی ئێرانی و هەروەها بیروباوەڕی دووانەیی وەكو: خێر و شەڕ، ئێران و توران، ئەهریمەن و ئەهۆرامەزدا و...هتد، بە گشتی كولتووری سیاسی لە ئێران وایكردووە كە نوخبە سیاسییەكان و خەڵكی ئاسایی بكەونە ژێر كاریگەری كولتووری پیلانگێری یان بە واتایەكی تــر تیۆری پیلانگێری كە لە دەرئەنجامدا، تــرس لە بێگانە و دژایەتی بێگانەكان تا ڕادەی نەفرەت، بێزاری، دژایەتی و دوژمنایەتی كردن لەگەڵ بێگانەكان و وڵاتانی تــر پەرەبسێنێت (صادقی، ١٣٨٨: ص١٥٨).

ئەم كولتووره سیاسییە وتــرس لە بێگانە وكاریگەری تیۆری پیلانگێری وایكردووە، كە كولتووری سیاسی بە گشتی ڕەهاگەرا یان ڕەهائەندێش بێت، بەم مانایە كە جیهان بە سەر خۆیی و بێگانە یاخود ئێمەی باش و ئەوانی تــری خراپ، دابەشدەبێت و بە هۆی ئەوەی كە كولتوورەكە گشتگەرایە، هێژمۆن خوازە و لە ئاكامدا بڕوای بە خۆی وەك چاكەی ڕەها و سەروو ڕاستییەكان و سەروو حیكایەتەكان هەیە و بۆیەشە ڕەخنە قبوڵ ناكات و ڕاستییەكان وەك ئەوەی كە خۆی دەیەوێت قبوڵی دەكات یان دەبینێت و ئەم ڕەهائەندێشی و ڕەهاگەراییە لەگەڵ واقعگەرایی ناتەبایە (تاجیك، ١٣٧٧: ص٥). لە لایەكی تــرەوە ئەم كلتووره سیاسییە و جۆری ئەم ڕوانینە بۆ (خود) و (ئەویتــر)، ئەم ڕەهاگەراییەش، دەرهاویشتەی تــری هەبووە كە وایكردووە تێڕوانینی ئێرانییەكان بۆ جیهانی دەرەوە و ڕۆژئاوا یان كولتووری ڕۆژئاوایی بە تەواوی دژایەتی و ڕەتكردنەوە بێت بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بە نووسەر و ڕووناكبیرانی ئێرانی بكەین كە لە بەرهەمەكانیاندا ڕۆژئاوا ڕەتدەكەنەوە بۆ نموونە: احمد فردید، جلال

ێل احمد، علی شریعتی، داریوش شایگان و...هتد، کە ئەزموونی مۆدێرنیتەی ڕۆژئاوای و لە ئاکامدا شێوەی ژیان و هەموو دەرهاویشتە سیاسی، کۆمەڵایەتی، کولتووری و ئابووریەکانی ڕەتدەکەنەوە (میرسپاسی، ١٣٨٦: ص٥٤).

ئەم کولتوورە سیاسییە لە لایەك و لە لایەکی تـرەوە، پێکهاتە و بنەماکانی هزری شۆڕشی ئیسلامی ئێران وایانکردوە کە ئەو شتەی کە ئاڕاستەی ڕەفتاری سیاسی ئێرانییەکان و نوخبەکانی بڕیار وەرگری وڵات و بنەماکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران دەکات، دەرهاویشتەی ئەم تێڕوانینە بێت کە ژیان خەباتە لە نێوان خێر و شەڕ یاخود چاکە و خراپە، هەروەها یەکسان کردنی نەیار و دوژمنانی دەرەکی بە دێو، شەیتان و شەڕ لەم ڕووەوە، چەمکی (شەیتانی گەورە) کە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە کاردێت، دەگەڕێتەوە بۆ بنەمایەك کە لە یادەوەری مێژوویی و بیرەوەری بەکۆمەڵی ئێرانییەکاندا ڕیشەی هەیە، لەم پێکهاتە هزریەدا دژایەتی و خەبات و بەربەرەکانی لەگەڵ ئێمپریالیزم لە لایەك و خەبات و جەنگ دژی شەیتان و دێو و تاریکی و ئەهریمەن لە لایەکی تـرەوە، لەگەڵ ناوەڕۆك و چەمکەکانی کولتووری و کۆمەڵایەتی و مێژوویی ئێران و چەمکە ئایینییەکانی شیعە هاوتەریب و پەیوەندی هەبێت و ئەمەش وایکردوە کە دروشم و سیاسەتەکانی دامەزراندنی حکومەتی موستەزعەفەکانی جیهان و هەستانەوەی هەموو موسوڵمانان و لەناوبـردنی هەموو سەرمایەداران و ئێمپریالیزمی جیهانی، تـرس و دڵەڕاوکێیەکانی ئێرانییەکان دوور بکاتەوە و جیهانی دەرەوە وا پێناسە بکات، کە پیلانێکی گەورە و هەمەلایەنە لە ئارادایە، کە لە هەوڵی لەناوبـردنی ئەم حکومەتە ئیسلامییەیە و لەم ڕووەوە، هەر دژایەتیێکی کۆماری ئیسلامی وا تەفسیر دەکرێت کە بەشداریە لەو پیلانە گشتی و هەمەلایەنە جیهانییە، بەم مانایە کە زەینییەتی بێگانەبوونی (ئەمریکا ـ ڕۆژئاوا)، لە لایەن ئێرانییەکانەوە دەگۆڕدرێت بۆ بابەتی تـرس و دڵەڕاوکێ و لە

كۆتاییدا مرۆڤی ئێرانی دەبێت لە نێوان ئەو دوو بەرەیەی چاكە و خراپە، ڕووناكی و تاریكی، ئەهریمەن و خوا، یەكێكیان هەڵبژێرێت، كە بێگومان بەرەی ڕووناكی و چاكە و خوا هەڵدەبژێرێت، كە بەرەی ئێرانییەكانە (صادقی، ١٣٨٨: ص١٦٧).

### (٣-٢-٣)- دەوڵەت و نەتەوە :

لە ڕوانگەی نوخبە سیاسییە ئیسلامییەكانی ئێران، دەوڵەت ڕەهەندێكی سەروو نەتەوەی هەیە و ڕەوایەتی خۆی لە خواوە وەردەگرێت و ئەمەش بەم مانایەیە كە سەروەری نەتەوەیی و سەروەری ئیلاهی پێكەوە كۆدەكرێتەوە. سەروەری كە لە لایەن خواوەندەوەیە لە ڕێگەی ئیمامەكانی شیعەوە دەدرێتە وەلی فەقیە و لێرەوە ئیسلام (تەشەیوع) ڕەگەزی بنەڕەتی پێكهێنەری ناسنامەی كۆماری ئیسلامی ئێرانە و نەتەوەگەرایی لاواز دەبێت. بەم پێیەش ئێران بەشێكە لە ئۆمەتی گەورەی ئیسلام و سیاسەتی دەرەوە دەبێت هەوڵ بدات كە بەرژەوەندییەكان لە سەر بنەماكانی ئیسلام پێناسە بكات و دابـڕێژێت، هەروەها دەوڵەت دەبێت ئەرك و بەرپرسیارەتی ئیسلامی و سەروو نەتەوەیی خۆی بەجێبگەیەنێت (فرزانە پور، ١٣٨٨: ص١٢٩). دوو نووسەر بە ناوەكانی مایكل بارێنت و شبلی تێلهامی، بڕوایان وایە كە ناسنامەی دروستكراوی پاش شۆڕشی ئیسلامی لە سەر بنەمای ناسیونالیزمی مێژوویی ئێرانی و ئیسلامی سیاسی - شیعی و دژایەتی ئیمپریالیزم، سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران ئاڕاستە دەكات و ڕەوایەتی پێدەدات و دەڵێن سەردەمانێك یان لە قۆناغێك كە ڕەگەزی ناسیونالیزم زاڵ بوو، ئەوە سیاسەتی هێرشبەرانە و بەرفراوانخوازی نفووزی ناسیونالیزمی ئێرانی لە سیاسەتی دەرەوەدا ئەولەویەتی هەبوو بەڵام ڕەگەزی ناسنامە پێدەری ئیسلامی سیاسی بووە هۆی ئەولەویەتی جیهانی ئیسلام لە سیاسەتی دەرەوەی ئێراندا (بارنت و تلهامی، ١٣٨٣: ص١٩-١٧). كۆماری

ئیسلامی ئێران بۆ چەمکی دەوڵەت و نەتەوە و سەروەری پێناسە و تێگەیشتنی تایبەتی خۆیان هەیە کە لێرەدا باسیان لێوە دەکەین.

### (٣-٢-٣-١)- سروشتی دەوڵەت و نەتەوە:

دەوڵەتی نەتەوەیی لە گوتاری ئیسلامگەرای کۆماری ئیسلامی ئێراندا، لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی ـ شیعی دا پێناسە دەکرێت. لە سەر بنەمای تیۆری سیاسی شیعە، دەوڵەتی هەرێمی و نەتەوەیی ڕەسەنایەتی شەرعی نییە، چونکە ئەو سنوورانەی ئێستا کە موسوڵمانان دابەشدەکات، ڕەوا نین، هەروەها دەوڵەتی نەتەوەیی نەتەوە لە خۆ دەگرێت، کە لە ئیسلامدا ڕەسەنایەتی نییە. کۆمەڵگەی سیاسی ڕەوا لە ئیسلامدا ئۆمەتە و ئۆمەتی ئیسلامی بەمانای کۆمەڵێك موسوڵمان کە لە ڕێگەی ئایین و بڕوای هاوبەشەوەوە لە جێگەی نەتەوە کۆمەڵگەیەکی هاوبەش پێکدێنن و دەوڵەتی ئیسلامیش بەرپرسیارە کە زەمینە و ئیمکاناتی پێویست بۆ هاووڵاتیانی ئۆمەتی ئیسلامی بۆ گەیشتن بە ئامانجە پیرۆزەکانیان دەستەبەر بکات. بە پێچەوانەی دەوڵەت — نەتەوە، کە ئایدۆلۆژیای ناسیۆنالیزم ژێرخانەکەی پێکدێنێت، بە بڕوای کۆماری ئیسلامی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بنەمای ئایدۆلۆژیای ئیسلامی ـ شیعی ئەوە پێکدێنێت (دهقانی، ١٣٨٤: ص٦٣ـ٦٢). بە گشتی دەوڵەت لەم ڕوانگەیەدا، سەرچاوەیەکی ئیلاهی و ئایینی هەیە. لەم سۆنگەیەوە بنەمای پاراستنی دارولئیسلام و پاراستنی سیستەمی ئیسلامی لە سەر بنەماکانی فیقهی شیعیەوە بە (اوجب الواجبات) دادەندرێت، واتا ئەرکێکە کە لە سەرەوەی هەموو ئەرکەکانەوەیە، کە ئەمەش دەبێتە گرنگترین و بنەڕەتیترین بنەمای سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران کە لە تیۆرییەکانی پەیوەندی نێونەتەوەیی بە مانای پاراستن ومانەوەی دەوڵەت لە سەر بنەمای دەوڵەت ـ نەتەوەدا خراوەتە ڕوو، بەڵام لە ڕوانگەی

فیقهی ئیسلامی ـ شیعی، جوگرافیای سنووری بڕوایی و ئایدۆلۆژیایی ئەم سنوورە دیاریدەکات (سید نژاد، ١٣٨٩: ص٨). خالێکی جێگەی سەرنج ئەوەیە کە سەرەڕای ئەوەی کە دەستور لە مادەی (١٥٤)دا جەخت لە سەر دەستێوەرنەدان لە کاروباری نەتەوەکانی تـر دەکات، بەڵام ئایدۆلۆژیای ئیسلامی ـ شۆڕشگێرانەی کۆماری ئیسلامی لە دەستوردا باس لە دەوڵەت یان دەوڵەتانی ئیسلامی ناکات و لە جێگەی ئەوەوە باس لە نەتەوەکانی ئیسلامی لە مادەی(١١)، هەموو موسوڵمانان لە مادەی(٣) و موستەزعەفانی جیهان لە مادەی(٣) دا دەکات، کەئەمەش بەم مانایە دێت کە لە داروئیسلامدا زیاتـر لە دەوڵەتێك ڕەوایەتی نییە و بەکارهێنانی چەمکی دەوڵەت، تەنیا وڵاتانی نائیسلامی و ڕۆژئاوایی دەگرێتەوە (فاضلی، ١٣٩١: ص٢٠).

بەڵێنەکانی دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران بە نەتەوەکان بۆتە هۆی دروستبوونی کێشە و گرفت لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ دەوڵەتانی تـر و ئەم پاڵپشتی و پشتیوانییە لە بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکان، ئاڕاستەیەکی دژە دەوڵەت و دژە سیستەمی وەرگرتووە و دەوڵەتانی موسوڵمان یان ناموسوڵمان سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران بە دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆیی خۆیان و پێشێلکردنی سەروەری و بنەماکانی یاسای نێونەتەوەیی دەزانن، هەروەك بەردەوام لە وڵاتانی یەمەن، ئازەربایجان، کویت، بەحرین، عێراق، لوبنان و...هتد، بینراوە، بەڵام کۆماری ئیسلامی ئێران ئەم پاڵپشتیە، بە دادپەروەریخوازی، مرۆڤدۆستی و بە پێی بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامی دەزانێت، هەروەك لە مادەی (١٥٤)ی دەستوردا هاتووە یاخود ئۆمەت تەوەری کە لە مادەی (١١) دا هاتووە و بە گشتی ئایدیای جیهانگەرایی کۆماری ئیسلامی لە پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی دەوڵەت ـ نەتەوە تەوەردا، کێشە و گیروگرفت دروستدەکات (فاضلی، ١٣٩١: ص٢٢). لە بڕگەی شازدە لە مادەی

(٣)ی دەستوری کۆماری ئیسلامیدا ئەرکی دەوڵەتی ئیسلامی وا پێناسە دەکات: (( ڕێکخستنی سیاسەتی دەرەکی وڵات لە سەر بنەمای پێوەرەکانی ئیسلام، بەرپرسیاریەتی بـرایانە بەرامبەر بە هەموو موسوڵمانان و پاڵپشتی بێوچان لە بەشخوراوانی جیهان)). هەروەها لە مادەی (١٥٤)دا بەڵێنی پاڵپشتیکرن لە نەتەوە بێبەشەکان دراوە: ((کۆماری ئیسلامی ئێران بەختەوەری مرۆڤ لە هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بە ئامانجی خۆی دەزانێت و سەربەخۆیی و ئازادی حکومەتی ڕاستی و داد بە مافی هەموو خەڵکی جیهان دەزانێت)). بە گشتی ئامانجە سەروو نەتەوەییەکان لە دەستوری کۆماری ئیسلامی لە مادەکانی (٣، ١١، ١٥٢، ١٥٣، ١٥٤) دا هاتووە کە بەرگری لە مافەکانی هەموو موسوڵمانانی جیهان، پاڵپشتی و پشتیوانی لە موستەزعەفانی جیهان و یەکێتی سیاسی، ئابووری و کولتووری جیهانی ئیسلام لە خۆ دەگرێت (نبوی، ١٣٩١: ص٣٦). یەکێك لە سەرەکیتـرین پێوەرەکانی ناسنامەیی کۆماری ئیسلامی کە لە کولتووری ئیسلامی ـ شیعیەوە سەرچاوە دەگرێت، هەوڵدانە بۆ یەکگرتوویی ئۆمەتی ئیسلامی و بیناکردنی حکومەتی ئیسلامی لە سەر بنەمای فیقهیی شیعی- ئیسلامی و لەم ڕوانگەیەشەوە سیستەمی نێونەتەوەیی لە یەکە نەتەوەییەکان پێکنەهاتووە، بەڵکوو لە دوو بەرەی دارالاسلام و دارالحرب پێکدێت و لە سەر ئەم بنەمایە بە پێچەوانەی ڕوانگە ڕۆژئاوایی، چەمکی (ئومەت) لە بەرامبەر چەمکی (نەتەوە) دا، ڕەسەنایەتی و ئەولەویەتی هەیە و پاراستنیشی ئەرکی هەر موسوڵمانێکە و بنەمای پێکهێنانی ئەم ئۆمەتەش لە جێگەی پەیوەستبوون بە هەرێم و خاکەوە، لە ئیماندارەکان و خاوەن بیروبڕوا هاوبەشەکانەوە پێکدێت (کیانی، ١٣٨٦: ص٦٧).

## (٣-٢-٣-٢)- بنەماكانی سەروەری و حكومەت لە كۆماری ئیسلامی :

سەروەری ئیسلامی بە مانای سەروەری بۆ خودا و شەریعەتی ئیسلامە، كە لە سەردەمی ئیمامەكانی شیعەدا لە ڕێگەی ئەوانەوە و لە كاتی غیابی دووازدەمین ئیمامدا لە ڕێگەی فەقیهەوە وەك نوێنەری ئیمام، شەریعەتی ئیسلامی جێبەجێ دەكرێت. ئەم ئەركەی جێبەجێ كردنی شەریعەت لە كاتی غیابی دووازدەمین ئیمامەوە لە چوارچێوەی حكومەتی ئیسلامیدا لە سەر شانی فەقیهەكانی دادپەروەردایە كە گوێڕایەڵی بۆ فەرمانەكانیان ئەركێكی ئایینییە، چونكە لە لایەن خواوە دەستنیشان و دانراون بەڵام لە ڕێگەی ئیمامەكانەوە پێیاندەدرێت، بۆ ئەوەی خەڵك بیانناسێتەوە ئەوە لە ڕێگەی شارەزایانەوە بە خەڵك دەناسرێن (نادری قمی، ١٣٨٠: ص١٣٥). زانایەكی ئایینی ئێران بە ناوی ئایەتوڵڵا (مطهری)، لە جیاوازیدانان نێوان كۆمارەكانی تری مۆدێرن لە ڕۆژئاوا لەگەڵ كۆماری ئیسلامی ئێران بڕوای وایە كە ئەوان لە ڕۆژئاوا و دواتر وڵاتانی تر مافی خەڵكیان لە جێگەی مافی خوا یاخود دەنگی خەڵك لە جێگەی دەنگی ئایین داناوە. بە بڕوای ناوبراو كۆماری ئیسلامی ئێران جیاوازی لەگەڵ فۆرمە ئایینییەكەی حكومەت لە سەردەمی سەدەكانی ناوەڕاست و سەدەی مۆدێرنی كۆماریخوازی لە ئەورووپادا هەیە، چونكە بە بڕوای ناوبراو لە ئیسلامدا (حق الله) لە جێگەی (حق الناس) و بە پێچەوانەوە نییە، بەڵكوو مافی خەڵك سەرچاوەكەی لە سەروەری خوایە و خواش خۆی ئەمەی دیاریكردووە و ئەمە یاسای نەگۆڕی خوایە (جاوید، ١٣٨٥: ص٧٥). هەروەها ئایەتوڵڵا (مصباح یزدی) یەكێك لە گرنگترین تیۆریسییەن و ئیدۆلۆگەكانی بنەماخوازی كۆماری ئیسلامی دەڵێت: ((حكومەتی ئیسلامی، حكومەتێكی ئیلاهیە و نەك حكومەتی گەل و نەتەوە بە مانای دێموكراتیكەكان و تەنانەت بابەتەكانی وەكو شورا و بەیعەت، نە یاسا

دەکات بە یاسا و نە ڕەوایەتی دەدات بە حکومەت، بەڵکوو ئەوە خوای گەورەیە کە بەها و ڕەوایەتی دەدات بە یاساکان و حکومەت)) (منصورنژاد، ١٣٨٢: ص٢٧٢). هەروەها ئایەتوڵڵا خومەینی دەڵێت: ((من لە دەوڵەتان دڵسارد و نائومێدم، بەڵام دەربارەی نەتەوەکان بەم شێوەیە نییە، بۆ نموونە نەتەوەی میسر لە ئەنوەر سادات جیایە و نەتەوەکانی تریش هەروا و...هتد.)) (خمینی، ١٣٦٣: ص٢٣٠). دەتوانین بڵێین کۆماری ئیسلامی ئێران دەوڵەتێکی ئایینی بە ناسنامەی ئیسلامییە کە لە هەرێمێکدا بە ناوی ئێران دروستبووە و مەزهەبی شیعەی دووازدە ئیمامی و ئیسلام گرنگترین ڕەگەزی پێکهێنەری سیستەمی سیاسی ئەم کۆمارەیە کە ڕەوایەتی لێوەردەگرێت و ئەرکی دەوڵەتی ئیسلامی پاراستنی ئیسلام و مەزهەبەکەی و پابەندبوونە بە جێبەجێ کردنی ئایدیا و بەهابالاکانی، کە وابوو دەوڵەتی ئیسلامی سروشتێکی سەروو نەتەوەیی هەیە کە بە شێوەی کاتی لە بنکەی هەرێمی و نەتەوەیی ئێران، بە مەبەستی دروستکردنی سیستەمی ویستراوی ئیسلامی و کۆمەڵگەی جیهانی ئیسلام، سوود وەردەگرێت لەم ڕووەوە، پاراستنی ئەم دەوڵەت و کیانە، هەروەها ئاسایش و مانەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران وەك پێشەکی و پێویستی هاتنەدیی ئەم دۆخە ویستراوە واجبە، لەم ڕوانگەیەوە ئەرکەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران کە بەرژەوەندی سەروو نەتەوەیی(ئۆمەتی ئیسلامی) و بەرژەوەندی ئیسلامە، لە ڕێگەی ئامانج و بەرژەوەندی کۆماری ئیسلامی ئێران لە چوارچێوەی سیاسەتی دەرەوەدا دێتەدیی (دهقاني فيروز آبادي، ١٣٨٦: ص٧٥). ئایەتوڵڵا خومەینی، بڕوای بە گەردوونی بوونی ئایینی ئیسلام و مەزهەبی جەعفەری دووازدە ئیمامی و هەناردە کردنی بۆ هەموو جیهان هەبوو و بە وتەی خومەینی ئیسلام تەنیا بۆ وڵاتێك یان چەند وڵاتێك یان تەنانەت بۆ موسوڵمانەکان نییە، بەڵکو ئیسلام بۆ هەموو مرۆڤایەتی هاتووە و ئیسلام دەیەوێت هەموو مرۆڤایەتی بخاتە ژێر سێبەری دادپەروەری

خۆی. لە ئەنجامدا، ئەم تێگەیشتنە لە ئامانجی سیستەمی جیهانی ئیسلامی وادەكات ئێران وەك تەنیا كۆمارێكی ئیسلامی- شیعی لە ژێر حكومەتی وەلی فەقیە هەوڵ بدات، شۆڕشی خۆی هەناردەی هەموو جیهان بكات. هەرچەندە لە سەر چۆنیەتی و شێوازی هەناردە كردنی شۆڕش لە نێوان تیۆریسینەكانی شۆڕشی ئیسلامی ناكۆكی هەیە، بەڵام لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیای شۆڕشگێرانەی ئیسلامی-شیعی بە هۆی هەبوونی شرۆڤەی هزری تایبەت ناتوانێت لە سنووری تەسكی خۆیدا بمێنێتەوە و بە ناچار دەبێت بەرەو دروستكردنی پەیوەندی لەگەڵ لایەنەكانی تـر بڕوات. ئەمەش وادەكات لە پەیوەندییە دەرەكییەكانیدا، دەوڵەتی ئیسلامی بەدواداچوون بۆ ریزێك لە ئامانجەكان بكات كە خاڵی ناوەندی یان ئامانجی كۆتاییان هەوڵدانە بۆ بەرپاكردنی حكومەتی تاقانەی جیهانی و ئامانجەكانی تـر لە خزمەت ئەم ئامانجە كۆتاییەدان، كە گرنگی هەمیشەیی و كۆتاییان نییە، هەروەها پێكهاتەی ئایدۆلۆژیكی دەوڵەتی ئیسلامی و بابەتی پاڵپشتیكردن لە زوڵملێكراو و بێوارەكان و خەبات دژی زۆرداران دەكاتە بەرنامەی كاری خۆی و بۆ ئەم مەبەستەش چەند ئایەتێكی قورئانی پیرۆز دەكاتە بنەمای ئەم بیرۆكەیە (رمضانی، ١٣٨٠: ص ٤٦٠).

بە پێی مادەی یازدە لە دەستوری كۆماری ئیسلامی ئێران، ئەركی دەوڵەتی كۆماری ئیسلامی، یەكگرتنی ئیسلام و دروستكردنی حكومەتێكی یەكگرتووی ئیسلامییە: ((بەحوكمی ئایەی (ان هژە امتكم امە واحدە و انا ربكم فاعبدون) هەموو موسوڵمانان یەك ئۆمەتی یەكگرتوون و دەبێت دەوڵەتی كۆماری ئیسلامی ئێران سیاسەتی گشتی خۆی لە سەر بنەمای هاوكاری و هاوپەیمانی نەتەوەكانی ئیسلام دابنێت و هەوڵ بدات تا یەكگرتوویی سیاسی و ئابووری و كولتووری جیهانی ئیسلام سەربگرێت)). (دەستوری كۆماری ئیسلامی ئێران، هەمواركراوی ساڵی ١٩٨٩). لەم ڕوانگەیەوە حكومەتی ئیسلامی لە پەیوەندییە

دەرەکییەکانیدا سروشت و تایبەتمەندی جیهانی و سەروو نەتەوەیی هەیە و بە هۆی ئەوەی کە وادادەندرێت کە ئایینی ئیسلام وەك تەواوترین ئایین و پێغەمبەری ئیسلام وەك دوایین نێردراو بۆ جیهانیان ناسراوە و پەیامەکەی جیهانییە. هەروەها بەرپاکردنی ئایینی خوا و بانگهێشت کردنی خەڵك بۆ بەجێگەیاندنی بڕیارەکانی ئیلاهی و بڵاوکردنەوەی فەرمانەکانی ئیلاهی کە لە لایەن ئیمامەکانی شیعە و پێغەمبەرەوە گرنگی پێدراوە، لە خۆ دەگرێت. هەروەها لەدەستووردا هاتووە کە پەیامی دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران ئەوەیە کە هەلومەرجی بڕوایی بزوتنەوەکان بەدیبێنێت و هەلومەرجێك بخولقێنێت کە تیایدا مرۆڤەکان لە ڕێگەی بەها باڵا و گەردوونییەکانی ئیسلامی-شیعی پەروەردە بکرێن و لەگەڵ بزوتنەوە ئیسلامی و جەماوەریەکان بۆ پێکهێنانی ئۆمەتی یەکگرتووی جیهانی پەیوەندی ساز بکات (ستودە، ١٣٨٦: ص٩٦). بەم مانایە کە ئایدیای دەوڵەتی تاقانە و یەکگرتووی جیهانی ئیسلامی وەك بەرپرسیاریەتییەك لە ئەستۆی کۆماری ئیسلامی ئێراندا دەبێت.

### (٣ ـ ٢ـ ٤) ئایینی ئیسلام و مەزهەبی شیعەی دووازدە ئیمامی:

ئایینی ئیسلام و مەزهەبی شیعە یەکێکە لە گرنگترین ڕەگەزەکانی ئاراستەکەری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، کولتووری ئیسلامی بە شێوەی گشتی وچوارچێوەی فیقهیی بە تایبەتی، وەکو کۆمەڵە ڕەگەزێکی مەعریفی و لە هەمان کاتدا بەهادانەرانە و پێوەری یان نۆرمی لە سەر درك و تێگەیشتنی ئێرانییەکان لە هەمبەر دیاردەکانی دەرەکی کاریگەری دادەنێت (مصفا، ١٣٨٥: ص٢٢). زانای ئایینی شیعە ئایەتۆڵڵا (شریعتمدارجزایری) وا فیقهیی سیاسی شیعە شیدەکاتەوە، کە بریتییە لە کۆمەڵێك ڕێسا و بنەمای ئایینی و یاسایی کە سەرچاوە لە بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامی وەردەگرێت کە

ئەرکی رێکخستنی پەیوەندی نێوان موسوڵمانان لەگەڵ خۆیان و لەگەڵ نەتەوە ناموسوڵمانەکانە، واتا پەیوەندییە نێوئۆمەتی و دەرەوەی ئۆمەتی کۆمەڵگەی ئیسلامی رێکدەخات (آیت الله جزایری، ١٣٧٩: ص٢).

ئەم پەیوەندییەی ئێرانییەکان بە ئایینی ئیسلام لە پاش موسوڵمان بوونیان، لە سەردەمی حوکمرانی سەفەویەکان گەیشتە لوتکەی خۆی، هەرچەندە لە سەردەمی مەشروتە لە ساڵی (١٩٠٦)دا لە لایەن روناکبیرە سیکۆلارەکان ڕەخنەی لێگیرا و بە هۆکاری ستەمکاری و گەشەنەسەندنی ئێران ناسرا، بەڵام لە پاش چەند دەیەیەك هەوڵدان بۆ بەهێزبوونی حکومەتێکی سیکۆلار لە ئێران، ئەم پەیوەندییە دووبارە لە شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا لە ساڵی(١٩٧٩) دروستکرایەوە. مادەی چوارەمی دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران لە سەر پێویستی ئیسلامی بوونی هەموو ڕێسا و یاساکان جەخت دەکاتەوە (درخشه، ١٣٨٨: ص٩٢). بە گشتی ئەم ڕەگەزە لە چەند بنەمایەکی هزری پێکدێت کە کاریگەریان لەسەر بنیاتی ناسنامەی کۆماری ئیسلامی و سیاسەتی دەروەی ئەو وڵاتە هەیە کە دەیانخەینەڕوو.

### (٣-٢-٤-١)- بنەمای دادپەروەریخوازی:

دادپەروەریخوازی ڕەگەزێکی تری کولتووری ئایینی ئێرانییەکانە کە ریشەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئیسلام بەتایبەتی بۆ ئایینی زەرتەشتی. دادپەروەری و دادگەری تایبەتمەندی (ئەهورامەزدایە). لە کتێبی مێژوویی ئێرانییەکان (شاهنامەی فیردوسی) دا، قارەمانە ئێرانییەکان هەموو کاتێك دادپەروەربوونە و ئەمە لەگەڵ هاتنی ئیسلام و بە فەرمی ناسینی مەزهەبی شیعە زیاتر تەشەنەی سەند، چونکە یەکێك لە هۆکارەکانی لایەنگری ئێرانییەکان بۆ مەزهەبی شیعە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خوێندنەوەیەی مەزهەبی شیعە بۆ پرسی دادپەروەری و هاوتەریب بوونی لەگەڵ ڕۆحییەی ئێرانییەکان (میرمحمدی، ١٣٨٣: ص٢٣٢). بە

سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی، جارێکی تر پرسی دادپەروەری خوازی بەهێز بووە و نەتەنیا لە سیاسەتی ناوخۆییدا بەڵکوو لە سیاسەتی دەرەوەدا زۆر بە زەقی ڕەنگیدایەوە و بەرجەستەکرا. پشتیوانی وپاڵپشتی لە بێوارەکان و لێقەوماوان(مستضعفین) لە هەمبەر زۆرداران و ستەمکاران (مستکبرین) و پشتیوانیکردن لە بزوتنەوە رزگاریخوازەکان، لە گرنگترین خاڵەکانی ڕەنگدانەوەی ئەم دادپەروەریخوازیەیە کە لە دەستور و ئامانجە باڵاکانی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا بەرجەستە کراوە (مصفا، ١٣٨٥: ص٢٢).

### (٣-٢-٤ -٢)- بنەمای ولایەتی فەقیە:

چەمکی ولایەتی فەقیە، بنچینە و بنەمای حوکمرانی شیعەیە کە بە درێژایی مێژووی شیعە بە شێوەی جۆراوجۆر هەوڵی بەرجەستە کردن و هاتنەدیی دراوە. لە کاتی سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران لە ساڵی(١٩٧٩)دا، ئایەتوڵڵا خومەینی بە خستنە ڕووی تیۆری ئایینی (ولایەتی فەقیە) کە پەیوەندی حکومەت و ئایین لە تەوەرە سەرەکیەکانییەتی و بە پێی ئەم تیۆرە ئایینییە لە سەردەمی غایب بوونی ئیمام مەهدی (ئیمامی دوازدەیەمی شیعەکان)، ئاراستە کردن و ڕێبەرایەتیی کردنی حکومەتی ئیسلامی، تاکووسەردەمی دووبارە گەڕانەوە و بەرپابوونی شۆڕشی جیهانی ئیمام مەهدی لە ئەستۆی ڕێبەرێکی ئایینی کە بە(وەلی فەقیە) ناسراوە دەبێت (موسوی زادە، ١٣٨٧: ص٢١٤). بەم مانایە کە بڕوابوون بە بنەمای ئیمامەت بنچینەی سەرەکی مەزهەبی شیعەی دووازدە ئیمامییە کە بنەمای ولایەتی فەقیە لەسەری ڕاوەستاوە.

**(٣-٤-٢-٣)- بنەمای (تەوەلا و تەبەڕی):**

یەكێك لە ڕەگەزەكانی ئایدولۆژیای ئیسلامی-شیعی كە ڕۆڵی گرنگی لە چییەتی و چۆنیەتی پەیوەندییەكانی دەوڵەتی ئیسلامی (ئێران) لە سیستەمی نێونەتەوەییدا هەیە، بنەمای (تەوەلا و تەبەڕی)یە، لەم ڕوانگەیەوە (تەوەلا) بە مانای دۆستایەتی و بە تایبەت دۆستانی خوایە و دروستكردنی پەیوەندی و ئەولەویەتدانە بە تەعامول لەگەڵیان. (تەبەڕی)یش بە مانای بێزاری و نەفرەت لە دوژمنانی خوا و بەربەرەكانی لەگەڵ كافرەكان. لە سەر ئەم بنەمایە پێوەرێك دروست دەبێت بۆ دابەشكردنی وڵاتانی جیهان لە سیاسەتی دەرەوەدا بۆ شەش گروپی: (برا، بێلایەن، سەركەش) لە گروپی وڵاتانی موسوڵماندا و (دۆست و بێلایەن و دوژمن) لە گروپی وڵاتانی كافردا، پێشكەش دەكات. هەروەها ئەولەویەتی پەیوەندییەكان لە سیاسەتی دەرەوەدا دەستنیشان دەكات، یەكەم پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی جیهانی ئیسلام، پاشان وڵاتە دراوسێیەكان و دواتریش دەوڵەتانی سەروو ناوچەیی كە بە دارولحەرب ناسراوە (موسوی زادە، ١٣٨٧: ص٢١١).

**(٣-٤-٢-٤)- بنەمای بانگەشە كردن (دعوە):**

بنەمای بانگەشەكردن و بانگخوازی، لە گرنگترین بنەماكانی سیاسەتی دەرەوەی حكومەتی ئیسلامییە(شیعییە) كە سروشتی سیاسەتی دەرەوە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە(تەشەیوع) شیدەكاتەوە. بە پێی ئەم ڕوانگەیەوە وا دادەنرێت كە ئەم كارە لە سەر بنەمای پەیام و بەرپرسیارەتی جیهانی ئایینی ئیسلامە وەك ئاخرین ئایین كە لە چوارچێوەی بەختەوەری هەموو مرۆڤەكاندایە و پێویستە بانگەشەی بۆ بكرێت و ئەمە جۆرێكە لە ئەركی سیاسی و ئایینی بۆ حكومەتی ئیسلامی بە مەبەستی سەركەوتنی كۆتایی (قزوینی، ١٣٧٤: ص٦٦). لێرەوە

یەکێك لە بنەماکانی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران کە دەرهاویشتەی سیستەمی هزری ـ ئایینی وئایدۆلۆژیای تایبەتی مەزهەبی نوخبە سیاسییەکانیەتی، بنەمای بانگەشە یان بانگەوازکردن کە لە وتەکانی ڕێبەرانی باڵای کۆماری ئیسلامی ئێران بە پرەنسیپێکی بنەڕەتیی لە سیاسەتی دەرەوەدا ناودەبـردرێت. مەبەستیش لێی بڵاوکردنەوە و گەشەپێدانی هزری ئیسلامی ـ شۆڕشگێرانەیە و بانگەواز بۆ بنەماکانی ئایینی ئیسلام و پەیڕەوکردنی (زارعی، ١٣٩١: ص٩٩). بنەمای بانگەشە کردن بۆ ئیسلام (شیعە)، سروشت و چۆنیەتی جیهاد و هەناردە کردنی شۆڕشیش شیدەکاتەوە. لە لایەکی تـریش قبوڵ نەکردنی نۆرم یان پێوەرەکانی نێونەتەوەیی و سیستەمی جیهانی و هەوڵی دروستکردنی پێوەر و سیستەمێکی نوێی بۆ یەکێتی و یەکگرتوویی جیهانی ئیسلام و ئۆمەتی ئیسلامی، هەروەها بڵاوکردنەوەی کولتووری شەهادەتخوازی و چاوەڕوانی هاتنی رزگارکەر دەدات. لەم ڕوانگەیەوە، ئاشتی و ئاسایش تەنیا لە سەر بنەمای دادپەروەری سەقامگیر و جێگیر دەبێت کە ئەمەش ڕوونادات تەنیا بە سڕینەوەی زوڵم و زۆرداری لە ڕێگەی جیهاد لە پێناو شەریعەتی خوا، ئەمەش لە سیاسەتی پشتیوانیکردنی موستەزعەفان و بزوتنەوە رزگاریخوازەکان لە سیاسەتی دەرەوەدا ڕەنگدەداتەوە (موسوی زادە وجاودانی مقدم، ١٣٨٧: ص٢١٣). لە ڕوانگەی فیقهیی شیعەی دووازدە ئیمامییەوە، لە گرنگتـرین و سەرتاییتـرین ئامانجەکانی حکومەتی ئیسلامی بانگەشە و بانگهێشتکردنی ناموسوڵمانەکانە بۆ ئیسلام و وەك پرسێکی ئایینی و خواپەرەستی چاوی لێدەکرێت و مەبەست ڕاگەیاندنی پەیامی وەحی خوا و دەستورەکانی ئیلاهیە بۆ هەموو خەڵکی جیهان و ڕوون کردنەوەی پێویستی سەروەری و حوکمرانی سیستەمێکی ئایینی-سیاسی تاقانەی ئاسمانییە لە سەر جیهان (غفوری، ١٣٨٧: ص٧٨).

**(٣ـ٢ـ٤ ـ٥)- دارولئیسلام و دارولحەرب:**

لە ڕوانگەی فیقهی ئیسلامی- شیعیەوە دارولئیسلام بە هەرێم یان ناوچەیەك دەگوترێت كە زۆربەی خەڵكی ئەو شوێنە موسوڵمانن و خەریكی جێبەجێ كردنی بنەما و فەرمانەكانی ئیسلامن و یاساكانی شەریعەتی خوا لەم شوێنە جێبەجێ دەكرێت و جۆری پەیوەندییەكان لە دارولئیسلام بە سەر پێنج دەستەدا دابەشدەكرێت:

١ـ موسوڵمانان.

٢ـ لادەران كە دژی حكومەتی ئیسلامی شۆڕشیان كردوە (بغاە).

٣ـ ئەوانەی كە لەئایینی خوا (ئیسلام) وەرگەراونەتەوە یاخود لایانداوە(مرتد).

٤ـ ئەهلی (زمە) یان پەیڕەوانی ئایینە ئاسمانییەكان وەك مەسیحی و یەهودی (اهل كتاب).

٥ـ ئەوانەی كە لە حكومەتی ئیسلامی ئەماننامەیان وەرگرتوە (المستأمنون) (فراتی، ١٣٨٥: ص٤ـ٣).

لەم ڕوانگەیەشەوە دارولحەرب ناوچەیەكە یان دەولەت و هەرێمێكە كە موسوڵمانان كۆنترۆڵیان بە سەرەوە نییە یان لەوێ دەسەلاتیان نییە و حوكمەكانی ئایینی ئیسلام پەیڕەو یان جێبەجێ ناكرێت (فراتی، ١٣٨٥: ص٥). لە ڕووی ئایدۆلۆژیای فیقهی ئیسلامی-شیعیەوە و لە سەر بنەمای دارولئیسلام و دارولحەرب، كۆماری ئیسلامی ئێران دامەزراوە سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتییەكانی تری نێونەتەوەیی نەفی یان ڕەتدەكاتەوە، بڕوای وایە كە ئەو فرەییە (پلۆرالیزم) مۆدیلێكی جاهیلیە و ناكەوێتە خانەی مۆدێلی ئیلاهیەوە چونكە بوونی ململانێ و ناكۆكی سەرچاوەكەی لە فرەییەوە دەزانن و بڕوایان وایە كە ئانارشیك بوونی سیستەمی

نێونەتەوەیی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم فرەییەیە، کە بە پێی ئەم بڕوایە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ فرەیی خواکان (افتخاری، ١٣٨٩: ص ١٩٨).

**(٣-٢-٤ -٦)- بنەمای تەقییە:**

تەقییە لە بنەما بڕوایەکانی فیقهی شیعەیە، واتاکەشی بریتییە لە شاردنەوەی بیروبڕوا و ڕوانگەی خواییە لە دیدی نەیاران لە کاتی پێویستی و هەبوونی مەترسی لە سەر ژیانی ئیمانداران و بۆ مەبەستی پاراستنی ماڵ و گیانیان پەیڕەو دەکرێت. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێگەی لاوازی شیعەکان لە نێو لایەنگرانی تری ئیسلام هەروەها کەمینە بوونیان، بۆیە زانا شیعەکان تەقییە بە کارێکی پێویست لە کاتی تەنگانەدا دەزانن (درخشه، ١٣٨٨: ص٩٨). لە ڕوانگەی زاناکانی شیعەوە تەقییە بریتییە لە هەڵپەساردنی بنەماکانی شەریعەت و جێبەجێ نەکردنی ئەحکامەکانی ئیسلام تا کۆتایی هاتن بە مەترسی و هەڕەشەکان بە مەبەستی چارەسەر کردنی کێشەکان و دوورکردنەوەی مەترسییەکان، هەروەها بۆ بەرژەوەندی ئیماندارانە لە کاتی پێویستی و بۆ پاراستنی ئایینی ئیسلام و بەردەوامبوونی مەزهەبی شیعەیە (عنایت، ١٣٦٥: ص٣٠٢). ئەمەش ئەو دەرفەتە بۆ دەسەڵاتدارانی کۆماری ئیسلامی ئێران دەڕەخسێنێت کە لە کاتی زۆر هەستیاردا بە پێی ئەم بنەمایە بە پاساوی پێویستی پاشەکشە لە هەڵوێست و بڕیار یاخود سیاسەتەکانیان بکەن.

### (٣-٢-٤-٧)- بنەمای شەهادەتخوازی:

پرسی شەهادەت و شەهیدبوون بەشێكی سەرەكی ناسنامەی ئیسلامی- شیعی و شۆڕشگێرانەی مێژووی شیعەیە، كە كاریگەری لە سەر ڕوون كردنەوەی لۆژیكی دادپەروەریخوازی و خەباتگێری شیعە و دژایەتی زوڵم و زۆرداری و نەیارانە و بۆتە بەشێك لە كولتووری ئێرانی ـ شیعی كە پەیوەندی بە بابەتێكی تـری ئیسلامی ـ فیقهیی، واتا جیهاد هەیە (درخشه، ١٣٨٨: ص١٠٩). ئایەتوڵڵا خومەینی[١] لە كتێبەكانیدا و لە وتەكانی دا هەوڵیداوە كە شەهادەت و جیهاد لە ڕێگەی خوا و ئایینی خوا، ببەستێتەوە بە شۆڕشگێری و دژایەتی زوڵم و پێكهێنانی حكومەتی ئیسلامی و بڵاوكردنەوەی شەریعەتی خوا لە جیهان و جێگیر كردنی سیستەمێكی سیاسی و كۆمەڵایەتی ئیسلامی لە جیهاندا، بۆ ساز كردنی زەمینەی دەركەوتنی ئیمامی مەهدی. بە مانایەكی تـر بە پیرۆزكردنی شۆڕش و خەبات و كردەوەی سیاسی لە چوارچێوەی ئاییندا (درخشه، ١٣٨٨: ص١١٥).

### (٣-٢-٤-٨)- ڕۆحیەی بەرخودان و خەباتگێری:

ڕۆحیەی بەرخودان و خەباتگێری كە دەرهاویشتەی ئامۆژگاریە مەزهەبیەكانی شیعەیە، بۆتە پێوەرێكی ناسنامەیی بۆ ئێران. هەر لەسەر ئەم بنەمایەیە كە كۆماری ئیسلامی ئێران هەر جۆرێك لە سازش لە بەرامبەر گوشارەكانی سیستەمی نێونەتەوەیی، لە پرس و بابەتە جیاوازەكاندا ڕەتدەكاتەوە و درێژە بە

---

١ـ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

موسوی خمینی، روح الله (١٣٦١)، **صحیفه نور**، ج : ٥، تهران : انتشارات شركت سهامی چـاپخانه وزارت ارشاد اسلامی.

سیاسەتەکانی خۆی دەدات. چونکە بە پێی ئەم پێوەرە ناسنامەییە، ڕۆحیەی سازش نەکردن و خۆراگری لە بەرامبەر کێشە و گوشار و ئابلۆقە و گرفتەکاندا، بۆ ڕێبەر و دەسەڵاتدارانی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆتە بەهایەك لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا (رسولي ثاني آبادي، ١٣٩٠: ص٩٩).

### (٣-٢-٤-٩)- بنەمای نەفی سەبیل:

بنەمای (نفي السبيل) یان ڕێگەنەدانی کافران، یەکێکی تـرە لە بنەماکانی هزری ئیسلامی- شیعی کە شۆڕ کراوەتەوە بۆ سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، ئەوەش بە مانای ڕێگەگرتن و ڕەتکردنەوەی زاڵبوونی کافران بۆ سەر موسوڵمانەکان دێت، کە لە دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێراندا جەختی لە سەر کراوەتەوە. ئەم بنەمایە وەك مافی ڤیتۆ کار دەکات و لە هەر شوێنێك ڕێککەوتن یان گرێبەستێکی سیاسی یان ئابووری یان سەربازی کراوە، بەڵام لە قۆناغی دواتـردا بە تێگەیشتنی بڕیار وەرگران لە حکومەتی ئێران، بوار بۆ زاڵبوونی کافران لە سەر موسوڵمانان بدات، ئەوە ئەم بنەمایە دێتە ئاراوە و ئەو ڕێککەوتن یان گرێبەستە ڕەتدەکرێتەوە و هەڵدەوەشێندرێتەوە (شکوری، ١٣٦١: ص٣٨٦).

### (٣-٢-٤-١٠)- بنەمای چاوەڕوانی بۆ دەرکەوتن (الأنتظار من أجل الظهور):

ئایدیا و بنەمای چاوەڕوانی بۆ دەرکەوتن و ئاشکرابوونی ئیمامی زەمان (مەهدی)، یەکێکی تـرە لە ڕەگەزەکانی ناسنامەی ئایینی-شیعی کۆماری ئیسلامی ئێران. ئێرانییەکان بە پشتبەستن بە هەندێ گێڕانەوە (روایت) دەربارەی بزوتنەوە و هەستانەوە لە ڕۆژهەڵاتەوە پێش لە دەرکەوتن و ئاشکرابوونی ئیمامی مەهدی، کۆماری ئیسلامی ئێران بە ئەرکی خۆی دەزانێت کە زەمینەی بەدیهاتنی ئەم ئایدیایە فەراهەم و ئامادە بکات (عشقی، ١٣٧٩: ص٦٢). ئەم

گێرانەوانەیە وادەکات ئێرانییەکان تێگەیشتنێکی تایبەتیان هەبێت بۆ پێگەی خۆیان لە جیهان و هەوڵ بدەن بۆ هەناردە کردنی شۆڕش، هەروەها هەوڵدان بۆ دووبارە دارِشتنەوەی سیستەمی نێونەتەوەیی هەنووکەیی و پشتیوانیکردن لە بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکان لە ڕەنگدانەوەکانی بنەما و ئایدیای ئاشکرابوون و دەرکەوتنە لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا (فاضلی نیا، ١٣٨٨: ص٢٩٦). ئایەتوڵڵا خومەینی دەربارەی کۆماری ئیسلامییەوە دەڵێت: ((ئەم حکومەتە، حکومەتی ئیمامی مەهدیە و ئەم بزوتنەوە پیرۆزە بۆ شۆڕشی گەورەی مەهدی بەڵێن پێدراو، بەرپاکراوە)) (جهانگیری و یوسف نیا، ١٣٩١: ص١٤٧).

بە گشتی ئایدیاکانی دادپەروەریگەرایی و چاوەڕوانی رزگارکەر لە بنەما و ڕەگەزەکانی بڕوایی شیعەن و بەشێکن لە ئایدۆلۆژیای سیاسی شیعە و لە هەندێ بواریشدا، لە ڕەتکردنەوی دەسەڵات و هێژمۆنی زلهێزە نێونەتەوەییەکان و سیستەمی نێونەتەوەییدا خۆی دەبینێتەوە. هەروەها ئەو ڕەگەزانەش (دادپەروەریخوازی و چاوەڕوانی بۆ دەرکەوتن) پەیوەندیان لەگەڵ یەکتـریدا هەیە، بە هۆی ئەوەی کە دەبێت هەلومەرج بۆ سەرهەڵدانی رزگارکەر ئامادە بێت و ئەویش دادپەروەری لە هەموو جیهاندا بلاّو دەکاتەوە. ئەمەش لە سەر پێکهاتەی سیاسی و پێوەندی دەرەوەدا هاوکات دوو کاریگەری جیاوازی هەبووە: لە لایەك لە هەلومەرجی نەخوازراودا بۆتە هۆی چاوەڕوانی و دروستبوونی هیوا بە گۆڕانکاری لە بارودۆخی هەنووکەیی و پێداگری لە سەر ناسنامە و گردبوونەوە لە دەوری ڕێبەرێك کە ڕۆڵی رزگاریدەری هەیە و لە لایەکی تـریشەوە ئەم تێڕوانینە تایبەتە بۆ پرسی ئیمامەت، ولایەت و... هتد، سیاسەتی دەرەوە لە ژێر کاریگەری عەقلانییەتی سیاسی دەردێنێت و دەبێتە هۆی بەدامەزراوەیی نەبوونی سیاسەتی دەرەوە، بە هۆی ئەوەی کە پرسی چاوەڕوانی وادەکات کە بە گشتی سیاسەت سەرقاڵی بارودۆخی هەنووکەیی و چارەسەر کردنی پرسەکانی

پەیوەندیدار نەبێت، بەلکوو سیاسەت ڕوو لە بەها باڵاکان و بەدیهاتنیان بکات. هەروەها دەبێتە هۆی دوو حاڵەتی دژ بەیەك: لە لایەك هەوڵدان بۆ ئامادە کردنی هەلومەرجی دەرکەوتن و سەرهەڵدان و دەرکەوتنی رزگارکەر، لە لایەکی تــرەوە لابــردنی بەرپرسیاریەتی لە سەر شانی حکومەت و تاکەکان بۆ گۆڕین یاخود باشتــرکردنی هەلومەرج و دواخستنی چارەسەری گرفت و کێشەکان، بەڵکوو ئەم ئەرکە دەخرێتە سەرشانی رزگارکەر (صادقی، ١٣٨٧، ص٢٦٥).

### (٣-٢-٥)- گوتاری جیهانی سێیەمگەرایی:

گوتاری جیهانی سێیەمگەرایی یەکێکی تــرە لە سەرچاوەکانی ناسنامەسازی لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا، ئەم سیستەمە مانایيە گەوهەرێکی دژە ئیستعماری، دژە ئیمپریالیستی و دژە هێژمۆنگەرایی لە خۆیدا هەڵگرتووە. جیهانی سێیەمگەرایی دژی بارودۆخی هەنووکەیی و سیستەمی سیاسی ـ ئابووری نێونەتەوەییە و لە هەوڵی چاکسازی و هەموارکردنی بارودۆخەکە بە ئاراستەی گەیشتن بە سیستەمی دڵخوازە بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی کۆماری ئیسلامی ئێران و وڵاتانی ناسراو بە جیهانی سێیەم یاخود هەروەکو ئێستاکە لە پاش ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت و بلۆکی ڕۆژهەلات لە ساڵی(١٩٩١) پێی دەگوتــرێت وڵاتانی پەرەنەسەندوو یاخود باشوور. ئەم گوتارە بنەماکان، ڕێساکان، پێوەرەکان و دامەزراوە سەرەکییەکانی سیستەمی نێونەتەوەیی وەکو: دەوڵەت و سەروەریی نەتەوەیی و دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی وڵاتان قبوڵ دەکات، بەڵام بڕوای وایە کە سیستەمی هەنووکەیی نێونەتەوەیی بە تایبەت لە ڕووی ئابوورییەوە دەبێت لە بەرژەوەندیی وڵاتانی جیهانی سێیەم گۆڕانکاری بە سەر دابێت (دهقانی فیروز آبادی، ١٣٨٨: ص١٨٠).

ئەم گوتارە جیهانی سێیەمگەراییە، بەستێن و بواری باشی لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا هەیە، یەکەم: ئێران لە وڵاتانی جیهانی سێیەم یاخود باشوورە کە وەك وڵاتانی تـری جیهانی سێیەم لە پەراوێزی سیستەمی ئابووری نێونەتەوەییدایە. دووەم: هەرچەندە ئێران هیچ کاتێك موستەعمەرە نەبووە بەڵام بە توندی لە ژێر نفووز و دەسەڵاتی زلهێزەکان وەکو رووسیا، بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بووە، ئەمەش هاوشێوەی ئەزموونی وڵاتانی جیهانی سێیەمە. سێیەم: سەرەڕای سەردەمی کۆماری ئیسلامی لە سەردەمەکانی تـریش ڕوانگەی دووبارە دارِشتنەوەی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان و پێداچوونەوە بە سیستەمی زاڵی نێونەتەوەیی لە ئێراندا هەبووە، هزر و تێڕوانینی مێژوویی، کولتووری و ئایینی ئێرانییەکان وایکردووە کە هەمووکات لە پێگەی خۆیان لە جیهان ناڕازی بن، کەئەمەش ڕەنگدانەوەی ئەم سیستەمە هزرییەیە کە لەگەڵ زۆرێك لە بنەما و ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە مەڕ سیستەمی نێونەتەوەیی هاوتەریبە و دەبینرێت (دهقانی فیروز آبادی و نوری،"کتاب"، ١٣٩١: ص٧٠ـ٦٩). سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ ئەم وڵاتانە هەوڵی دروستکردنی متمانە دەدات کە لە سەر بنەمای پابەندبوونە لە هەمبەر دژایەتی زلهێزەکان و هەوڵی پەرەپێدانی هاوکاریەکانی (باشوور - باشوور) بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ وڵاتانی باکوور. بۆ ئەم مەبەستەش لە لایەك لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکە و لە لایەکی تـرەوە لەگەڵ وڵاتانی ئەفریقایی و ئیسلامی لە دەرەوەی ناوچەکە پەیوەندی دروستدەکات. بۆ نموونە ئێران لە ناوخۆی وڵات هەوڵی دروستکردنی هێڵی ئاسن (شەمەندەفەر) دەدات لە نێوان شارەکانی باشوور و باکوور و بەستنەوەیان بە یەکتـری، بۆ ئەوەی کە بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست پەرەپێبدات یاخود بەستنەوەی هێڵی ئاسمانی ئێران لەگەڵ ئەم وڵاتانە یاخود لە ڕووی وزەوە (نەوت و غاز) هاوکاریان

دەکات یاخود هەوڵی لابــردنی بەربەستە گومرگیەکان و دروستکردنی ناوچەی ئازادی بازرگانی و ئاڵوگۆڕی گەشتیار و وەبەرهێنان لەم وڵاتانەدا دەدات، بۆ ئەم مەبەستە کە ئێران بکاتە ناوەندی هێزێکی گرنگی ناوچەیی و ببێتە ناوەندێکی سیاسی و ئابووری (دهشیری، ١٣٨٣: ص٤٣). هەروەها ئێران هەوڵ دەدات بۆ دروستکردن و پێناسەکردنی ناسنامەیەکی نوێ بۆ جیهانی ئیسلام و پێشکەشکردنی دۆکتۆرینی (دیموکراسی ئایینی) بۆ وڵاتانی ئیسلامی و پەرەپێدانی خەباتی بڕوایی و ڕزگاریخوازی لە سەر بنەمای ئیسلام، لە هەمبەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ڕۆژئاوادا هێزێکی کاریگەر دروستبکات، بۆ ئەم مەبەستەش سوود لە بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکان و بنەماکانی هزری جیهاد و دژایەتی ئیستکبار و بلاوکردنەوەی ڕۆحیەی سەربەخۆییخوازی بۆ دژایەتیکردنی ئیسرائیل وەردەگرێت و هەوڵ دەدات کەئەمە لە سەر بنەمای نەتەوەیی و عەرەبی نەبێت، بەڵکوو لە سەر بنەمای ئایدۆلۆژیك و ئایینی بێت، بۆ ئەم مەبەستەش کۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵ دەدات هەموو ڕەگەز و فاکتەرەکان وەکو: بڕوایی، ئایدۆلۆژیایی، ئایینی، جیۆپۆلەتیك و تەنانەت فاکتەری وزە (نەوت و غاز) و...هتد، بەکار بێنێت (دهشیری، ١٣٨٣: ص٤٥).

### (٣-٢-٦)- گوتاری شۆڕشگێرانەی ئیسلامی:

گوتاری شۆڕشی ئیسلامی و دەرهاویشتەکانی، یەکێکی تــر لە سەرچاوەکانی ناسنامەسازیە لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا. لە ڕاستیدا تایبەتمەندی گوتاری شۆڕشگێرانە، ڕەنگدانەوەکەیەتی، کە لە لایەن بکەرە شۆڕشگێرانەکان لە جیهانی دەرەوەدا ڕەنگدەداتەوە و هەر ڕەنگدانەوەی ئەم شۆڕشەیە کە گوتاری سیاسەتی ناوخۆی شۆڕشی ئیسلامی بە گوتاری سیاسەتی دەرەوە گرێدا، بەم مانایە کە سیاسەتی دەرەوە، ڕەنگدانەوەی ئەم گوتارە

شۆڕشگێرانەییە (ادیب زادە، ١٣٨٧: ص١٤٥). ئایەتۆڵڵا خومەینی دەربارەی هەناردە کردنی شۆڕش دەڵێت: ((ئێمە شۆڕش بۆ هەموو جیهان هەناردە دەکەین، بە هۆی ئەوەی کە شۆڕشی ئێمە ئیسلامییە وتا بانگی "لا الە الا اللە" لە هەموو جیهان دەنگ نەداتەوە، خەبات بەردەوامە و تاخەبات بەردەوام بێت ئێمە دژی موستەکبیرەکانین)) (خومەینی، ١٣٨٠: ص٢٦٦). هەروەها ئایەتۆڵڵا خومەینی دەڵێت: (( من بەڕاشکاوی رایدەگەینم کە کۆماری ئیسلامی بە هەموو تواناکانییەوە هەوڵ دەدات ناسنامەی ئیسلامی لە هەموو جیهان دووبارە زیندوو بکاتەوە و بۆ ئەم مەبەستەش کۆماری ئیسلامی لە سەر ئەم پرسە وەبەرهێنان دەکات و کۆماری ئیسلامی بانگەواز بۆ بەدەستهێنانی هێز دەکات و ئێمە دەبێت بۆ کاروباری موسوڵمانان و چەوساوەکانی جیهان خەبات بکەین، ئەمەش دەبێت بە بنەمای سەرەکی سیاسەتی دەرەوەی خۆمان بزانین)). (خومەینی، ١٣٨٠: ص٢٣٨). ئەم فەزا گوتاریە تاڕادەیەك لە ژێر کاریگەری پێگە، زمان و سیستەمی گوتاریی ڕێبەرانی شۆڕش، بە تایبەت ئایەتۆڵڵا خومەینیدا بووە و لەم میانەدا، ڕووداوەکانی دوای شۆڕش و کاردانەوەکانی دەرەکی لە هەمبەر شۆڕش ڕۆڵیان هەبووە بۆ پەرەسەندن و خێراتـربوون یان جێگیربوونی ئەم گوتارە، کە لە کۆتاییدا گوتاری شۆڕشگێرانە ببێتە سەرچاوەی ناسنامەسازی لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، لە نموونەی ڕووداوەکاندا دەتوانین ئاماژە بە گیروگرفت و شەڕ و پێکدادانی ناوخۆیی، جەنگی ئێران و عێراق، ئابلۆقە سیاسی و ئابووریەکان بۆ سەر ئێران و هەوڵدان بۆ کودەتا لە ئێران لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و...هتد، بکەین کەئەمەش وایکردووە کە کۆماری ئیسلامی ئێران سیمایەکی شۆڕشگێرانە بەخۆوە بگرێت. لە لایەکی تـرەوە هەناردە کردنی شۆڕش، سەربەخۆییخوازی لە هەمبەر وڵاتانی زلهێز، هەوڵدان بۆ گۆڕانکاری لە سیستەمی نێونەتەوەیی و پشتیوانی لە بێوارەکان(مستضعفین)، لە

گرنگتــرین سیماکانی کاریگەری و دەرکەوتنی ئەم گوتاری شۆڕشگێرانەیە لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا. ئەم ڕەگەزە لە جۆری پێوەر و بەها ڕەفتاریەکان هەژمار دەکرێت و ریشەی لە سەرچاوەکانی تــری ناسنامەساز وەکو ئیسلام و مەزهەبی شیعە و گوتاری جیهانی سێیەمگەرایی و سەرچاوەکانی نەتەوەیی و مێژووییدا هەیە، کە لە جومکەبەندی گوتاری شۆڕشدا پێگەی بەرزتــر یان بالاّتــریان وەرگرتووە، لە ئەنجامدا، هەولّدان بۆ ئەنجامدانیان دەبێتە هۆی دووبارە بەرهەم هێنانەوەی سەرچاوەکان. لە لایەکی تــریشەوە، دووبارەبوونەوەی ئەم ڕەفتارانە بە درێژایی زەمەن، ئەم ڕەفتارانە دەکاتە بەشێك لە ناسنامەی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران (دهقانی فیروزابادی و نوری، "کتاب"، ١٣٩١: ص١٣٥).

### (٧-٢-٣)- جیۆپۆلەتیکی ئێران:

ناسنامەی هەر نەتەوەییەك و چۆنیەتی دروستبوون و بەردەوامییەکەی بابەتێکە کە لە بواری جیۆپۆلەتیکیشدا خوێندنەوەی بۆ دەکرێت و سیاسەتی دەرەوەی وڵاتێك دەخاتە ژێر کاریگەری خۆی (جعفری ولدانی، ١٣٨٩: ص٤٩). هەستی گرێدراوی ئێرانییەکان بە ژینگەی جوگرافیایی تایبەتی خۆیان و گرنگی و پێویستی ناسینەوەیان بە تایبەتمەندییەکانی ئەو ژینگە جوگرافیاییە تایبەتە، بە بابەتەکانی ناسنامەی نەتەوەیی و سیاسەتی دەرەوە هەژمار دەکرێت (مجتهدزادە، ١٣٧٧: ص١٢٥). ئێران لە ڕوانگەی پێگەی جوگرافیاییەوە خاوەن تایبەتمەندیەکی ناوازەیە، یەکەم: ئەم وڵاتە لە شوێنێکدا هەڵکەوتووە کە سێ کیشوەری ئاسیا، ئەوروپا و ئەفریقا پێکەوە گرێدەدات، دووەم: ئێران لە شوێنێکە کە لە ڕووی ستوونییەوە، باکوور و باشووری گرنگتــرین سەرچاوەکانی وزە(نەوت وغاز) و لە ڕووی ئاسۆییەوە، ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوای بەکارهێنەرانی وزە لە

جیهاندا پێکەوە گرێدەدات. سێیەم: ئێران وەك پردێك ولاَتانی ئاسیای ناوەندی و قەوقاز کە لە وشکاییدا سنووردار کراون دەگەیەنێتە کەنداوی فارس، چوارەم: پێگەی دەریایی ئێران لە دەستپێڕاگەیشتن بە کەنداوی فارس، دەریای عومان و دەریای خەزەر، پێگەیەکی زۆر گرنگە، هەروەها ئێران کۆنترۆڵی گەرووی هۆرمز دەکات کە (٦٠٪) نەوتی ناوچەی گرنگی کەنداو پیایدا تێدەپەڕێت (دهقانی فیروز ئ‌بادی، نوری،"مقاله"، ١٣٩١: ص١٦٠). ئەم جیۆپۆلەتیکە تایبەتە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕەفتار و دروستبوونی ناسنامەیەکی تایبەت بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەییدا. دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی کاریگەری و شوێندانەری ئەم پێکهاتە فەرمی ئایینییە و گرنگتـرین ڕەگەز، فاکتەر و بنەماکانی هزری ناسنامەساز لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، لە خشتەیەکدا پۆلین بکەین و بیانخەینەڕوو:

**پێکهاتە و بنەماکانی هزری وئایدولۆژی ئیسلامی ـ شیعی ورەنگدانەوەی لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران:**

| ڕەگەزو فاکتەرەکان | ڕەنگدانەوەی لە سەر سیاسەتی دەرەوی ئێران |
|---|---|
| پەیوەندی ئایین و سیاسەت | ١ـ رێکخستنی سیاسەتی دەرەوە لە سەر بنەما و پێوەرەکانی ئیسلامی.<br>٢ـ ئاراستەی بەرەو پێداچوونەوەخوازی وەك ستــراتیژی بالاَی سیستەم.<br>٣ـ ئایدولۆژیای ئیسلامی وەك دەستنیشانکەری جۆر و ڕادە و ئاستی پەیوەندی لەگەڵ ولاَتانی تــر لە چوارچێوەی دارولئیسلام و دارالکفر و...هتد.<br>٤ـ قبولّ کردنی ئامانجە سەروو نەتەوەییەکان (ئایدولۆژی و ئایینی) لە سیاسەتی دەرەوەدا.<br>٥ـ بەهێز کردنی ڕۆڵی بکەرانی ئایینی (مەلاکان ) یان بە مانایەکی تــر کۆمەڵگەی مەدەنی ئیسلامی لە سیاسەتی دەرەوەدا، وەکو ڕۆڵی دامەزراوەکانی ئایینی لە ئێران |

| بنەمای نەفی سەبیل و تیۆری پیلانگێری | ١ـ بێ متمانەیی و ڕەتکردنەوەی پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی و پرۆسە و دامەزراوە و ڕێکخراوەکانی پەیوەندیدار.<br>٢ـ زیاتـرکردنی هێز بە ئاراستەی بەربەست دروستکردن لە هەمبەر زاڵبوون ودەستێوەردانی زلهێزەکان و دەوڵەتانی تـر (نفی سبیل).<br>٣ـ ڕەتکردنەوەی ئیستعمار، چەوسانەوە و سیستەمی دەسەڵات و قبوڵی دەسەڵات.<br>٤ـ ڕێگە گرتن لە نفووزی بێگانەکان و تـرس لە بێگانەکان. |
| --- | --- |

| ١ـ دابەشکاری جۆری سیاسەت و پەیوەندییە دەرەکییەکان لەگەڵ وڵاتان و جۆری هەڵسوکەوت لەگەڵیان، بەپێی ئەولەویەتی هاوکاری لەگەڵ موسوڵمانان .<br>٢ـ قبوڵ نەکردنی شێواز و پڕۆسەکانی نێونەتەوەیی و دژایەتی لەگەڵ نۆرم یان پێوەرە نێونەتەوەییەکانی هەنووکەیی.<br>٣ـ پاڵپشتی لە بزوتنەوەکانی رزگاریخواز (موستەزعەفان لە هەمبەر موستەکبرەکان).<br>٤ـ بەرگری لە مافەکانی هەموو موسوڵمانانی جیهان و بەرپرسیاریەتی بەرایانە لە هەمبەر موسوڵمانان.<br>٥ـ یەکێتی و هاوپەیمانی نێوان نەتەوەکانی ئیسلام و یەکێتی جیهانی ئیسلام.<br>٦ـ ئەندێشەی ئۆمەتی یەکگرتووی ئیسلامی و ئامانجە سەروو نەتەوەییەکان لە سیاسەتی دەرەوەدا. | بنەمای (تەوەلا و تەبەڕی) و ئۆمەتی ئیسلامی و جیهانی سێیەمگەرایی |
|---|---|

| بنەمای چاوەڕوانی و شەهادەتخوازی و مێژووی ئێرانی | ١ـ بەهێزبوونی ڕوانگە کاریزماتیکەکان.<br>٢ـ درێژەپێدانی کولتووری کۆنی مێژوویی ئێران.<br>٣ـ زۆرتــربوونی توانای تەیارکردنی کۆمەڵایەتی و زیاتــر کردنی توانای وەڵامدانەوەی سیستەم.<br>٤ـ بەهێزتــر کردنی ڕۆحیەی چاوەڕوانی ئیجابی و چالاك بۆ کاریگەریدانان و ڕۆڵ بینین بە مەبەستی هاتنە دی چاوەروانی. |
|---|---|

| بنەمای بانگەشەکردن بۆ ئیسلام (بانگەواز) و هەناردە کرنی شۆڕش و شۆڕشگێری | ١ـ ڕەتکردنەوەی نۆرم یان پێوەرە نێونەتەوەییەکان و بانگەشە بۆ بونیاتنانی سیستەمێکی تــری دادپەروەرانەی نێونەتەوەیی نوێ.<br>٢ـ هەوڵدان بۆ هەناردە کردنی شۆڕش بە هەردوو ڕوانگەی ڕوونکردنەوە و بڵاوکردنەوەی و هەروەها زیاترکردنی نفووز و ئامانجە سەروو نەتەوەییەکانی دژی سیستەمی نێونەتەوەیی.<br>٣ـ وێنا کردنی کۆمەڵگەی یوتۆپیایی ئیسلامی و بانگەشە کردن بۆی.<br>٤ـ زیاتــربوونی ڕۆڵی دامەزراوەکانی پروپاگەندە و ڕاگەیاندن لە سیاسەتی دەرەوەدا.<br>٥ـ ئەولەویەتدان بە پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتانی شۆڕشگێر و بزوتنەوەکان. |
|---|---|

| بنەمای ولایەتی فەقیە و تەقییە | ١ـ بەدوادا چوون بۆ مۆدێلەکانی دروستکردنی بڕیار وەك (ئەکتەری عەقلانی) بەڵام بە ڕوانگەی لانی زۆری ڕۆڵی ڕێبەری(تاك).<br>٢ـ زیاتر کردن و بەهێزتر کردنی توانای تەیارکردنی کۆمەڵایەتی و جەماوەری بۆ بەردەوامی و سەقامگیری سیاسەتی دەرەوە و بەهێزتر کردنی ڕای گشتی بۆ پاڵپشتی کردن لە سیاسەتەکانی دەرەوە.<br>٣ـ گرنگیدان بە ڕێسای سەرەکی بەرژەوەندی ، پاراستن و مانەوەی سیستەم. |
|---|---|

| بنەمای پاراستنی بەرژەوەندی دەوڵەتی ئیسلامی و جیۆپۆلەتیك | ١ـ توانای تێپەڕاندنی دژیەکی ئایدیالیستی ـ ڕیالیستی لە سیاسەتی دەرەوەدا.<br>٢ـ بەهێزکردنی ڕوانگەی ڕیالیستی و جێبەجێ کردنی بە بێ هەستیاری و دروستکردنی دژایەتی ناوخۆیی.<br>٣ـ قبوڵ کردنی هەندێ لە نۆرم یان پێوەر و بەهاکانی نێونەتەوەیی یاخود دامەزراوە و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان.<br>٤-ڕەنگدانەوی ئەم پێگە جوگرافیاییە لە پەیوەندییەکانی دەرەوە و دەرفەت و بەربەستەکانی. |
|---|---|

## (٤) ـ سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران:

دروستكردنی بڕیاری سیاسەتی دەرەوە لە لایەن بەرپرسانی حكومەت لە ژێر كاریگەری كۆمەڵێك ڕەگەز و فاكتەری جۆراوجۆردایە، وەكو ڕۆڵی تاك، ژینگەی ناوخۆیی (حكومی و كۆمەڵایەتی)، ژینگەی ناوچەیی و نێونەتەوەیی و هەروەها كارلێكی ئەم دوو ئاستە پێكەوە و هەر فاكتەرێكیش دەبێتە هۆی دروستبوونی تێگەیشتن و ژینگەیەكی تایبەت بۆ ئەكتەر یان بكەرەكە، بۆ ئەوەی بڕیارێكی تایبەت بدات. لە كۆماری ئیسلامی ئێرانیشدا، بە گوێرەی جۆری ڕوانینی نوخبەكان و پێكهاتە و بەها و پێوەر یان نۆرمە زاڵەكانی نێونەتەوەیی سیاسەتی دەرەوە ئاڵوگۆڕی بە سەردا هاتووە، هەرچەندە زۆر سنوورداریش بێت، كە ئەویش بە هۆی گوشاری پێكهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی و تێگەیشتنی نوخبە دەسەڵاتدارەكان لە ئیسلام، نەتەوە، بەرژەوەندی نەتەوەیی، شۆڕش، ڕۆژئاوا و...هتد، بووە (آقاحسینی و ببری، ١٣٩٢: ص١١٩). گۆڕانكارییەكانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران، گۆڕانكاری ڕیشەیی و پێكهاتەیی یان گۆڕانكاری لە ئامانجەكان و بەرژەوەندییەكانی ئێران نەبووە، بەڵكوو هەوڵدان بووە بۆ دروستكردنی جۆرە هاوسەنگییەك لە نێوان بەها، پێوەر و بەرژەوەندییەكانی كۆماری ئیسلامی لەگەڵ گۆڕانكارییەكان لە ژینگەی نێونەتەوەیی و ناوچەیی، هەروەها خولقاندنی جۆرە هاوسەنگییەكی نوێ لە ناوخۆ و دەرەوەدا. بۆ نموونە، سیاسەتەكانی حكومەتەكانی ڕەفسەنجانی، خاتەمی، ئەحمەدی نەژاد و ڕۆحانی، كە هەریەكێكیان بە شێوازی تایبەتی خۆی لە سەر بنەمای بەها باڵاكان و

ناسنامەی کۆماری ئیسلامی ئێران، هەوڵی دروستکردنی هاوسەنگییەکی نوێیداوە (فوزی، ١٣٩٠: ص١٩٥). گەری سیك، شارەزا لە بواری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران بڕوای وایە کە گۆڕانکاری لە سیاسەتی دەرەوەی ئێران، خۆگونجاندن بووە لەگەڵ گۆڕانکارییەکان نەك هەڵبژاردنێك بێت لە سیاسەتی دەرەوەدا، بەڵکوو بە هۆی گۆڕانکاریی ناوخۆیی و دەرەکییەکان بووە و کاتێك کۆماری ئیسلامی ئێران سیاسەتی دەرەوەی سەرکەوتووی دەبێت کە چەمکەکانی سیاسی لە سیاسەتی دەرەوەدا وەك خۆی بەکار بێنێت، وەکو: نەتەوە لە جێگەی ئۆمەت، ئامانج و بەرژەوەندی لە جێگەی دروشم و بەها باڵاکان، دۆکتۆرینی سیاسەتی دەرەوە لە جێگەی ئایدۆلۆژیای سیاسی و...هتد (سیك، ١٣٧٥: ص٨٣). لەم بەشەدا تیشك دەخەینە سەر پرس و پەیوەندییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە سیاسەتی دەرەوەدا، هەروەها شیکردنەوە بۆ ڕەفتارەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ئاستی نێونەتەوەیی و ناوچەیی دەکەین.

### (٤ ـ ١)- کۆماری ئیسلامی ئێران و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:

پەیوەندییەکانی کۆماری ئیسلامی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ژێر کاریگەری جیاوازیەکانی زەینی و پێکهاتەیی ناوخۆیی و دەرەکیدا، گیروگرفت و ئاڵۆزی زۆری تێدایە. ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامی ئێران، بوونی ئەمریکایەکی لیبـرال ـ دیموکرات و پێگەی هێژمونیکی ئەمریکا لە سیستەمی نێونەتەوەییدا هەڕەشە بۆ سەر بوون و مانەوەی کۆماری ئیسلامی و وڵاتانی شۆڕشگێر و ئیسلامی دەزانن. چونکە سروشتی پێکهاتەیی و کولتووری کۆماری ئیسلامی و سیستەمی سیاسی ئێران لە ڕوانگەی ئەوانەوە کە لە سەر گەیشتن بە سەرووەری خوا و دەسەڵاتی خوا دامەزراوە بە پێچەوانەی سروشتی پێکهاتەی مرۆڤ تەوەری سیستەمی نێونەتەوەیی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، واتا لە سێ

ئاستی ناوخۆیی، دەرەوە و نێونەتەوەییدا، ململانێ و ناکۆکیان هەیە، بۆ نموونە لە ئاستی نێونەتەوەییدا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هێژمونی هەیە و بە پێی پێوەر و بەها زاڵەکانی خۆی، هەوڵی ڕێکخستنی سیستەمی نێونەتەوەیی دەدات، بەڵام کۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵ دەدات بە یارمەتی وڵاتانی بێلایەن یاخود شۆڕشگێر و بزوتنەوەکان، هەروەها نۆرم یان پێوەری شۆڕشگێرانەی دژی سیستەمە هەنووکەییە، دژی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕاوەستێت (سیف زادە، ١٣٨٩: ص١٤٠).

کولتووری سیاسی تایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و چۆنیەتی ڕوانینیان بۆ جیهان و ڕۆڵی ڕێبەرایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جیهاندا و هەروەها ڕەنگدانەوەی بەهاکانی لیبرالیزم و پراگماتیزم لە سیاسەتی دەرەوەدا و هەروەها جۆرێك لە باوەڕ و بڕوابوون بە پەیام و ئەرکی مێژوویی گەلی ئەمریکا لە جیهان لە هزر و کولتووری گەلی ئەمریکادا، هەموویان ناکۆکن لەگەڵ بنەماکانی هزری، ئایدۆلۆژیای فەرمی، ئامانج ، نۆرم، بەهاکان و ڕوانگەی نوخبە سیاسییەکان لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا (اشتریان، ١٣٨٢: ص٢٩). دەتوانین لێرەدا، پەیوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆماری ئیسلامی ئێران بە ڕوانگەی (بازنەی کارلێکی نەرێنی) شیبکەینەوە، بەم مانایە کە ئەو زەینییەتە نەرێنییە ـ مێژووییەی نێوانیان و هەروەها بارگرژی لە پەیوەندییەکانیاندا، بە هۆی کارلێکی ڕەفتار و ڕووداوە تاڵ و نەرێنییەکانی نێوانیان دروستبووە، بە تایبەت کۆمەڵێك کاری دوژمنکارانە کە لە هەمبەر یەکتریدا کردویانە، بۆ نموونە: پاڵپشتی و یارمەتی ئەمریکا لە کودەتای ساڵی (١٩٥٣) بۆ ڕووخانی حکومەتی موسەدیّق و یارمەتیدانی ڕژێمی شای ئێران کە زۆرینەی خەڵك لێی نارازیبوون و لە ساڵی (١٩٧٩) شۆڕشیان دژی ئەنجامدا، پاشان بە بارمتەگرتنی دیپلۆماتە ئەمریکایەکانی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران

لە ساڵی (١٩٧٩) بۆ ماوەی (٤٤٤) ڕۆژ لە لایەن شۆڕشگێڕە توندڕەوە ئیسلامییەکانەوە. دواتر پاڵپشتی کردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق لە جەنگی هەشت ساڵە لەگەڵ ئێران و هەروەها لە ساڵی (١٩٨٨) خستنەخوارەوەی فرۆکەیەکی نەفەرهەڵگری ئێران و کوژرانی (٢٩٠) هاووڵاتی ئێرانی لە لایەن کەشتی جەنگی ڤێنسێنی ئەمریکیەوە و...هتد، ئەمانەش چووە ناو بیرەوەری مێژووی ئەمریکیەکان و ئێرانییەکان (عطازادە، ١٣٨٧: ص ١١٥).

ڕاگەیاندنی کۆماری ئیسلامی ئێران وەك دەوڵەتێکی میحوەری شەڕ و شەیتانی لە ساڵی (٢٠٠٢)دا، لە لایەن جۆرج بوشەوە و هەروەها ئاشکرابوونی ئەوەی کە کۆماری ئیسلامی ئێران خەریکی چالاکی نهێنی بەرهەمهێنانی وزەی ئەتۆمی یان وەك ڕۆژئاوا بڕوای وایە کە ئێران سەرقاڵی بەدەستهێنانی توانای بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمیە و دواتر دەستپێکردنی مشتومڕ و کێشە لە نێوان ڕۆژئاوا و کۆماری ئیسلامی ئێران دەربارەی بەرنامەی ئەتۆمی لە ساڵی(٢٠٠٢)وە، وایکرد کە پەیوەندییەکانیان بارگرژی و کێشەی زیاتری تێبکەوێت (آبراهامیان، ١٣٨٤: ص٤٢٩). هەروەها لە بەڵگەنامەکانی ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکادا، کۆماری ئیسلامی ئێران بە یەکێك لە گەورەترین دوژمنانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دانراوە. بۆ نموونە لە بەشێك لە ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی (٢٠٠٦)دا دەڵێت: ((ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ مەترسێکی گەورەتر لە کۆماری ئیسلامی ئێران لە جیهاندا ڕووبەڕوو نەبۆتەوە، ئێران بیست ساڵ پرۆگرامی ئەتۆمی خۆی لە کۆمەڵگەی جیهانی شاردۆتەوە، هەروەها ئەمریکا لە بواری تریش نیگەرانی لە هەمبەر ئێراندا هەیە، ئێران پشتیوانی لە تیرۆریزم دەکات و هەڕەشە لە ئیسرائیل دەکات و هەوڵ دەدات پرۆسەی ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست شکست بێنێت و کێشە

بۆ پرۆسەی دێموكراسی عێراق دروستدەكات و خەڵكی خۆی لە ئازادی بێبەش دەكات و تەنیا كاتێك ئەم نیگەرانیانەی نامێنێت كە حكومەتی ئێران سیاسەتەكانی خۆی بگۆڕێت، ئەمە ئامانجی سیاسەتی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكایە)) (احدی، ١٣٨٧: ص١٢٦). بەم پێیەش كۆماری ئیسلامی دەكەوێتە چوارچێوەی ئەوی تری ناسنامەی ئەمریكیەوە و بە پێچەوانەشەوە و بەم هۆیەشەوە بەرژەوەندییەكانیشیان جیاوازە و هەردوو لایەن خۆیان بە(خێر) و ئەویتر بە (شەڕ) دەزانێت. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەكانی مانایی یان واتایی ناسنامەساز. لێرەوە دەتوانین بلێین كە پەیوەندییەكانی كۆماری ئیسلامی ئێران و ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا راستەوخۆ لە ژێر كاریگەری جۆری تێڕوانینی ئێران بۆ ئیسرائیل دایە، كۆماری ئیسلامی ئێران خوازیاری لە ناوچوون یان لە ناو بردنی دەوڵەتی ئیسرائیلە. ئەمەش وادەكات كە پەیوەندی بەهێزی ئیسرائیل و ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، رێگە نەدات كە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا ئەمە لە بەرچاو نەگرێت، بە تایبەت سیاسەتی پارێزگارە نوێیەكان لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا كە هاوتەریبە لەگەڵ سیاسەتەكانی ئیسرائیل و بە ئاشكرا سیاسەتی گۆڕینی رژێمی ئێرانیان كردۆتە ئامانجی خۆیان. لە لایەكی تریشەوە فاكتەری وڵاتانی ناوچەكە كە هاوپەیمانی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكان و مەترسیان لە بەهێزبوونی كۆماری ئیسلامی ئێران هەیە، كاریگەری خۆی هەیە (احدی، ١٣٨٧: ص١٣٦).

بە گشتی كۆماری ئیسلامی ئێران ترس و دڵەڕاوكێی ئاسایشی هەیە لە گۆڕانكاریەكانی ژینگەیی دەوروبەری خۆی، بە تایبەت گۆڕانكاریەكانی ئەم دواییەی ناوچەكە و گوشارەكانی ویلایەتەیەكگرتووەكانی ئەمریكا بۆ سەر كۆماری ئیسلامی ئێران لە ناوچەكە كە بە گشتی بریتیین لە:

١ـ هێرشی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بۆ ئەفغانستان.

٢ـ هێرشی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ عێراق.
٣ـ فراوان کردنی هێزی دەریایی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کەنداو.
٤ـ بەهێزکردنی هاوپەیمانییەتی دژی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ناوچەی قەوقاز و ئاسیای ناوەڕاست.
٥ـ بەهێزکردنی هاوپەیمانییەتی دژی ئێران لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی وڵاتانی عەرەبی.

(مجتهد زادە، ١٣٨٥: ص١٧ـ١٤). لێرەدا دەتوانین ئاماژە بە بنەماکانی هزری دەستنیشانکەری هەڵوێست و ڕەفتاری کۆماری ئیسلامی ئێران لە هەمبەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بکەین.

### (٤ ـ١ـ١)- بنەماکانی هزری دژایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە هەمبەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:

#### (٤ ـ١ـ١ـ١)- دادپەروەریخوازی دژە هێژمۆنی:

لە وتەکانی ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامی ئێران و ڕاگەیاندنی سیاسەتەکانیان لە هەمبەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەوە دەردەکەوێت کە کۆماری ئیسلامی لەسەر پێناسەی دادپەروەری لە ڕوانگەی خۆیانەوە دژایەتی باڵادەستی و هێژمونی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکەن و دادپەروەریخوازی بە بنەمایەکی نەگۆڕی بڕوایی دەزانن. بۆ نموونە ئایەتوڵڵا خومەینی دەڵێت: ((ئێمە لە دژی زۆرداری و ملهوڕی خەبات دەکەین و بەرگری دەکەین، بە تایبەت ئەمریکا کە دەیەوێت ڕێبەرایەتی جیهان بکات و دەستێوەردان لە کاروباری وڵاتاندا بکات. ئێمە دەمانەوێت بنەماکانی قورئان پیادە بکەین، ئێمە بەرگری لە هەر ستەم لێکراوێك دەکەین و ئێمە لە بەرەی مەزلومەکاندایین)) (سیف زادە، ١٣٨٩: ص ١٥١ـ١٤٨).

**(٢.١.١.٤)- هەستیاری لە هەمبەر ئۆمەتی ئیسلامی :**

بە پێی ئەم ڕێگە بەدیلەی حکومەتی ئیسلامی و بەها و پێوەرەکانی کە لە ڕوانگەی ڕێبەرە باڵاکانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە هەمبەر لیبرال ـ دێموکراسی بە ڕێبەرایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دانراوە. ئایەتوڵڵا خومەینی رایدەگەیەنێت کە: ((ڕێبەرانی وڵاتانی ئیسلامی دەبێت لە هەمبەر دوژمناندا وشیار بن و ناکۆکییەکانیان وەلاوە بنێن)). هەروەها ئایەتوڵڵا خامنەیی دەڵێت: ((ئێمە دژی دەسەڵات و نفوز و دەستێوەردانی ئەمریکا لە وڵاتانی ئیسلامی و وڵاتانی چەوساوەین)). (سیف زادە، ١٣٨٩: ص ١٥١ـ١٤٨). بەم پێیەش بێت ئەوە کۆماری ئیسلامی خۆی بە بەرپرسیار دەزانێت لە هەمبەر بەرگریکردن لە فەلەستینیەکان، موسوڵمانانی بۆسنە، تاجیك، ئەفغان و کەشمیر و چیچان و...هتد. بەڵام بە پێی بنەمای مانەوە و پاراستنی حکومەت و سیستەمی ئیسلامی و هەروەها بنەمای تەقییە لە فیقهیی شیعەدا لە هەمبەر کێشەکانی ئازەربایجان ـ ئەرمەنستان، روسیا ـ چیچان و چین ـ ئەیغۆرەکان و...هتد، بێدەنگ دەبێت.

**(٤ ـ٣.١.١)- دژایەتی کردنی پشتیوانی لە ئیسرائیل:**

کۆماری ئیسلامی بە هۆی بنەما هزری و ئایدۆلۆژیەکانی بۆ دژایەتی ئیسرائیل و بەرگری لە موسوڵمانانی فەلەستین، دژایەتی توندی لایەنگری و پشتیوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئیسرائیل دەکات. تەنانەت ئەگەر بە پێی بنەمای مانەوە و پاراستنی حکومەت و سیستەمی ئیسلامی و هەروەها بنەمای تەقییە لە هەمبەر کێشەکانی ئازەربایجان ـ ئەرمەنستان، روسیا ـ چیچان و چین ـ ئەیغورەکان و...هتد، بێدەنگ بێت، بەڵام دەبینین بە پاساوی بەرگری و

پشتیوانی لە موسوڵمانانی جیهان و چەوساوەکان و دژایەتی زوڵم و زۆرداری و پاڵپشتی لە فەلەستینیەکان، بە ئاشکرا دژایەتی ئیسرائیل دەکات. ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاش بە هۆی پشتیوانیکردن لە ئیسرائیل و بە تیرۆریست زانینی گروپە توندڕەوەکانی دژی ئیسرائیل، بەشێکە لەو دژایەتی کردنە. بۆ نموونە ئایەتوڵڵا خامنەیی دەڵێت: ((بەرگری لە هەموو موسوڵمانانی جیهان و لە سەروو هەمووشیانەوە فەلەستینیەکان، بنەمایەکی سەرەکی و نەگۆڕی سیستەمی کۆماری ئیسلامی ئێرانە)). هەروەها دەڵێت: ((ئیمرۆکە بەرگری لە مافەکانی فەلەستینیەکان وخەڵکی لوبنان لە سەر هەموو موسوڵمانان ئەرکێکی شەرعیە)). (سیف زادە، ١٣٨٩: ص ١٥١ـ١٤٨). بە گشتی دەتوانین بڵێین دژایەتی کردنی ئیسرائیل تا ڕادەیەکی زۆر بەشێکی نەگۆڕی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێرانە. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی ناسنامەسازی و بەم پێیەش پێناسە کردنی خود و ئەوی تـر لە پرسی ناسنامە بە پێی تیۆری کۆنستراکتیڤیزم.

### (٤.١.١.٤)- ناکۆکی لەپێناسە کردنی تیرۆریزم:

پاڵپشتی کردنی ئێران لە بزوتنەوە توندڕەوەکان کە لە لایەن ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بە تیرۆریست ناسراون، یەکێکی تـرە لە خاڵە ناکۆکەکانە کە هەریەکەو پێناسەیەکی تایبەتی بۆی هەیە و ئەم پێناسەکردنانەش زۆر جیاوازن. بۆ نموونە کۆماری ئیسلامی ئێران کردەوەکانی فەلەستینیەکان و حەماس لە دژی ئیسرائیل بە تیرۆر نازانێت، بەڵکوو بە جەنگی پیرۆز دژی داگیرکەر و دژی کوفری دەزانێت. ئایەتوڵڵا خامنەیی دەڵێت: ((تیرۆریزم کردەوەیەکە کە کۆمەڵەیەك یان ڕێکخراو و دەوڵەتێك بیهەوێت بە تۆقاندن و کوشتن، ئامانجەکانی بێنێتەدیی)). (سیف زادە، ١٣٨٩: ص ١٥١ـ١٤٨). لێرەوەیە کە کۆماری ئیسلامی ئێران ڕەفتار

و کردەوەکانی ئیسرائیل و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دژی گروپە توندڕەوەکان بە تیرۆر دەزانێ، بەڵام کاری بزوتنەوە ئیسلامییە توندڕەوەکان بە جیهاد دژی کوفر و زۆرداری و داگیرکاری پێناسە دەکات.

### (٤ ـ١ـ١ـ٥)- سەربەخۆییخوازی:

ڕابــردووی تاڵی مێژووی ئێران لە هەردوو سەدەی نۆزدە و بیستدا لە هەمبەر دەستێوەردان و نفووزی رووسیا، بەریتانیا و ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا. لە لایەکی تــرەوە ئایدۆلۆژیای شۆڕشگێری ـ ئیسلامی، بنەمای فیقهی نەفی سبیل و زەینییەتی تیۆری پیلانگێری، وایکردووە کۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵ بدات خۆی لە نفووزی هەر دەسەڵات و هێزێکی تــر بە دوور بگرێت و بە توندی بەرپرچی بداتەوە. بۆ نموونە: ئایەتوڵڵا خومەینی لە وتەیەکدا دەڵێت: ((نەتەوەی گەورەی ئێران هیچ کاتێك سەرپەرشتی ئەمریکا و دەوڵەتانی ئیستکباری قبوڵ ناکات))(سیف زادە، ١٣٨٩: ص ١٥١ـ١٤٨). لە ڕوانگەی ڕێبەرانی باڵای کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە ئیمڕۆکە پرسی دۆسیەی ئەتۆمی ئێران هەمان مانای پرسی خۆماڵی کردنی نەوتی لە هەمبەر بــریتانییەکان لە سەردەمی موسەدیّقدا هەیە. هەستیاری و مەتــرسییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە کێشە و گیروگرفتەکانی بواری ناوخۆییدا، کە لە پرسەکانی مافی مرۆڤ و مافی کەمینە ئایینی و نەتەوەییەکان و پشتیوانی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانیدا بەرجەستە دەبێت، تەنانەت لە سێدارەدانی چەندین کەس لە خۆپێشاندانەکانی ساڵی (٢٠٠٩)ی ئێران، بە پاساوی هەوڵدان بوو بۆ بەرپاکردنی (شۆڕشی ڕەنگی) و ڕووخاندنی سیستەم، لە ڕێگەی هاندان یان فەرمانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، کە ئەم تــرسەش لە ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، زیاتــر ڕوون دەکاتەوە.

**(٤-١-١-٦)- دژایەتی لەگەڵ لیبـراڵ دیموکراسی و سیکۆلاریزم:**

بەو پێیەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕێبەرایەتی و نوێنەرایەتی بەهاکانی لیبــرال ـ دیموکراسی و سیکۆلاریزم دەکات، دژایەتی لەگەڵ ئەم بیرۆکەیە لە چوارچێوەی ئەوی تــری ناسنامەیی کۆماری ئیسلامی، دەبێتە سەرچاوەی ڕەوایەتی بۆ سیستەمی سیاسی کۆماری ئیسلامی ئێران کە خاوەن سیستەمێکی بڕوایی و ئایدۆلۆژیای سیاسی تایبەت بە خۆیەتی، واتا ڕەوایەتی لەم دژایەتییەوە وەردەگرێت. بەم پێیەش پەیوەندی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەموو کات وەك تابۆیەك بووە لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا کە لە لایەن توندڕەوەکانەوە ڕەتکراوەتەوە (سیف زادە، ١٣٨٩: ص ١٥١ـ١٤٨).

بە شێوەیەکی گشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە پەیوەندی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێراندا پێنج خاڵی سەرەکی ناکۆکی هەبووە:

١- دژایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ ئیسرائیل.

٢- هەوڵدانی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ دەستێوەردان لەکاروباری ناوخۆیی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کۆنترۆڵکردنی ناوچەکە.

٣- یارمەتیدان و پشتیوانیکردن لە گروپە توندڕەوە تیرۆریستیەکان.

٤- پرسی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە لە ناوخۆی ئێراندا.

٥- هەوڵی ئێران بۆ بەدەستهێنانی مووشەکی دوورهاوێژ، چەکی کۆکوژ و ئەتۆمی (احدی، ١٣٨٧: ص١٢٥).

## (٤ ـ١ـ٢)- سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هەمبەر کۆماری ئیسلامی ئێران:

### (١ـ٢ـ١ـ٤)- ستـراتیژی ئابلۆقەدانی کۆماری ئیسلامی ئێران:

جگە لە گوشاری سیاسی ـ سەربازی، بەکارهێنانی ئامرازی ئابلۆقەی ئابووری یەکێکە لە ئامرازەکانی دیپلۆماسی گوشار لە هەمبەر دەوڵەتانی شۆڕشگێری دژە سیستەم وەك کۆماری ئیسلامی ئێران، لە ئابلۆقەی ئابووریدا وڵاتی ئابلۆقەدانەر ڕێگە لە بازرگانی و هاتووچۆی ئازادی کاڵا و سەرمایە دەگرێت لە وڵاتی مەبەست بۆ ئەوەی کە ئەم وڵاتە ڕەفتارەکەی بگۆڕێت. ئەمەش دەتوانێت بە دوو شێوەی ئابلۆقەی دارایی و بازرگانی بێت (مشیر زادە و جعفری، ١٣٩١: ص٥٦).

هەرچەندە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە پاش بە بارمتەگرتنی دیپلۆماتە ئەمریکییەکان لە ساڵی (١٩٧٩)دا و بلۆك کردنی داراییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران، لە دەیەی هەشتاکانی سەدەی رابـردوو ڕێگەی لە فرۆشتنی چەك وئامرازی سەربازی بە کۆماری ئیسلامی ئێران دەگرت و ئابلۆقەی لەسەر ئێران دانابوو، بەڵام شەپۆلی ئابلۆقەکان دژی کۆماری ئیسلامی ئێران لە سەردەمی سەرۆکایەتی بیل کلینتۆن سەرۆك کۆماری ئەمریکادا بوو، ڕوانگەی بیل کلینتۆن دەربـڕی سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ناوبـراو بوو کە بەردەوامی هەناردە کردنی نەوتی کەنداو، پێشکەوتن لە گفتوگۆکانی ئاشتی نێوان عەرەبەکان و ئیسرائیل، ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی چەکی کۆکوژ، پاڵپشتی و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پەرەسەندنی دیموکراسی، پشتیوانی لە مافەکانی مرۆڤ و هاندانی وڵاتان بۆ بازاری ئازادی لە خۆدەگرت (متقی، ١٣٨٦: ص٧٠). ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە

سەردەمی کلینتۆندا، سیاسەتی مەهاری دوو لایەنەی لە هەمبەر کۆماری ئیسلامی ئێران و عێراق گرتەبەر، بە مەبەستی لاوازکردنیان و ئامرازی سەرەکی ئەم سیاسەتەش لە دژی ئێران، ئابلۆقە ئابوورییەکان و گۆشەگیرکردنی کۆماری ئیسلامی ئێران بوو، کە لە لایەك لە ناوخۆ ببێتە هۆی سەرهەڵدانی نارەزایی خەڵك و لە لایەکی تـر کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی گوشاری زیاتـر بخاتە سەر ئێران تا لە کۆتاییدا کۆماری ئیسلامی ئێران سیاسەتی نوێ لە ئاستی نێونەتەوەیی بگرێتەبەر، گرنگتـرین ئابلۆقەکانیش بـریتی بوون لە:

١- فەرمانی ١٥ی مارچ لە ساڵی (١٩٩٥)، کە قەدەغە کردنی وەبەرهێنانی هاووڵاتیانی ئەمریکی لە بواری دارایی، بەڕێوەبـردن یاخود بەشداری لە پیشەسازی نەوتی ئێرانی لە خۆ دەگرت، جگە لە قەدەغە کردنی کۆمپانیاکانی نەوتی ئەمریکی لە کارکردن لە ئێران.

٢- فەرمانی ١٦ی مارچ لە ساڵی (١٩٩٥) کە هاوردەکردنی هەر جۆرە شتومەك لە ئێران یان هەناردە کردنی کاڵا، خزمەتگوزاری و سەرمایەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ئێران قەدەغەکرا، هۆکاری سەرەکی ئەم ئابلۆقەیە پاڵپشتی و پشتیوانیکردنی کۆماری ئیسلامی ئێران لە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی و هەوڵی ئێران بۆ بەدەستهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ راگەیەندرا.

٣- فەرمانی ٥ی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٩٦) بوو، کە قەدەغە کردنی وەبەرهێنانی وڵاتانی تـریشی لە بواری پیشەسازی نەوت و غازی لە ئێران و لیبیا لە خۆدەگرت کە بە فەرمانی (ئیلسا) دەناسرێت. چونکە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رایگەیاند کە کۆماری ئیسلامی ئێران لە هەوڵی بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمیە. هەروەها ئێران دەستی هەبووە لە هێرشەکانی ساڵی (١٩٩٤) و (١٩٩٥) کە لە لایەن حەماس و جیهادی ئیسلامی کراوەتە سەر ئیسرائیل. ئەم یاسایانە، کۆمەڵێك سزا دیاریدەکەن بۆ ئەو کۆمپانیا و دامەزراوانەی کە ئەم

یاسایانە ڕەچاو نەکەن چیتر ناتوانن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کار بکەن یان بەرهەمەکانیان بفرۆشن (شهابی، ١٣٨٦: ص١٢ـ١١). بە هاتنە سەرکاری جۆرج دەبلیۆ بوش، لە ساڵی (٢٠٠١)دا کۆنگریسی ئەمریکی یاسای ٥ی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٩٦)ی درێژکردەوە و سیاسەتی مەهاری دوولایەنە پەیڕەو کرا و گوشارەکانی ئەمریکا بۆ سەر کۆماری ئیسلامی ئێران زیاترکرا. بە خستنە دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە پڕۆژەی هێڵی نەوتی باکو ـ جەیهان. هەروەها پاش یازدەی سێپتەمبەری ساڵی (٢٠٠١) سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاتر بەرەو گوشارخستنەسەرکۆماری ئیسلامی ئێران هەنگاوینا، بە تایبەت پاش ڕاگەیاندنی کۆماری ئیسلامی ئێران وەك میحوەری شەیتانی لە ساڵی (٢٠٠٢) لە لایەن بوشەوە لە پاڵ عێراق و کوریای باکور (سعیدی نژاد،١٣٨٤: ص١٠٨). سەرەڕای هاوکاری کۆماری ئیسلامی ئێران و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هێرشی ئەمریکا بۆ ئەفغانستان و عێراق بە شێوەی ناراستەوخۆ، نیگەرانییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەربارەی پرۆگرامی ئەتۆمی ئێران و پرسی پاڵپشتی ئێران لە تیرۆریزم وایکرد کە بارگرژی زیاتر لە نێوانیان دروستبێت و ئابلۆقەی زیاتر بە سەر کۆماری ئیسلامی ئێراندا بسەپێنێت. جۆرج دەبلیۆ بوش لە وتەیەکدا لە کۆنگرێسی ئەمریکی دەربارەی ئێران دەڵێت: ((کۆماری ئیسلامی ئێران وڵاتی یەکەمی پاڵپشتی تیرۆریزمە، لە کاتێکدا خەڵکی خۆی لە ئازادی بێبەش کردووە، ئێران بەدوای بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمییە و ئێمە لەگەڵ هاوپەیمانە ئەورووپیەکانمان هاوکاری دەکەین و دەبێت ئێران واز لە بەرنامەی پیتاندنی یۆرانیۆم بێنێت. هەروەها واز لە هاندان و پاڵپشتی کردنی تیرۆریزم بێنێت)). (پرحلم، ١٣٨٤: ص١٢). ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕێگەی بنکەکانی سەربازی لە ناوچەکە، بە دوای کۆنترۆڵی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوەیە، لە ئەفغانستان و عێراق، بنکەی

سەربازی لە قرقیزستان، جۆرجیا، ئازەربایجان، تورکیا، سعودیا، بەحرین، قەتەر، کویت، ئیمارات، هەروەها بە ڕێگەی چەندین ریککەوتنامەی ئەمنی و گرێبەستی پێدانی چەکی سەربازی بە ولاتانی ناوچەکە، ئەمەش بە مەبەستی کۆنتـڕۆڵی هیلالی شیعی کە ئێران ڕێبەرایەتی دەکات (حاجی یوسفی، ١٣٨٨: ص١٨٥).

بە گشتی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا، ستـراتیژییەکی سێ ڕەهەندی هەیە لە هەمبەر کۆماری ئیسلامی ئێران:

١- هاندان و پاڵپشتی لە گۆڕانی ڕژێمی کۆماری ئیسلامی ئێران بە شێوەی نەرم لە ڕێگەی نافەرمانی مەدەنی و نارەزایەتی و شۆڕش لە ناوخۆی ئێران.

٢- گۆشەگیر کردنی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ڕووی ئابووری و سیاسی و دیپلۆماتیکەوە. هەروەها ئابلۆقەی ئابووری و لاوازکردنی سەرچاوەکانی بەرژەوەندی و نفووزی ئێران لە ناوچەکە و جیهان.

٣- کۆنترۆڵکردنی هەموو سەرچاوە دارایی و ئابوورییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ناوچەکە و جیهان، هەروەها تەرخانکردنی بودجەی ساڵانەی پێویست بۆ هاوکاریکردنی ڕووخانی کۆماری ئیسلامی ئێران، لە ریگەی یارمەتیدانی ئۆپۆزێسیۆنی ئێران لە ژێر ناوی یاسای (پاڵپشتی لە ئازادی ئێران) کە لە کۆنگرێسی ئەمریکی ساڵانە بودجەی بۆ تەرخان دەکرێت (منصوری و اسمعیلی، ١٣٩٠: ص٢٩٢).

### (٢.٢.١٤)- ستـراتیژی گۆڕینی ڕژێمی کۆماری ئیسلامی ئێران:

لایەنگرانی ئەم سیاسەتە لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بڕوایان وایە کە کۆماری ئیسلامی ئێران لە بنچینەدا دژی بەها ئەمریکییەکان و سیستەمی سەرمایەدارییە. لەم ڕووەوە تەنیا بە ڕووخاندنی ریژیمی کۆماری ئیسلامی دەتواندرێت ئەم هەڕەشە و مەتـرسییە بەردەوامانە لە دژی سیستەمی نێونەتەوەیی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەهێلێت، کە ئەمەش بە

هێرشی سەربازی یان بە ڕووخانی نەرم لەژێر كاریگەری گوشار و ئابلۆقەكاندا لە ناوخۆوە دەكرێت، لایەنگرانی هێرشی سەربازی بەڵگە دەهێننەوە كە:

١- ئێران لە هەوڵی بەدەستهێنانی چەكی كۆمەڵكوژدایە.

٢- ئێران ڕێسا و یاساكانی كۆمەڵگەی نێونەتەوەیی پەیڕەو ناكات.

٣- ئێران دەستێوەردان لە وڵاتانی تری ناوچەكە دەكات.

٤- ئێران پشتیوانی لە تیرۆریزم و گروپە تیرۆریستیەكانی وەك حەماس و حیزبوڵڵا دەكات.

٥- خەڵكی ئێران دەیانەوێت ڕژێمی كۆماری ئیسلامی ئێران بڕوخێت.

٦- ئابلۆقەكان و گوشارەكان كاریگەر نیین و دیپلۆماسی و گفتوگۆ شكستی هێناوە.

بەڵام كەسانی تری ناوداری ئەمریكی وەك برژینیسكی، بڕوایان وایە كەوا لەم قۆناغەدا گوشاری سیاسی و دیپلۆماسی و ئابلۆقە و سزای ئابووری باشترە لە هێرشی سەربازی (پرحلم، ١٣٨٤: ص٥٠ـ٤٩). بە گشتی جگە لە كاریگەری قەیرانی ئابووری و پرسی ڕای گشتی و نارەزایەتی زۆرینەی خەڵكی ئەمریكا لە تێوەگلانی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە جەنگێكی تر، بەرپرسانی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا نایانەوێت ململانێ و هێرش بۆ سەر كۆماری ئیسلامی ئێران وەك جەنگی نێوان ڕۆژئاوا و ئیسلام بناسرێت و هەردەم مەترسیان لەوە هەبووە كە كۆماری ئیسلامی لە ئەگەری هەر هێرشێكی سەربازی بۆ سەر ئێران ئەم دەرفەتە لە بەرژەوەندی خۆی بقۆزێتەوە.

### (٤ـ٢)- كۆماری ئیسلامی ئێران و ئیسرائیل:

ئێران و ئیسرائیل لە سەردەمی پەهلەویدا پەیوەندی توندوتۆڵیان هەبووە لە ڕووی ئەمنی و سەربازی و پیشەسازی و...هتد. بە گشتی ڕژێمی پەهلەوی بە هاوپەیمانییەتی لەگەڵ ئیسرائیل هەوڵی نفووز لە دامەزراوەكانی ئەمریكا لە بەرژەوەندی ئێرانیان دەدا،

هەروەها شای ئێران هەوڵی دەدا کە لە نفووزی لۆبی ئیسرائیل لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ مەبەستی فرۆشتنی چەکی پێشکەوتوو بە ئێران سوود وەربگرێت (ولایتی، ١٣٧٦: ص١٩٧). مەتــرسیە هاوبەشەکانی ئیسرائیل و ئێران لە سەردەمی پەهلەوی لە کۆمۆنیزم هەروەها لە عەرەبەکان. مێژووی ئیمپراتۆریەتی ئێران لەگەڵ جوولەکە و توانای ئێران لە بواری وزەدا (نەوت و غاز) وایکردبوو کە پەیوەندی توندوتۆڵ لە نێوانیاندا هەبێت و هەریەکەو ئاسایشی ئەوی تــر بپارێزێت یان بەهێزی بکات (آقا پرست، ١٣٨٦: ص٥).

**(٤ـ٢ـ١)- ڕوانگەی ئیسلامی شۆڕشگێڕانەی ئێران لە هەمبەر ئیسرائیل:**

گوتاری مەزهەبی شۆڕشگێرانە لە ئێران، دژی ئیسرائیل بوونی هەبووە، هەر لە سەردەمی ڕێبەرانی ئایینی وەکو: ئایەتۆڵڵا کاشانی و نواب صفوی لە سەردەمی شای ئێران، تاوەکو دەگاتە ئایەتۆڵڵا خومەینی کە ڕەخنەگرتنی لە ڕژێمی پەهلەوی لە مزگەوتەکاندا بە ڕەخنەگرتن لە پەیوەندییەکانی ئێران و ئیسرائیل دەستپێدەکات، ئەمەش دواتــر دەبێتە یەکێك لە تەوەر یان ڕەگەزەکانی ناسنامەی کۆماری ئیسلامی ئێران (آهویی، ١٣٨٨: ص١٩). دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران لە ساڵی (١٩٧٩)دا، سەرەڕای هەڕەشە هاوبەشەکانی نێوان ئیسرائیل و ئێران، لە لایەن ناسیۆنالیزمی عەرەبییەوە، بەڵام پەیوەندییەکانیان پچڕا و باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە تاران درا بە فەلەستینیەکان و لەوە بەدواوە، پرسی فەلەستین و پشتیوانیکردنیان بوو بە ئامانجی سەرەکی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران. ئەم ڕەفتارەش بە پێچەوانەی خوێندنەوەی ریالیستی و لیبــرالیستیە بۆ بەرژەوەندی و سیاسەتی دەرەوە و هەروەها پرسە جیۆپۆلەتیکەکانی ئێرانە. ئێستا سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە چوارچێوەی هاوپەیمانییەتی دژی ئیسرائیلە و تەنانەت کۆماری

ئیسلامی ئێران خوازیاری هێرشی سەربازی بۆ سەر ئیسرائیل و لە ناوچوونی دەوڵەتی ئیسرائیلە (حاج یوسفی، ١٣٨٢: ص ٢٢). لەم بارییەوە ئایەتۆڵڵا خومەینی دەڵێت: ((ڕێبەران و نوێنەرانی وڵاتانی ئیسلامی وەرن پێکەوە یەکبگرین و دەستی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و لە سەرووی هەموویانەوە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل ببڕینەوە تاوەکو مافی فەلەستینیەکان بگەڕێنینەوە)) (رفعت،١٣٨٢: ص٨٤). ئایەتۆڵڵا خومەینی، ئیسرائیل بە فاکتەری نفووزی ئیستعماری نوێ و سیستەمی دەسەڵاتی ڕۆژئاوا لە جیهانی ئیسلام و ئێران دەزانێت و دژایەتیکردنی ئیسرائیل بە جیا لە دژایەتی ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نازانێت، بۆ پێناسەکردنی ئیسرائیلیش چەمکی (غودەی شێرپەنجەیی) بەکاردێنێت (امام خمینی، ١٣٧٨: ص٧).

**(٢.٢.٤)- ستراتیژی ئیسرائیل لە هەمبەر هەڕەشە بۆ سەر بوونی لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێران:**

بابەتی هەڕەشە بۆ سەر بوون، لە ڕوانگەی ئاسایشییەوە و بە تایبەت نیوریالیستەکانەوە و تەنانەت ریالیزمی هێرشبەرانە و ریالیزمی بەرگریکارانەش شیکردنەوەی بۆ دەکرێت، ریالیستە هێرشبەرەکان بڕوایان وایە کە زیاترکردنی ڕێژەی هێز گرنگترین ئامانجی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتانە، بە واتایەکی تر، تایبەتمەندی سیستەمی نێونەتەوەیی وادەکات کە هێزە گەورەکان ڕێژەی هێزی خۆیان بگەیننە زۆرترین و باڵاترین ئاست وەك باشترین ڕێگە بۆ زیاترکردنی ئاسایش (مرشایمر، ١٣٨٨: ص٢٥). هەروەها ریالیزمی بەرگریکارانە گرنگترین ئامانجی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتان، بە زیاترکردنی ئاسایشی ڕێژەیی دەوڵەتان لە سیستەمی نێونەتەوەییدا دەزانن. لەم ڕوانگەیەوە، دەوڵەتان تەنیا کاتێك هەوڵی زیاترکردنی نفووز و هێزی خۆیاندەدەن کە هەست بە نائەمنی و هەبوونی

هەڕەشە و مەتـرسی بۆ سەر ئاسایشیان بکەن. هەڕەشە بۆ سەر بوون، چەمکێکە کە بـریتییە لە بوونی هەرجۆرە مەتـرسی و هەڕەشەیەك دژی ئاسایش و مانەوە و بە گشتی بوونی وڵاتێك. لە ڕوانگەی ئیسرائیلیشەوە پرۆگرامی ئەتۆمی ئێران و هەڕەشە و مەتـرسییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران، هەڕەشەی بۆ سەر بوونی ئیسرائیل دروستکردووە. (بـرزگر و قاسمی، ١٣٩٢: ص١٧٣-١٧٢). لێرەوە دەتوانین بڵێین کە گرنگتـرین هۆکارەکانی دژایەتی کردنی ئیسرائیل بۆ پرسی ئەتۆمی ئێران، ئەو تێگەیشتن و ڕوانگەیەی ئیسرائیلیەکانە کە توانا و ڕێژە و ئاستی هێزی ئێران کە خاوەن چەکی ئەتۆمی بێت زۆر بەرزدەبێتەوە و کۆماری ئیسلامی ئێرانیش بە ئاشکرا ئیسرائیل بە ئەوی تـری ناسنامەیی خۆی دەزانێت و بە پێی ئایدۆلۆژیای توندڕەوانەی ئایینی خۆی هەوڵی لە ناوبـردنی ئیسرائیل دەدات. هەروەها ئێرانی خاوەن چەکی ئەتۆمی کۆتایی بە توانای بەرگری ئیسرائیل دەهێنێت. لە لایەکی تـرەوە بە پێی تیۆری (دۆمینۆ)، وڵاتانی تـری ناوچەکە وەك تورکیا، میسر و سعودیا، بۆ پاراستنی ئاسایشی خۆیان ئەوانیش هەوڵی بە دەستهێنانی چەکی ئەتۆمی دەدەن، هەروەها گروپە تیرۆریستیەکان بە هۆی ئەگەری دەستپێڕاگەیشتنیان بە چەکی ئەتۆمی ئاسایشی ناوچەکە و ئاسایشی نێونەتەوەیی دەخەنە مەتـرسیەوە، بە گشتی ئاسایش، ئاشتی، سەقامگیریی و پرۆسەی دێموکراتیزاسیۆن لە ناوچەکە لەباردەچێت (لطفیان، ١٣٩٠: ص١٩٥). هەڕەشەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ سەر بوونی ئیسرائیل وایکردووە کە ئیسرائیل چەند سـتـراتیژی و سیناریۆیەك بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو هەڕەشە و مەتـرسیانە دابنێت: ١- کۆنترۆڵ. ٢- بەڕێوەبـردنی قەیرانی ئەتۆمی ئێران. ٣- گەمارۆی ئابووری. ٤- گەمارۆی دەریایی. ٥- هێرشی سەربازی. ٦- گۆڕانی ڕژێمی ئێران. ٧- قایلبوون بە ئێرانی خاوەن توانای ئەتۆمی(بزرگر، ١٣٨٨: ص١٢٥). لێرەدا سـتـراتیژی و سناریۆکانی

ئیسرائیل لە هەمبەر هەڕەشەکان بۆ سەر بوونی لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێران دەخەینەڕوو.

## (٤-٢-٢-١)- ئابلۆقەی ئابووری:

ئیسرائیل بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆماری ئیسلامی ئێران، هانی سەپاندنی سزا و ئابلۆقەی ئابووری سەر ئێران دەدات بۆ ڕاگرتنی چالاکییە ئەتۆمییەکانی ئێران و لاوازبوونی لە ڕێگەی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی یاخود ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ولاَتانی ئەوروپا و ولاَتانی تـر. هەروەها هەوڵ دەدات کە دۆسیەی ئەتۆمی ئێران لە ئەنجومەنی ئاسایش و لە چوارچێوەی فەسڵی حەوتدا، بڕیار بۆ ئابلۆقەی ئابووری زیاتـری کۆماری ئیسلامی ئێران بدرێت بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی ئێران و وازهێنانی لە پرۆگرامی ئەتۆمی (لطفیان، ١٣٩٠: ص١٩١).

## (٤-٢-٢-٢)- گۆڕینی ڕژێم:

یەکێکی تـر لە بەرنامەکانی ئیسرائیل لە هەمبەر هەڕەشەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵدانە بۆ گۆڕینی ڕژێمی کۆماری ئیسلامی و بە گشتی زۆربەی نوخبە سیاسییەکانی ئیسرائیل بڕوایان وایە گۆڕینی ڕژێم و هاتنە سەرکاری ڕژێمێکی نوێی دێموکراتیك ئەوە ئەم هەڕەشەیە لە سەر ئیسرائیل لادەبات، تەنانەت ئەمە بە یەکێك لە ئامانجەکانی ئابلۆقەی ئابووری دەزانن تاوەکو روخانی ڕژێم خێراتـر بێت و بە ئاسانی بتواندرێت هێرش بکرێتە سەر ئێرانێکی لاواز و پڕ لە ناڕەزایەتی جەماوەری (بـرزگر و قاسمی، ١٣٩٢: ص١٨١).

**(٤ـ٢ـ٢ـ٣)- هێرشی سەربازی:**

مەتــرسی هەڕەشە بۆ سەر بوونی ئیسرائیل لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێران وادەکات کە ئیسرائیل بە هەر ئامراز و ڕێگەیەك هەوڵ بدات کە ئێران لە بەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی دووورکاتەوە، یەکێك لەم بژاردانەش هێرشی سەربازییە بۆ سەر بنکە و دامەزراوە ئەتۆمیەکانی ئێران. ئیسرائیل بڕوای وایە کە هەموو ڕێگەیەك دەبێت بگرێتەبەر بۆ ئەوەی ئێران و سوریا و عێراق چەکی ئەتۆمیان نەبێت، هەروەکو چۆن پێشتــر لە ساڵی(١٩٨٠)دا ئیسرائیل هێرشی ئاسمانی کردە سەر بنکەی ئەتۆمی عێراق و لە ساڵی (٢٠٠٧)دا، بنکەی ئەتۆمی سوریای بۆمباران کرد و لە ناوی بــرد (لطفیان، ١٣٨٨: ص٢٠٣).

**(٤ـ٢ـ٢ـ٤)- قبوڵ کردنی خاوەندارییەتی چەکی ئەتۆمی:**

ئیسرائیل تەنیا کاتێك کۆماری ئیسلامی ئێرانی ئەتۆمی قبوڵ دەکات کە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا گەرەنتی توندوتۆڵی پاراستنی ئیسرائیل لە ئەگەری هەر هەڕەشە و مەتــرسی و هێرشێك بدات. واتا هەڕەشە لە ئیسرائیل هەڕەشە بێت لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یاخود ڕێککەوتنامەی دوو قۆڵی بەهێز ببەستن بۆ پاراستنی ئیسرائیل یان لەگەڵ ناتۆ یاخود سیستەمێکی ئاسایشی ناوچەیی دژی مەتــرسیەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران دابمەزرێت، یاخود هەوڵ بدرێت ڕێگە لە نفووزی ئێران لە ناوچەکە بگیرێت و پرۆسەی ئاشتی و دیموکراسی خێراتــر بکرێت و ئێران گۆشەگیرتــر بکرێت، بە هۆی ناسنامەی سیستەمە سیاسی و ئایدۆلۆژیەکەی و بەها باڵاکانی ئەم سیستەمە کە لە ڕوانگەی ئیسرائیلەوە دژی ئاسایشی وڵاتانی ناوچەکە و بنەماکانی دیموکراسیە (بــرزگر و قاسمی، ١٣٩٢: ص١٨٤). لە لایەکی تــرەوە بە پێی بیروبڕوا، ناسنامە

و تێگەیشتنی کۆماری ئیسلامی ئێران، بە شێوەیەکی گشتی گەورەترین مەترسی بۆ سەرکۆماری ئیسلامی ئێران لە لایەن ڕۆژئاوایەوەیە و بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو هەڕەشە و مەترسیەش ئیسرائیل لە ناوەندی هەرەشەی ئەتۆمی ئێراندایە و ئیسرائیلیش هەوڵ دەدات کە لە ڕێگەی کاریگەری لۆبی جولەکە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هەروەها دوورخستنەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە پرۆسەی ئاشتی عەرەبەکان و ئیسرائیل و هاوکاری لەگەڵ تورکیا و نفووز لە ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز و پەرەپێدانی هاوکاری ئابووری لەگەڵ وڵاتانی کەنداو و گەشەپێدانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ رووسیا، هیندستان و پاکستان، کۆماری ئیسلامی ئێران کۆنترۆڵ بکات و دواتر هەوڵی گۆرینی رژیمی کۆماری ئیسلامی ئێران بدات (خجستەنیا، ١٣٨٥: ص١٠).

دەتوانین بڵێین ئێران لە مێژووی خۆیدا لە ڕێگەی دژایەتی کردنی ئیسرائیل توانیویەتی نفووزی مەعنەوی و ڕەوایەتی لە نێو عەرەبەکان و موسوڵمانان پەیدا بکات. لە گوتاری مەزهەبی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا دوژمنایەتی و دژایەتی لە هەمبەر ئیسرائیلدا وەك مەرجێکی پێویست بۆ نزیکبوونەوە و یەکێتی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ جیهانی ئیسلام سەیرکراوە. بە پێی ڕوانگەی دادپەروەریخوازیەوە ئەم پرسە بانگەشەی بۆ دەکرێت، ئەمە بێجگە لە بنەماکانی دژایەتی لەگەڵ ستەمکاران و پشتیوانی و پاڵپشتی لە لێقەوماو و ستەملێکراوان و پاراستنی ئیسلام و موسوڵمانان کە هەموویان بنەماکانی هزری ئەم دژایەتیە پێکدێنن (آهویی، ١٣٨٨: ص٢٦). بەگشتی ناکۆکییەکانی عەرەبەکان و ئیسرائیل و پرسی فەلەستینیەکان بۆتە هۆکاری زیاتربوونی نفووز و پێگەی ئێران لە ناوچەکە. هەروەها دروستبوونی قووڵایەکی ستراتیژیك بۆ ڕێگەگرتن لە هێرشی سەربازی ئیسرائیل بۆ سەر ئێران (لطفیان، ١٣٨٧: ص٢٠٥).

## (٤.٣)- کۆماری ئیسلامی ئێران و یەکێتی ئەوروپا:

پێگەی جوگرافیایی و گرنگی ئابووری ئێران و پرسی دابینکردنی وزە بۆ ئەوروپا، هەروەها ڕۆڵی ئێران لە ئاسایشی ناوچەکە بە گشتی و کەنداو بە تایبەت، هەروەها ڕۆڵ و نفووزی ئێران لە پرۆسەی ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەت فەلەستین و ئیسرائیل، نفووزی ئێران لە سەر هیلالی شیعی، ڕۆڵ و پێگەی ئێران لە دەستەبەرکردنی سەقامگیری لە ئەفغانستان و عێراق، نفوز و کاریگەری ئێران لە ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز، هەروەها پرسی دۆسیەی ئەتۆمی ئێران، وایکردووە کە کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ یەکێتی ئەوروپا گرنگی تایبەتی هەبێت (خالوزادە، ١٣٨٢: ص٣٩). لە لایەکی تـرەوە یەکێتی ئەوروپاش بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران بە هۆی پێگەی وڵاتانی ئەوروپایی لە ڕووی سیاسی و ئابووریەوە گرنگی تایبەتی هەیە و بە گشتی کۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵ دەدات کە یەکێتی ئەوروپا بە کاربێنێت بۆ کەمکردنەوەی گوشارەکانی ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا بۆ سەر ئێران. دەتوانین بڵێین کە لە ڕوانگەی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە، یەکێتی ئەوروپا لە بەر ئەم خاڵانەی خوارەوە گرنگی هەیە:

١ـ ئێران یەکێتی ئەوروپا وەك فاکتەری هاوسەنگی دەبینێت لە هەمبەر گوشارەکانی ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا.

٢ـ ئێران دەیەوێت کاریگەریەکانی ئابلۆقەکانی ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا بۆ سەر ئێران کەمبکاتەوە.

٣ـ ئێران دەیەوێت لە بواری وەبەرهێناندا سوود لە سەرمایەی وڵاتانی یەکێتی ئەوروپا لە کەرتە جیاجیاکاندا ببینێت بە تایبەت لە بواری نەوت و غازدا.

٤ـ ئێران دەیەوێت لە ڕووی تەکنۆلۆژیاوە خۆی بەهێز بکات و بە گشتی یەکێتی ئەوروپا ئەو تەکنۆلۆژیا نوێیەی هەیە.

٥ـ ئێران دەیەوێت گفتوگۆكانی لەمەڕ پرسی دۆسیەی ئەتۆمی خۆی لە ڕێگەی یەكێتی ئەوروپاوە درێژە پێبدات، بە هۆی ئەوەی كە ئەوروپاییەكان زیاتر بڕوایان بەرێكاری دیپلۆماسی هەیە بۆ چارەسەركردنی ئەم پرسە (میناوند، ١٣٨٥: ص٥٩ـ٥٨). هەروەها وڵاتانی یەكێتی ئەوروپا هەوڵیانداوە تا بۆشایی پچڕانی پەیوەندییەكانی ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا و كۆماری ئیسلامی ئێران پڕبكەنەوە، بە تایبەت پاش ساڵانی نەوەدەكان و ڕووداوەكانی ساڵی (٢٠٠١) و زیاتربوونی ڕۆڵی ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا لە ناوچەكە. یەكێتی ئەوروپا ڕایگەیاندوە كە بەرزكردنەوەی ئاستی دێموكراسی و ڕێزگرتن لە مافەكانی مرۆڤ وادەكات كۆماری ئیسلامی ئێران و یەكێتی ئەوروپا ببنە شەریكێكی بەردەوام كە ئەمەش دەربڕی هەوڵی یەكێتی ئەوروپایە بۆ بەرزكردنەوەی پێگەی خۆی لە هاوكێشە جیهانییەكان بە گشتی و بە تایبەت لە ناوچەكەدا. لە لایەكی ترەوە یەكێتی ئەوروپا كۆمەڵێك تێبینی لە سەر ڕەفتار و سیاسەتی دەرەوەی ئێران هەیە و ڕەخنە لە سیاسەتەكانی كۆماری ئیسلامی ئێران دەگرێت، بۆ نموونە:

١ـ ڕاگەیاندنی فەتوا و حوكمی هەڵگەڕانەوەی نووسەر (سەلمان روشدی) و دیاریكردنی پاداشت بۆ كوشتنی.

٢ـ تیرۆر كردنی نەیارانی كۆماری ئیسلامی ئێران لە وڵاتانی ئەوروپایی، بۆ نموونە دۆسیەی دادگای میكۆنوس.

٣ـ دژایەتی كۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ پرۆسەی ئاشتی عەرەبەكان و ئیسرائیل.

٤ـ نیگەرانی یەكێتی ئەوروپا لە دەستپێراگەیشتنی ئێران بە چەكی ئەتۆمی لە ڕێگەی رووسیا و كۆریای باكوورەوە. پەیوەندییەكانی ئێران و یەكێتی ئەوروپا بە تایبەت لە پاش ساڵی (٢٠٠٣)وە لە ژێر كاریگەری دۆسیەی ئەتۆمی ئێران و

گفتوگۆکانیان لەگەڵ ئێراندایە. چونکە بە گشتی وڵاتانی یەکێتی ئەوروپا دژی دەستپێڕاگەیشتنی کۆماری ئیسلامی ئێرانن بە تەکنۆلۆژیای بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی، بە هۆی ئایدۆلۆژیای شۆڕشگێڕانە و توندڕەوانەی ئێران و کاریگەری و ڕۆڵی نەرێنی ئێران لە ناوچەکە بە گشتی، هەروەها پاڵپشتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە گروپە چەکدارە تیرۆریستیەکان وەك حیزبوڵڵا و حەماس و ... هتد (عباسی اشلقی، ١٣٨٨: ص٢٦١-٢٥٢)

جێگەی ئاماژەیە کە نیگەرانییەکانی ئەوروپییەکان لە پرۆگرامی ئەتۆمی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاتــرە، بە هۆی ئەوەی کە جگە لە نیگەرانیان دەربارەی پرسی ئاشتی نێونەتەوەیی، ئەوان لە هەمبەر ئاسایشی خۆیان بە هۆی مووشەکە دوورهاوێژەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران نیگەرانن و بۆیەش خوازیاری سەپاندنی سزا و ئابلۆقەی توندوتۆڵتــرن بۆ سەرکۆماری ئیسلامی ئێران، هەرچەندە بڕوایان بە هێرشی سەربازی بۆ چارەسەرکردنی ئەم پرسە نییە (خالوزادە، ١٣٩١: ص١٤٩). لێرەوە دەتوانین وەك نموونەیەك گرنگتــرین پرس و بابەتەکانی نێوان کۆماری ئیسلامی ئێران و یەکێتی ئەوروپا و کاریگەریان لە سەر پەیوەندی و سیاسەتی دەرەوەیان لە هەمبەر یەکتــری، لە خشتەیەکدا بخەینەڕوو:

## خشتەی پەیوەندییەکانی ئێران و یەکێتی ئەوروپا:

| ریز بەند | پرس وبابەت | پەیوەندی ئێران و EU ١٩٧٩ـ١٩٨٩ | پەیوەندی ئێران و EU ١٩٩٠ ـ ١٩٩٧ | پەیوەندی ئێران و EU ١٩٩٧ـ ٢٠٠١ | **پەیوەندی ئێران و EU٢٠٠١ ـ** |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | فەتوای کوشتنی سەلمان روشدی | هۆکاری بڕینی پەیوەندییەکان | کاریگەری سلبی لە سەر پەیوەندییەکان | هەوڵدان بۆ مەزهەبی نیشاندانی ئەم فەتوایە نەك سیاسی بوونی | **کاریگەری سلبی لە سەر پەیوەندییەکان پاش پێدانی میدالیای شوالیە بە سەلمان روشدی** |
| ٢ | پچڕانی پەیوەندی نێوانیان | لەپاش ڕاگەیاندنی فەتوای کوشتنی سەلمان روشدی | پچڕانی پەیوەندییەکان لەپاش ڕاگەیاندنی بڕیاری دادگای میکۆنۆس لە ئەڵمانیا | - | **-** |
| ٣ | ئابڵۆقەی ئابووری | لە پاش رووداوی بەبارمتە گرتنی دیپلۆماتە | کەم کردنەوەی ئابڵۆقە ئابوورییەکانی سەر | وەبەرهێنان لە ئێران | **کەم بوونەوەی پەیوەندی ئابووری و سەپاندنی سزا و** |

| | | ئەمریکییەکان لە تاران و لە ماوەی شەری ئێران و عێراق | ئێران | | **ئابڵۆقە بۆ سەر ئێران** |
|---|---|---|---|---|---|
| ٤ | پرۆسەی ئاشتی عەرەب-ئیسرائیل | هۆکاری ناکۆکی | هۆکاری ناکۆکی | گفتوگۆ لەم بارەیەوە و داوا کردن لە ئێران بۆ دەستێوەرنەدان لەم پرۆسەیە | **هۆکاری ناکۆکی لە نێوانیان** |
| ٥ | ئاستی چاوپێکەوتنەکان | بەرپرسە پلە دووەکان و جێگرەکانی وەزیری دەرەوە | وەزیرانی دەرەوە | بەرپرسە باڵاکان | **وەزیرانی دەرەوە و سەرۆکی وەفدی دانوستانکار** |
| ٦ | پرسی گفتوگۆکان | - | گفتوگۆی ڕەخنە ئامێز | گفتوگۆی گشتی | **دانوستانی ئەتۆمی** |
| ٧ | پرسەکانی جێگەی ناکۆکی | ئایدۆلۆژی، ناسنامە، شەری ئێران و عێراق، پاڵپشتی لە بزوتنەوەتوندڕەوەکان | بەردەوام بوونی ناکۆکی ناسنامەیی و ئایدۆلۆژی، مافی مرۆڤ، تیرۆریزم، ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست | کەم بوونەوەی بارگرژیەکان و گفتوگۆکردن بۆ چارەسەری کێشەکان | **بارگرژی لە پەیوەندییەکان، تیرۆریزم، دۆسیەی ئەتۆمی ئێران، مافی مرۆڤ، ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست** |

| ٨ | هەڵوێستی ئەمریکا دەربارەی پەیوەندی ئێران و یەکێتی ئەورووپا | هەماهەنگی لە سیاسەتی ئەمریکا و EU | هەماهەنگی لە سیلسەتەکانیان لە هەمبەر ئێران | تا ڕادەیەك جیابوونەوە لە هەڵوێستی ئەمریکا لە هەمبەر کۆماری ئیسلامی ئێران | **هاوهەڵوێستی زیاتــر لەگەڵ ئەمریکا لە لایەن EU، بەڵام کەمێك جیاوازی دەربارەی چارەسەر کردنی پرسی ئەتۆمی ئێران** |
|---|---|---|---|---|---|

سەرچاوە: (عباسی اشلقی، ١٣٨٨: ص٢٦٣ )

## (٤.٤)– کۆماری ئیسلامی ئێران و سیاسەتی بەرەو ڕۆژهەڵات:

بە گشتی لە ڕوانگەی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە زەمینەی دروستبوونی ستــراتیژی (ڕوانگەی بەرەو ڕۆژهەڵات)، لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا، بە هۆی سێ فاکتەرەوە دەستنیشان دەکرێت:

١ـ بەڵگەنامەی ڕوانگەی پەرەپێدانی بیست ساڵەی ئێران تا ساڵی (١٤٠٤)ی هەتاوی (٢٠٢٥) زایینی:

ئەم بەڵگەنامەیە ئاماژە بەوە دەکات کە بەدەستهێنانی هێزی ئابووریی لە ناوچەکە، پێویستی بە تەعامول و پەیوەندی بونیاتنەر لەگەڵ وڵاتانی تــر بە تایبەت باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هەیە. چونکە بڕیاردەرانی کۆماری ئیسلامی ئێران دەزانن بۆ بەهێزبوونیان پێویستیان بە دەستپێڕاگەیشتن بە سەرچاوەی نێونەتەوەیی هەیە بە تایبەت ناوەندەکانی هێز و سامان لە جیهان، ئەمەش بە سیاسەتی سڕینەوەی پەشێوی و قەیران دەکرێت کە بە شێوەی گشتی سێ ناوچەی گرنگ لەم ڕووە لە جیهاندا بوونیان هەیە: ١ـ ئەمریکای باکوور. ٢ـ یەکێتی ئەوروپا. ٣ـ باکوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا. بۆیە چۆنیەتی تەعامول یان پەیوەندی باش و توندوتۆڵ لەگەڵ هەریەك لەو جەمسەرانە پێویستە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران. (شریعتی نیا، ١٣٨٤: ص٣ـ٢).

٢ـ دڵساردی و بێ هیوابوون لە هەمبەر ڕۆژئاوا:

ئەگەر ناوەندەکانی بەرهەم هێنانی هێز و سامانی نێونەتەوەیی بــریتین لە باکوری ئەمریکا بە تایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەوروپا و باکوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ئەوە پەیوەندی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەوروپا گیروگرفتی زۆری تێدایە چونکە بە هۆی نەبوونی پەیوەندی فەرمی و دژمنایەتی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا،

ئێران پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپا هەبوو و وڵاتانی ئاسیاش هێشتا بەهێز نەببوون، بەڵام پاش گرژی و ئاڵۆزی لە پەیوەندییەکانی ئێران و وڵاتانی ئەوروپا، بە تایبەت قەیرانی دۆسیەی ئەتۆمی، کۆماری ئیسلامی ئێران لە ئەمە تێگەیشت کە ناتوانێت بەرژەوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپا بهێنێتە دیی، بۆیە کەوتە بیرکردنەوەی لە ئەلتەرناتیڤی تـر (شریعتی نیا، ١٣٨٤: ص٤).

**٣ـ بەهێزبوونی ڕۆژهەڵات:**

لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا، وڵاتانی ڕۆژهەڵات و بە تایبەت باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا گۆڕانکاری و پێشکەوتنی خێرایی ئابووری بە خۆیەوە دیت، وڵاتانی ئەو ناوچەیەش لە سەر گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا بەهێزبوون و پێگەی وڵاتانی ژاپۆن، چین، هیندستان، مالیزیا، کۆریای باشوور. بە گشتی چەند وڵاتێکی تـری ناسراو بە پڵینگەکانی ئاسیا لە ئاستی نێونەتەوەیی بەرز بۆوە و ئەمەش وایکرد ستـراتیژیستەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گرنگی زیاتـر بەم ناوچەیە بدەن، چونکە پێشبینی دەکرێت لە داهاتوویەکی نزیکدا بە هۆی بەهێزی و پێشکەوتوویی ئابووریەکەیان شوێنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و وڵاتانی ئەوروپا لە هاوکێشە نێونەتەوەییەکاندا بگرنەوە (ثقفی عامری، ١٣٨٥: ص١٥ـ١٤).

لایەنگرانی ستـراتیژی ڕوانین بەرەو ڕۆژهەڵات لە کۆماری ئیسلامی ئێران بڕوایان وایە کە بە پێچەوانەی ڕۆژئاوا، وڵاتانی ڕۆژهەڵات پرس و بابەتەکانی سیاسی و ئابووری تێکەڵ بە یەکتـری ناکەن و ئەمەش دەبێتە هۆی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران، بۆ نموونە وەبەرهێنانی چین لە بواری نەوت وغاز لە ئێران یاخود وەبەرهێنانی هیندستان لە پیشەسازی پۆڵا لە ئێران، هەروەها وڵاتانی ڕۆژهەڵات دەتوانێت ببێتە بازارێکی شیاو و بەربڵاو بۆ هەناردەکردنی نەوت و غاز یان کاڵای ئێران (شریعتی نیا، ١٣٨٤: ص٧). لە

لایەکی تــرەوە کۆماری ئیسلامی ئێران پێیوایە، کە ڕۆژئاوا کۆمەڵێك پلانی بۆ لاواز کردن یان لەناوبــردنی ئەم سیستەمە هەیە، بۆیە کۆماری ئیسلامی ئێران لە سیاسەتی دەرەوەیدا هەوڵ دەدات ئەم پرۆژانە پووچەڵ بکاتەوە. بۆ نموونە ئێران دژایەتی هەوڵەکانی پاڵپشتی لە نەتەوەکانی تــری ئێران دەکات، وەك تورك و کورد کە پێیوایە لە دەرەوەی سنووری ئێران پاڵپشتی دەکرێن. بە هۆی ئەوەی کە بە گشتی بڕوای وایە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئیسرائیل و ئەوروپا، هەوڵی پۆلۆنیالیزە کردنی ئێران (هەوڵدان بۆ گوشار خستنە سەر ئێران لە بواری مافی مرۆڤ)، باڵکانیزەکردنی ئێران (هەوڵدان بۆ لێکهەڵوەشانەوەی ئێران)، ئەندونێسیانیزە کردنی ئێران (گۆڕینی کولتووری ئێران)، ڤاتیکانیزەکردنی ئێران (لە ڕووی جێگیر کردنی سیستەمێکی سیکولار لە جێگەی ولایەتی فەقیە)، هەروەها ئۆکرانیانیزە کردنی ئێران (هەوڵدان بۆ بەرپاکردنی شۆڕشی ڕەنگی و چاوەدێری نێونەتەوەیی بۆ هەڵبژاردن) دەدەن، کەئەمەش وادەکات کۆماری ئیسلامی ئێران بەردەوام لە هەوڵی دروستکردنی هاوسەنگییەك بێت لە هەمبەر ڕۆژئاوادا و هەوڵی بەهێزکردنی خۆی بدات (دهشیری، ١٣٨٣: ص٥٤).

بنەمای سیاسەتی (نە شرقی و نە غربی) کە زیاتــر بۆ دژایەتی کردنی ڕۆژئاوا بە تایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وئیسرائیل بووە، بۆتە هۆی ئەوەی کە کۆماری ئیسلامی ئێران، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل وەك ناسنامەی جیاوازی دژبەری خۆی یاخود ئەوی تــری ناسنامەیی خۆی پێناسە بکات. هەروەها ئەمەش وایکردووە کە کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانی خۆی، زیاتــر لە ولاتانی ڕۆژهەڵات نزیك ببێتەوە و بە کردەیی ئەوەی سەلماندووە (آقایی، ١٣٨٥: ص٨). بڕیاردەرانی کۆماری ئیسلامی ئێران بــڕوایان وایە کە لە گرنگتــرین میکانیزمەکانی ڕێگرتن لە کاریگەری هەڕەشەکانی ئابووری، سیاسی و سەربازی ویلایەتە یەکگرتووەکانی

ئەمریكا و ئیسرائیل، بە هێز كردنی پەیوەندی و هاوكاری لەگەڵ وڵاتانی كاریگەر لە گۆڕانكارییەكانی جیهان وەك وڵاتانی ڕۆژهەڵاتە (ثقفی عامری، ١٣٨٥: ص٦١). لە لایەكی تـرەوە ستراتیژی (ڕوانین بەرەوە ڕۆژهەڵات) لە سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامیدا لە لایەن لایەنگرانی ئەم سیاسەتە بە هۆی كۆمەڵێك فاكتەر: شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی و هەبوونی هاوبەشی كولتووری، مێژوویی و ناسنامەییە لە هەمبەر ڕۆژئاوادا، هەرچەندە ئەم سیاسەتە وڵاتانی دژی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاش دەگرێتەوە كە لە هەر شوێنێكی جوگرافیایی بن، بۆ نموونە ڤێنزوئێلا و بۆلیڤیا (آدمی، ١٣٨٩: ص١٠٥).

لێرەوەیە كە ڕۆڵی ناسنامە و دژایەتی ناسنامەیی بۆ هاوپەیمانییەتی و دروستبوونی بەرژەوەندی هاوبەش یاخود دوژمنایەتی بەرجەستە دەبێت.

بە گشتی سیاسەتەكانی كۆماری ئیسلامی ئێران لە هەمبەر ڕۆژئاوا و هەڕەشەكانی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و ئیسرائیل دەربارەی دۆسیەی ئەتۆمی ئێران، وایكردووە كە كۆماری ئیسلامی ئێران ڕوانگەی بەرەو ڕۆژهەڵات بگرێتەبەر و هەوڵی خۆگونجاندنی سیاسی و ڕێككەوتنامەی ئابووری و هاوكاری لەگەڵ وڵاتانی ئاسیا و باكوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا (چین، مالیزیا، هیندوستان و...هتد) بدات، واتا لە سەر بنەمای ئابووری هەوڵ دەدات بەرژەوەندی سیاسی و ئاسایشی دەستەبەر بكات (شیخ عطار، ١٣٨٥: ص١٣). هەروەها لە ڕۆژهەڵاتی كۆماری ئیسلامی ئێران، پرسی چەكی ئەتۆمی هیندستان و پاكستان، كێشە و ململانێیەكانیان لە سەر ناوچەی كشمیر و جۆری پەیوەندیان لەگەڵ ئیسرائیل و ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، هەروەها فاكتەری مەزهەب، كاریگەری لە سەر پەیوەندی كۆماری ئیسلامی ئێران و ئەم وڵاتانە هەبووە، ئەمە جگە لە ئەفغانستان و نفووزی ئێران لەم وڵاتە، لە لایەكی تـرەوە بوونی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ناوچەكە و مەتـرسی و هەڕەشە ئاسایشییەكانی سەر

ئێران. بەڵام بە گشتی پەیوەندی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژهەڵات بە تایبەت لەگەڵ ژاپۆن و کۆریای باشور زیاتر لە پەیوەندییەکی ئابووری بووە، بەڵام لەگەڵ وڵاتی چین جگە لە پەیوەندی ئابووری و بواری وزە، لە بواری سەربازیشدا پەیوەندی و هاوکاریان هەبووە (خجستەنیا، ١٣٨٥: ص٩).

## (٤ .٥)- کۆماری ئیسلامی ئێران و رووسیا و ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز:

### (٤-٥-١) -رووسیا:

بە هۆی هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت و گۆڕانکاریەکانی ناوچەکە و دەرکەوتنی ئەکتەری نوێ هەروەها زیاتربوونی ڕۆڵی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، جۆرێك لە ڕێککەوتنی ستراتیژیك لە نێوان کۆماری ئیسلامی ئێران و رووسیا دروستبوو، بە تایبەت مەترسی ئێران لە نفووزی ئیسرائیل، تورکیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز کە هەڕەشەی ئاسایشی بۆ ئێران دروستدەکات، وایکرد کە کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ پاراستنی خۆی لە رووسیا نزیکتر بێتەوە (حاجی یوسفی، ١٣٨٤: ص٢٣٩). لە لایەکی تریشەوە رووسیا لەپاش قۆناغێك لە گۆشەگیری و پاشەکشە لە ئاستی نێونەتەوەییدا هەنگاوی گرنگی ئابووری و سیاسی هەڵگرتووە بۆ بەرجەستەکردنی ڕۆڵ و پێگەی خۆی زیاتر جەخت لە سەر ناسنامەی ڕۆژهەڵاتی و ئاسیایی دەکاتەوە، ئەمە جگە لە مەترسی رووسیا لە گەشەی خێرای ئابووری چین و هیندستان کە کۆنترۆڵی بازارەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەوروپایان کردووە و پێگەیان بەرزتر بۆتەوە (ولایتی، ١٣٨٥: ص٢٠).

له لایەكی تـرەوە بیرۆكەی پەیوەندی لەگەڵ ڕۆژهەڵات بە مەبەستی دروستكردنی هاوسەنگی لە بەرامبەر ڕۆژئاوادا، وەك ستـراتیژیەك لە سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێراندا پێشووتـریش بوونی هەبووە، بۆ نموونە هاشمی رەفسەنجانی سەرۆك كۆماری ئێران (١٩٨٩ـ١٩٩٧)، لە ژێر ناونیشانی یەكێتی ستـراتیژیك، بۆ ئاوەدانكردنەوەی وڵات لە پاش شەڕی هەشت ساڵە و بە مەبەستی گەشەسەندنی ئابووری، هەوڵی داوە بۆ دروستكردنی پەیوەندییەكی توندوتۆڵ لەگەڵ وڵاتانی رووسیا، هیندستان و چین، تاوەكو بتوانێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەتـرسییەكانی ڕۆژئاوا و بە تایبەت ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، هاوپەیمانی ستـراتیژیكی هەبێت، هەرچەندە ئەم هەوڵانە بە هۆی رازی نەبوونی ئەم وڵاتانە بۆ بەرنگاربوونەوەی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و دروستكردنی بلۆكێك لە دژی ڕۆژئاوا، شكستی خوارد (ثقفی عامری، ١٣٨٦: ص٧٦ـ٧٥). لە قۆناغی سەرۆكایەتی خاتەمی (١٩٩٧ـ٢٠٠٥)دا، هەرچەندە تەعامول و نزیكی لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپا لە ئەولەویەتی سیاسەتی خاتەمی دابوو، بەڵام گۆشە نیگایەكیش بەرەو ئاراستەی ڕۆژهەڵات بە هۆی هاوبەشی قەومی و زمانی و مەزهەبی لەگەڵ ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز، بوونی هەبوو و لە لایەكیش كۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵی پەرەسەندنی پەیوەندییەكانی لەگەڵ رووسیا دەدا و لە چووار ساڵی یەكەمی سەرۆكایەتیەكەیدا، هەشت بەڵگەنامەی هاوكاری لەگەڵ رووسیا ئیمزا كرا (ثقفی عامری، ١٣٨٦، ص٨٠).

هەروەها لە سەردەمی سەرۆكایەتی ئەحمەدی نەژاد (٢٠٠٥-٢٠١٣)دا، بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ گوشارەكانی سیستەمی نێونەتەوەیی و هەروەها نۆرم یان پێوەرەكانی ڕۆژئاوایی كە لە ڕوانگەیەكی بەها تەوەر و ئایدۆلۆژیاییەوە دەیڕوانیە پەیوەندییەكانی كۆماری ئیسلامی و ڕۆژئاوا، كۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵی دەدا كە سیاسەتی ڕۆژهەڵاتگەرایی، لە ڕووی جوگرافیایی ـ ئایدولۆژیەوە پەیڕەو

بکات، کە بە بڕوای ئێران، ئەمەش بە جۆرێك هەماهەنگ و هاوتەریبە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیان. لە لایەکی تـرەوە جیاوازی و ناکۆکییەکانی هەندێ لە وڵاتی ئەمریکای لاتین، وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، رووسیا و هیندستان، چین وپاکستان، کە لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەیانە. کە ئەم سیاسەتەش بە کردەوە تووشی شکست بوو وکێشە و گیر وگرفتی زۆری بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران دروستکرد. ئەوەی کە کۆماری ئیسلامی ئێران و رووسیا لە یەکتـری نزیك دەکاتەوە، هەوڵدانیانە بۆ دوورکردنەوەی نفووز و دژایەتی هێژموونی و کۆنتـرۆڵی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ناوچەکە، هەوەها نفووزی ڕێکخراوی ناتۆ لە سنوورەکانیان کە لە ڕوانگەی هەردوو وڵات مەتـرسیدارە، هەرچەندە چۆنیەتی ڕوانینیان بۆ پرس و بابەتەکان و هەروەها بەرژەوەندییەکانیان تارادەیەك جیاوازە. بەڵام هۆکاری نزیکبوونەوەیان ئەوەیە کە رووسیا هەوڵ دەدات هێژمون و دەسەڵات و نفووزی خۆی لە ئاستی ناوچەکە و تەنانەت ئاستی نێونەتەوەییدا بە دەستبخاتەوە و گوشارەکانی کۆمۆنیستەکان و توندڕەوەکان و ڕای گشتی لە ناوخۆ کەمتـر بکاتەوە. کۆماری ئیسلامی ئێرانیش بە هۆی جۆری ناسنامە، ئامانج و بەرژەوەندییەکانی، هەروەها ململانێ و دژایەتییەکانی لەگەڵ ڕۆژئاوا بە تایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل، پێویستی بە هاوکاری و بەهێزبوونی پەیوەندی لەگەڵ رووسیادا هەیە (مؤسسه بين المللى مطالعات دریای خزر،١٣٨٧: ص٢٨). ئەمە جگە لە پرسی دۆسیەی ئەتۆمی کۆماری ئیسلامی ئێران کە بۆ ئێران پاڵپشتی و هاوکاری رووسیا زۆر گرنگ و پربایەخە، چ لە ڕووی تەکنۆلۆژیاوە و چ لە ڕووی داکۆکی و پاڵپشتی کردن لە ئاستی نێونەتەوەییەوە.

### (٤-٥-٢)- ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز:

ستـراتیژی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە هەمبەر وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز پاش کۆتای هاتنی جەنگی سارد تا ڕادەیەك لە ژێر کاریگەری مەتـرسییە ئاسایشییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیلدایە. هەروەها ئێران جەخت لە سەر هاوکاری ئابووری و کولتووری لەگەڵ وڵاتانی ئەم ناوچەیە دەکاتەوە، بەڵام بە گشتی پەیوەندییەکانیان لە ژێر کاریگەری فاکتەرەکانی پەیوەندی ئێران و روسیا، ڕۆڵی جوگرافیای سیاسی و کولتووری ئیسلامی، نفووز و پەیوەندی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ ئەم کۆمارانەدایە (حاجی یوسفی، ١٣٨٤: ص١٢). لێرەو دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی بەربەستەکانی بەردەم سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ناوچەی ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز، بەم شێوەیەدەستنیشان بکەین:

١ـ جیاوازی لە سیستەمە سیاسییەکانی ئەو وڵاتانە و کۆماری ئیسلامی ئێران.

٢ـ ئایدۆلۆژیای سیاسی جیاواز.

٣ـ ململانێی ناوچەیی بۆ نفووز و کۆنترۆڵی ناوچەکە لە نێوان خودی وڵاتانی ناوچەکە.

٤ـ دەستێوەردان و بوونی ئەکتەرە بەهێزە ناوچەییەکان، وەك رووسیا و چین.

٥ـ بوونی ئەکتەرە سەروو ناوچەییەکان، وەکو: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە دەیەوێت ڕێگە لە نفووزی کۆماری ئیسلامی ئێران و رووسیا لەو ناوچەیە بگرێت و هەروەها ڕۆڵی یەکێتی ئەوروپا و پەیوەندییە ئابوورییەکانی

لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکە و پرسی ئاسایشی وزە، کە بۆ ئەورووپییەکان زۆر گرنگ و هەستیارە وئەم ناوچەیەش لە ڕووی نەوت و غازەوە زۆر دەوڵەمەندە.

٦ـ ڕۆڵی تورکیا لە ناوچەکە و هەوڵەکانی بۆ کەمکرنەوەی نفووزی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ناوچەکە و ململانێ لەگەڵ ئێران لە سەر پرسی پشتێنەی تورکی و پەیوەندی قووڵی کولتووری، زمانی، ئایینی و ئابووری و...هتد، لەگەڵ وڵاتانی ئەم ناوچەیە.

٧ـ ڕۆڵی پاکستان و عەرەبستان لە ناوچەکە و یارمەتیدانی گروپە ئیسلامییە سوننەکان وەکو: حزبی النصرت، بزوتنەوەی ئیسلامی ئۆزبەکستان، حزبی التحریرالاسلامی، گروپی ئەکرەمیە و بزوتنەوەی ئاسیای ناوەڕاست، لە وڵاتانی ئۆزبەکستان، تاجیکستان، قرقیزستان و کازاخستان، کە کۆماری ئیسلامی ئێران ئەم گروپانە بە هەرەشە و مەترسیان دەزانێت.

٨ـ ڕۆڵی ئیسرائیل و پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوڵەتانی ناوچەکە (علویان و کوزەگر، ١٣٨٨: ص٦ـ٥).

## (٤ .٦)- کۆماری ئیسلامی ئێران و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست:

دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی گرنگترین بابەت و پرسەکانی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ناوچەکەدا بەم شێوەیە پۆلین بکەین:

١- داهاتووی پرۆگرامی ئەتۆمی ئێران. ٢- بوونی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هێزەکانی تر لە ناوچەکە. ٣- پرسی عێراق و داهاتووی دەوڵەتی عێراق. ٤- پرسی ئەفغانستان. ٥- پرسی تیرۆریزم. ٦- پرسی فەلەستین و ئیسرائیل. هەروەها کۆماری ئیسلامی ئێران لە سیاسەتی دەرەوەی خۆیدا لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا تەعامول لەگەڵ کۆمەڵێك ئەکتەری ناوچەیی و

نێونەتەوەیی، حکومی و ناحکومی دەکات. بە گشتی دەتوانین لێرەدا ئەم ئەکتەرانە بە سەر سێ گروپدا دابەشبکەین:

١- ئەکتەرە دەوڵەتییە ناوچەییەکان: ئازەربایجان، ئوردن، ئۆزبەکستان، ئیسرائیل، ئەفغانستان، ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی، بەحرین، پاکستان، تورکیا، سوریا، عێراق، سعوودیا، عومان، فەلەستین، قەتەر، کویت، لوبنان، میسر، یەکێتی عەرەب و ئەنجومەنی هاوکاری دەوڵەتانی کەنداوی عەرەبی.

٢- ئەکتەرەکانی ناحکومی ناوچەیی: القاعدە و گروپەکانی چەکداری سوننە، گروپەکانی چەکداری دژی ئێران لە عێراق (بۆ نموونە: حیزبە کوردیەکانی ڕۆژهەڵات)، بەعسیەکان، حەماس، جیهادی ئیسلامی و حیزبوڵڵا.

٣- ئەکتەرە دەوڵەتیە نێونەتەوەییەکان: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، بریتانیا، ئەڵمانیا، رووسیا، فەرانسا، چین، یەکێتی ئەوروپا، ڕێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی، ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و ناتۆ (لطفیان، ١٣٨٧: ص١٩٩). بە شێوەیەکی گشتی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ئاستی ناوچەییدا بە سەر چوار تەوەردا دابەشدەبێت یان بە مانایەکی تر، کۆماری ئیسلامی ئێران چوارجۆر پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکەدا هەیە، کە دەتوانین بەم شێوەیە پۆلینیان بکەین:

١ـ هاوکاری و بەشداری و پەیوەندی نزیك لەگەڵ هەندێ دەوڵەتی عەرەب (وەك سوریا).

٢ـ دروستکردنی پەیوەندییەکی پراگماتیستی لەگەڵ تورکیا و پاکستان بە تایبەت دەربارەی پرسی کورد لەگەڵ تورکیا و پەرەپێدانی پەیوەندی ئابووری و بازرگانی.

٣ـ دژایەتی لەگەڵ هەڵوێست و سیاسەتەکانی دەوڵەتانی کەنداو و دەوڵەتانی عەرەبی هاوپەیمانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ڕۆژئاوا.

٤ـ دوژمنایەتی و دژایەتی توند و جیددی لە هەمبەر ئیسرائیل و پاڵپشتی لە بزوتنەوەکانی دژی ئیسرائیل (احتشامی، ١٣٧٨: ص٧٤). بەم پێیەش کۆماری ئیسلامی ئێران لە سیاسەتی دەرەوەی خۆیدا، بە پێی زەینییەت یان بنەما هزرییە ناسنامەییەکانی و تێگەیشتن لە پرس و بابەت و ئاستی مەترسی و هەڕەشەکان بۆ سەر کۆماری ئیسلامی ئێران، خوێندنەوە بۆ پاراستنی ئاسایشی خۆی لە ڕێگەی جۆری پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکەدا دەکات، کە بە گشتی بە سەر دوو بازنەی ئاسایشیدا دابەشی دەکات.

**(٤ـ٦ـ١)- بازنەکانی ئاسایشی هەرێمی:**

**(٤ ـ٦ـ١ـ١)- بازنەی خێرای ئاسایشی:**

ئەم بازنە ئاسایشییە بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران لە دراوسێکانی پێکدێت کە بە پێی ئاستی هەڕەشە و مەترسی هێزە بێگانەکان لە ناوچەکە و سروشتی بابەت و پرسە سیاسی و ئابووری و کولتوورییەکان، دەبێتە هۆی خۆڵقاندنی دەرفەت یان هەڕەشە و کێشە بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران، ناوچەی کەنداو و عێراق وەك دوو نموونە لە گرنگترینیانن. هەرچەندە ئەفغانستان، پاکستان، تورکیا و ناوچەی قەوقاز و ئاسیای ناوەڕاست هەریەکەیان بە پلەی جیاواز خاوەن گرنگی ستراتیژین بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران، بەڵام بۆ نموونە ناوچەی کەنداو وەك ناوچەی(دەرەوەی نزیك)[1]لە هێڵی یەکەمی ستراتیژی بەرگری کۆماری ئیسلامی ئێراندایە. تایبەتمەندییەکانی ئەم ناوچەیە بە شێوەیەکە کە دەرفەت یان هەڕەشەی زۆر بۆ بەرژەوەندی و ئاسایشی نەتەوەیی ئێران دەخولقێنێت. ئەم ناوچەیە بە هۆی دەوڵەمەندی لە بواری نەوت و غاز، خاڵی سەرەکی پەیوەندی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ جیهانی دەرەوە بووە و بەم پێیەش خاڵی لاوازی

1 The Near Abroad

ئاسایشی بەرگری، سیاسی و ئابووری كۆماری ئیسلامی ئێران هەژمار دەكرێت. (بـرزگر، ١٣٨٨: ص١٣٧).

بە گشتی پەیوەندییەكانی كۆماری ئیسلامی ئێران و وڵاتانی عەرەبی كەنداو لە ژێر كاریگەری چەند فاكتەردایە:

١ـ زەینییەتی مێژوویی لە پەیوەندییەكانی ئێران و عەرەبەكان، كە بەردەوام لە لایەن ئێرانەوە هەوڵی كۆنتــڕۆڵ كردنیان دراوە.

٢ـ دڵەڕاوكێ و نەبوونی متمانە لە هەمبەر كۆماری ئیسلامی ئێران و پرسی دەستێوەردان لەو وڵاتانە و مەتــرسی هەناردە كردنی شۆڕشی ئیسلامی.

٣ـ نەبوونی هێزێك بۆ هاوسەنگی كردن یان دروستكردنی هاوسەنگی و كۆنتــڕۆڵی كۆماری ئیسلامی ئێران لە ناوچەكە بە تایبەت پاش روخانی ڕژێمی سەدام حوسێن لە ساڵی (٢٠٠٣).

٤ـ هاوپەیمانییەتی و پەیوەندی ئەو دەوڵەتانە لەگەڵ ڕۆژئاوا بە گشتی و ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە تایبەت.

٥ـ بەهێزبوونی سەربازی و ئەتۆمی كۆماری ئیسلامی ئێران.

٦ـ پرسی وزە و ئاسایشی وزە لە كەنداو و بە گشتی كۆنتــڕۆڵ و ئاسایشی كەنداو (ملك محمدی و داودی، ١٣٩١: ص٣٣٥ ـ٣٣٣). یەكێك لە گەورەتــرین كێشەكانی كۆماری ئیسلامی ئێران لە سیاسەتی دەرەوەدا ئەوەبووە كە ئێران لە ناوچەكەدا هاوپەیمانی ستــراتیژیكی نەبووە، بەم واتایەی كە ئێران لە نێوان عەرەبەكان، توركەكان و دەوڵەت-نەتەوەكانی تــردا بووە، بەڵام بەشێك نەبووە لە هیچكامیان. هەروەها بۆ زیاتــركردنی نفووز و بەرزكردنەوەی پێگە و زیادكردنی هێزی خۆی زۆر گرنگی بە فاكتەری ئایین بە تایبەت شیعەگەرایی دەدات (رشنو، ١٣٩١: ص٤٧٢). هەرچەندە ڕێبەرانی كۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵ دەدەن لە پەیوەندییەكانی دەرەوەیاندا شۆڕش و سیستەمی خۆیان ئیسلامی بناسێنن و

ڕەگەزی شیعە لە هەمبەر وڵاتانی سوننەدا بشارنەوە وجەخت لە سەر برایەتی موسوڵمانان و یەکێتی جیهانی ئیسلام بکەنەوە، بۆ نموونە ئایەتوڵڵا خامنەیی لە وتەیەکدا دەڵێت: ((دوژمنانی ئۆمەتی ئیسلامی دەیانەوێت ئێمە وەك هەڕەشە بۆ دراوسێیە ئیسلامییەکانمان بناسێنن تاوەکو ناکۆکی لە نێوان ئۆمەتی ئیسلام دروستبکەن، بەڵام شیعە و سوننە پێکەوە دژی ئیستکباری جیهانی خەبات دەکەن و...هتد)) (حسینی، ١٣٨٧: ص٨٧٦).

لە لایەکی تــرەوە عێراقیش بەشێکی تـری هەرە گرنگ لە بازنەی خێرای ئاسایشی کۆماری ئیسلامی ئێران هەژماردەکرێت. ئێران گۆڕانکاریە سیاسییەکانی عێراق بە تایبەت پاش ساڵی (٢٠٠٣) و پرسە ئایدۆلۆژی و ئاسایشییەکانی بە بەشێکی جیانەکراوە لە ئاسایشی نەتەوەیی خۆی دەزانێت. هەروەها پرسە هەڵپەسێردراوەکانی رێککەوتنامەی ساڵی (١٩٧٥)ی ئەلجەزائێر لە نێوان ئێران و عێراقدا، پرسە چارەسەرنەکراوەکانی سەردەمی جەنگی هەشت ساڵەی نێوانیان، ڕۆڵی هێزەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق و پێکهاتەی سیاسی ـ نەتەوەیی و ئایدۆلۆژی و مەزهەبی لە عێراق، هەموویان بۆ ئاسایشی نەتەوەیی کۆماری ئیسلامی ئێران زۆر گرنگن. بۆیە ئێران هەوڵ دەدات لە ماوەی کورتخایەندا لە نێوان فاکتەرەکانی جیۆپۆلەتیك و ئایدۆلۆژیادا، جۆرە هاوسەنگییەك دروستبکات، هەرچەندە کۆماری ئیسلامی ئێران لە عێراقدا هەوڵی بەهێزکردنی شیعەکان بۆ کۆنتــڕۆڵی ناوچەکە دەدات (بــرزگر، ١٣٨٨: ص١٣٩). بە گشتی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە عێراق پاش ساڵی (٢٠٠٣) دوو تەوەر لە خۆ دەگرێت:

ا ـ سیاسەتی ناسەقامگیرکردن و لاوازکردنی عێراق: بە هۆی ئەوەی کە عێراق لە ساڵانی پێشوو بە هۆی فاکتەری وزە، پێکهاتەی دانیشتوان و جوگرافیای سیاسی و... هتد، سەرچاوەی هەڕەشە و مەتــرسی بووە بۆ سەر ئێران بەڵام بە

سیاسەتی ناسەقامگیركردنی عێراق، ئەم ناسەقامگیریە وادەكات كە كۆماری ئیسلامی ئێران توانای دەستێوەردان و نفووزی لە عێراق هەبێت و هەڕەشەی ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا بە هۆی ئەم ناسەقامگیریە بۆ سەر كۆماری ئیسلامی ئێران كەمتــر بكاتەوە.

ب- سیاسەتی سەقامگیری ڕێژەیی: ئێران بڕوای وایە كە بە هۆی بالأدەستی شیعەكان لە عێراق دەتواندرێت مەتــرسی و هەڕەشەكان لە سەر ئێران كەمبكرێتەوە و هاوسەنگییەكەی نێوان كورد و سوننە و شیعە لە بەرژەوەندی كۆماری ئیسلامی ئێراندایە. چونكە ئەگەر هاوسەنگی و ناسەقامگیریە لە كۆنتــڕۆڵ دەربچێت بە هۆی نفووزی وڵاتانی سوننە و سەربەخۆییخوازی كوردەكان و ڕۆڵی ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا لە عێراق ئەوە هەڕەشە و مەتــرسی بۆ سەر ئاسایشی ئێران دەبێت. ( بــرزگر، ١٣٨٣: ص٢١).

### (٤ ـ٦ـ١ـ٢)- بازنەی ناخێرای ئاسایشی:

ئەم بازنەیە ژینگەیەكی دوورتــری ئاسایشی كۆماری ئیسلامی ئێران پێكدێنێت، كە بۆ نموونە سعودیا، توركیا، سوریا، لوبنان، ئۆردون و فەلەستین و...هتد، لە خۆدەگرێت، سیاسەتی ئێران لەو ناوچانە بۆ بەهێزكردنی توانای كۆماری ئیسلامی ئێرانە بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی و ئاسایشی نەتەوەیی خۆی لە بازنەی خێرای ئاسایشی ئێراندا. بۆیەشە كە هاوپەیمانی سوریا و كۆماری ئیسلامی ئێران لە ڕوانگەی ئاسایشی و بەرژەوەندییەكانی ئێرانە بۆ سڕینەوەی هەڕەشە و مەتــرسیەكانی هاوبەشی ئیسرائیل و ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا یاخود پاڵپشتی لە حیزبوڵڵا لە لوبنان، هەروەها پشتیوانی لە بزوتنەوەی حەماس لە فەلەستین. لێرەدا دەتوانین بڵێین كە كۆماری ئیسلامی ئێران لە ئایدۆلۆژیا كەڵك وەردەگرێت بۆ بەرژەوەندی و ئامانجەكانی كە

فۆرمێکی ریالیستی وەردەگرێت بەڵام لە ڕاستیدا، ناسنامەیی و ئایدۆلۆژیکیە. (بـرزگر، ١٣٨٨: ص١٤٠). گۆڕانکارییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەت لەم ساڵانەی دوایی بووە هۆی ئەوەی کە مەزهەبی شیعە وەك هێزێکی کاریگەر دەربکەوێت و ڕۆڵی کۆماری ئیسلامی ئێران ئەمەی بەرجەستەکردووە، هەر لە ڕووخانی سەدام حوسێن لە ساڵی (٢٠٠٣) تا جەنگی سی وسێ ڕۆژەی حیزبوڵڵا لە لوبنان لەگەڵ ئیسرائیل لە ساڵی (٢٠٠٦)دا، گۆڕانکاری جیۆپۆلەتیکی لە بەرژەوەندی کۆماری ئیسلامی ئێران دروستکردووە. (حسینی، ١٣٨٧: ص٨٧٣). لە ڕوانگەی وڵاتانی سوننی و نوخبە سیاسییەکانیانەوە، ئامرازی سەرەکی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ نفووز و کۆنتـڕۆڵی ناوچەکە، گروپە شیعەکانی لایەنگری ئێرانن لە ناوچەی کەنداو، عێراق، سوریا، لوبنان، بەحرین، سعودیا و...هتد. گرنگی و هەستیاری ئەم ناوچانە بە تایبەت لە ڕووی ئاسایشی وزەوە، ئەم پرسەی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش زۆر هەستیار کردووە. بۆ نموونە مەلیك عەبدوڵڵای دووەم پاشای ئۆردن، لە ساڵی (٢٠٠٤)دا رایگەیاند کە هیلالی شیعی مەتـرسییەکە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەخاتە ژێر هەڕەشەوە. هەروەها وەزیری دەرەوەی ئۆردنیش ئەم مەتـرسییەی دروستبوونی هیلالی شیعی لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە بۆ کۆنتـڕۆڵی عێراق، سوریا، لوبنان، سعودیا، بەحرین و...هتد، دووپاتکردەوە (قاسمی، ١٣٨٩: ص٧٧). لێرەوە بە ڕوونی ڕۆڵی ناسنامە و دوواتـر درووستبوونی بەرژەوەندی لە سەر بنەمای ئەم ناسنامەیە و بەم پێیە درك و تێگەیشتن لە دۆست، دوژمن و هەرشە، لە سیاسەتی دەرەوەدا دەردەکەوێت، کەلێرەدا ئاماژە بە چەند نموونەیەك دەکەین.

کۆماری ئیسلامی ئێران و سعودیا دوو دەوڵەتی کاریگەری ناوچەکە و دەوڵەمەندن لە ڕووی سەرچاوەکانی نەوت و غاز و خاوەن پێگەی گرنگی ستـراتیژیکن لە ناوچەکەدا. هەروەها ئێران و سعودیا بە دوو ناوەندی شیعە و

سوننی لە جیهانی ئیسلام و هەروەها دوو جەمسەری کولتووری و هزری و مەزهەبی هەژماردەکرێن. پێش شورشی ئیسلامی ئێران، سعودیا و ئێران دوو ستوونی دۆکتۆرینی نیکسۆن بۆ پاراستنی ئاسایش و دژایەتیکردنی کۆمۆنیزم لە ناوچەکە بوون. ئێران لە ڕووی چەك و سیاسییەوە و سعودیاش لە ڕووی ئابووری و داراییەوە، بەڵام پاش ساڵی (١٩٧٩)وە، بە هۆی سیستەمی سیاسی نوێی ئێران و سیاسەتی دژەڕۆژئاوایی و سەربەخۆییخوازی ئێران و پرسەکانی هەناردە کردنی شۆڕش و دژایەتی سیستەمی نێونەتەوەیی لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێران و هەروەها جۆری پەیوەندییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و پرسی ئیسرائیل، ئەم هاوکێشەیە تێکچوو (نادری نسب، ١٣٨٩: ص٣١٦). پەیوەندی سعودیا و ئێران بە کۆمەڵێك هەوراز و نشێودا تێپەریوە، بە تایبەت پاش شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە ساڵی (١٩٧٩) و دەستپێکردنی جەنگی ئێران و عێراق و پاڵپشتی سعودیا لە ڕووی دارایی و چەکەوە لە عێراق، ئەم پەیوەندییانە بارگرژی تێکەوت. بە پێی ئامارەکان سعودیا لەم جەنگە هەشت ساڵەیەدا بە بـڕی (٣٠) میلیار دۆلار یارمەتی عێراقیداوە لە دژی ئێران، هەروەها لە ساڵی (١٩٨٧)دا، بە هۆی شەڕوپێکدادان لە نێوان حاجیەکانی ئێرانی و هێزەکانی سعودیا لە شاری مەککە و کوژرانی چوارسەد حاجی ئێرانی پەیوەندییەکانیان پچڕا، تاوەکو ساڵی (١٩٩١). هەروەها سعودیا لە ڕێکخراو و دامەزراوە جیاجیاکاندا وەکو: ڕێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی، یەکێتی عەرەب، ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو، بزوتنەوەی بێلایەنەکان و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا دەنگی بۆ ئەو بڕیارانەی کە لە دژی کۆماری ئیسلامی ئێران دەرچووە داوە (زراعت پیشه، ١٣٨٤: ص٦٢).

بە گشتی خاڵە ناکۆکەکانی سعودیا و کۆماری ئیسلامی ئێران لە چەندین پرسدا خۆی دەبینێتەوە، وەکو: بانگەشەی ڕێبەرایەتی جیهانی ئیسلام، پرسی

سەرچاوەکانی وزە (نەوت و غاز) و هەناردە کردنی کە لەگەڵ سیاسەتەکانی وزەی کۆماری ئیسلامی ئێران یەکناگرێتەوە، هاوپەیمانییەتی سعودیا لەگەڵ ڕۆژئاوا بە گشتی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تایبەت، لە بوارە جیاجیاکانی سیاسی و ئابووری و سەربازی، هەروەها ڕۆڵی سعودیا لە دژایەتیکردنی کۆماری ئیسلامی لە ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو و مەترسیەکانیان لە بەهێزبوونی ئێران (نادری نسب، ١٣٨٩: ص٣٢٢). هەروەها ئاڵوگۆڕە ناوچەییەکان وەك لە ناوچوونی ڕێژیمی سەدام حوسێن و پاڵپشتی و پشتیوانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە دەسەڵاتی شیعەکانی عێراق لە لایەك و پاڵپشتی لە سوننەکان لە عێراق لە لایەن سعودیاوە، خاڵێکی تری جێگەی ناکۆکیە. ترس و دڵەڕاوکێی سعودیا لە هاندانی شیعەکانی ئەم وڵاتە دژی سیستەمی دەسەڵاتی سوننەی سعودیا لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە خاڵێکی تری جێگەی ناکۆکییانە. هەروەها پرسی چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستینیەکان کە هەر دوو دەوڵەت گۆشەنیگا و ئامانج و بەرژەوەندی و مەبەستی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ نموونە سعودیا پاڵپشتی لە پرۆژەی ئاشتی نێوان ئیسرائیل و فەلەستینیەکان دەکات کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بە گشتی ڕۆژئاوا و کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی پاڵپشتی و چاودێری دەکات. ئەمەش لەگەڵ سیاسەتەکانی دژایەتی ئیسرائیل و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە ناگونجێت (سلیمانی، ١٣٧٩:ص١٨٨). هەروەها پاڵپشتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە بزوتنەوەی حەماس لە فەلەستین لە ڕووی دارایی و چەکەوە یاخود لە ڕووی سیاسییەوە جێگەی نیگەرانی سعودیایە، کە خوازیاری بینینی ڕۆڵی گەورەتـرە لە پرسەکانی ناوچەکە و بە تایبەت لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامیدایە یاخود ناکۆکی سعودیا و کۆماری ئیسلامی ئێران لە پرسی لوبنان و پاڵپشتی ئێران لە گروپە توندڕەوەکان، وەك حیزبوڵڵا لە دژی هێزەکانی تـری لایەنگری ڕۆژئاوا و

سعودیا (شجاع، ١٣٨٥: ص٤٩). لە پرسی ئەتۆمی کۆماری ئیسلامی ئێراندا، سعودیا هەم بە تەنیا و هەم لە ڕێگەی ئەنجوومەنی هاریکاری کەنداوەوە، بەردەوام دژایەتی و دڵەڕاوکێیەکانی خۆی دەربارەی پرۆگرامی ئەتۆمی کۆماری ئیسلامی ئێران ڕاگەیاندووە (مستقیمی و ابـراهیمی، ١٣٨٦: ص ٢٧٥). دڵەڕاوکێیەکانی سعودیا لە هەمبەر پرۆگرامی ئەتۆمی کۆماری ئیسلامی لە دوو ڕوانگەوە سەرچاوە دەگرێت، یەکەم: ئێرانی خاوەن چەکی ئەتۆمی دەتوانێت هاوسەنگی هێزی ناوچەیی لە بەرژەوەندی خۆی بگۆڕێت، ئەمەش هەڕەشەیە بۆ سەر ئاسایشی وڵاتانی ناوچەکە. دووەم: لە ڕووی ژینگەییەوەیە، کە لە ئەگەری هەر ڕووداو یان هێرشێکی سەربازی بۆ سەر دامەزراوە ئەتۆمیەکانی ئێران مەتـرسی بۆ سەر وڵاتانی کەنداو و سعودیا دروست دەبێت. (نادری نسب، ١٣٨٩: ص٣٨٩).

دەوڵەتی تورکیاش لە ناوچەکە دەکەوێتە ناو ئەو بازنە ئاسایشییەوە و پەیوەندییەکانی تورکیا و کۆماری ئیسلامی ئێران سەرەڕای هاوسنووری، بەڵام بەردەوام لە نێوان هاوکاری و ململانێ و کێبـرکێدا هاتووچۆ دەکات، دەتوانین بڵێین کە گرنگتـرین فاکتەرەکانی کاریگەر لە پەیوەندییەکانیاندا بـریتین لە :

١ـ دەرهاویشتەکانی جەنگی دووەمی کەنداو ساڵی (١٩٩٠) و جەنگی سێیەمی کەنداو ساڵی (٢٠٠٣) لە ناوچەکە.

٢ـ کێبـرکێ لە نێوان تورکیا و کۆماری ئیسلامی ئێران لە ناوچەی قەوقاز و ئاسیای ناوەڕاست.

٣ـ کاریگەری پەیوەندی تورکیا و ئیسرائیل و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ناتۆ.

٤ـ فاکتەری نەتەوەیی کورد و تورك لە هەردوو وڵات هەروەها ئیسلامگەرایی و ئایدۆلۆژیا.

٥ـ گۆڕانکاریە سیاسییە ناوخۆییەکانی تورکیا هەروەها کۆماری ئیسلامی ئێران.
٦ـ ڕووداوی یازدەی سێپتەمبەری (٢٠٠١) و شەڕی دژە تیرۆر (اگهری، ١٣٨٢: ص٢٥٩).

ململانێیە جیۆپۆلەتیکیەکان نێوان تورکیا و کۆماری ئیسلامی ئێران جگە لە پرسی ئایدۆلۆژیای جیاوازی زاڵ لە سیستەمی سیاسی هەردوو وڵاتدا، کاریگەری لە سەر پەیوەندییەکانیان هەبووە. ئەمە جگە لە پرس و دڵەڕاوکێیە هاوبەشە ئاسایشییەکانیان، بۆ نموونە لە سەر پرسی کورد و بەهێزبوونی هەرێمی کوردستان-عێراق، بەڵام هەوڵەکانی تورکیا بۆ ئەندامیەتی لە یەکێتی ئەورووپا و ڕۆڵی تورکیا لە ناتۆ و هەوڵەکانی تورکیا بۆ بەهێزترکردنی خۆی لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەویی لە لایەك، هاوکاری و هاوپەیمانی لەگەڵ ئیسرائیل و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لایەکی تـرەوە کاریگەری لە سەر ئەم پەیوەندیانە هەبووە. ئەمە جگە لە مەترسییەکانی بەهێزبوونی ئێرانێکی ئیسلامی ـ شیعی و فاکتەری هیلالی شیعی لە ناوچەکە بۆ تورکیا (اطهری، ١٣٨٢: ص٢٧٦).

### (٤ ـ٦ـ٢)- کۆماری ئیسلامی ئێران و شۆڕشەکانی وڵاتانی عەرەبی:

بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ وڵاتانی ئیسلامی ناوچەکە بە هۆی نەبوونی متمانە بە یەکتـری، کێشە و گرفتی قەومی و مەزهەبی، هەروەها جۆری پەیوەندی ئەم وڵاتانە لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل ئاڵۆز و پڕکێشەیە، بە تایبەت لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی (سریع القلم، ١٣٧٩: ص٧١). بۆ نموونە کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ یەکێك لە بەهێزتـرین وڵاتی عەرەبی ـ ئیسلامی واتا میسر، بەردەوام کێشەی هەبووە و نزیك بە سێ دەیە پەیوەندیان نەبووە، بە هۆی جۆری

پەیوەندییەكان و بەرژەوەندی جیاوازی ئەم دوو وڵاتە لە هەمبەر ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و ئیسرائیل و جیاوازی و ناكۆكی لە بۆچوونیان لە هەمبەر ئیسلامی سیاسی و ناسیونالیزم و پرسی تیرۆریزم و...هتد، تەنانەت كۆتایی هاتنی جەنگی هەشت ساڵەی نێوان ئێران و عێراق و باشتـربوونی پەیوەندی ئێران و سعودیاش نەیتوانیوە كۆتایی بە ململانێی نێوان ئەم دوو وڵاتە بێنێت (سریع القلم، ١٣٧٩: ص٨٠). لە پەیوەندی لەگەڵ گۆڕانكارییەكانی ئەم دواییەی ناوچەكە كە بە بەهاری عەرەبی ناسراوە، ئایەتوڵڵا خامنەیی ڕێبەری كۆماری ئیسلامی ئێران ئەو ڕووداوانە بە ڕەنگدانەوەی شۆڕشی ئیسلامی ئێران دەزانێت و بڕوای وایە كە دەبێت ڕێگە بگرین كە ئەم شۆڕشانە لە لایەن وڵاتانی ڕۆژئاوایی و هاوپەیمانە ناوخۆییەكانیان دەستی بە سەردا بگیرێت. لە لایەكی تــرەوە شێوەی حوكمڕانی لەم وڵاتانە دەبێت بە ئاراستەی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی و شۆڕشی ئیسلامی ئێران بێت (حاجی یوسفی، ١٣٩١: ص١٤٠). بە واتایەكی تـر ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران و بنەماخوازەكان لە كۆماری ئیسلامی ئێراندا، دەربارەی شۆڕشی وڵاتانی عەرەبی بڕوایان هەیە بە ١- بە شۆڕشی ئیسلامی زانیین (هەستانەوەی ئیسلامی). ٢- بە خۆرسك زانینی ئەم گۆڕانكاریانە. ٣- بە جەماوەری بوونی ئەم شۆڕشانە. ڕوانگەیەكی تـر لە كۆماری ئیسلامی ئێراندا بوونی هەیە كە لە ڕوانگەی تیۆری پیلانگێری، دەڕواننە ئەم شۆڕشانە و ڕایان لە سەر ئەم گۆڕانكاریانە ئەوەیە كە ئەمە بە پیلانی ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكای دەزانن و لە سەر ئەم بڕوایەن كە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە درێژەی پلانەكانی خۆی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و پاراستنی ئاسایش و مانەوەی ئیسرائیل دەیەوێت داواكارییەكانی خەڵك لە دژی دیكتاتۆرەكانی ناوچەكە كۆنتـڕۆڵ بكات تاوەكو بتوانێت ئەم ڕق و تووڕەییەی جەماوەری ناوچەكە لە دژی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و ئیسرائیل لە

کۆنتــڕۆڵ دەرنەچێت (حاجی یوسفی، ١٣٩١: ص١٥٠). سیاسەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە هەمبەر شۆڕشەکانی ناسراو بە بەهاری عەرەبی بەم شێوەیەیە کە ئاڕاستەیەك کە لە ئەنجوومەنی نوێنەران، دامەزراوەی ڕێبەری، دەسەڵاتی دادوەری، ئیمامانی جومعە و بە گشتی بنەماخوازەکان پێکدێت، ئەم شۆڕشانە بە درێژکراوەی شۆڕشی ئیسلامی ئێران و(ڕاپەرینەکانی فەلەستین) دەزانن و زیاتــر لەم چەمکانە کەڵك وەردەگرن: بزوتنەوەی جەماوەری، شەپۆلی هەستانەوە، وشیاری جەماوەری، هەستانەوەی ئیسلامی، گەرانەوە بۆ بەهاکانی ئیسلامی، شۆڕشەکانی ناوچەکە، شۆڕشی جەماوەری و...هتد. دەرهاویشتەی ئەم تێگەیشتنەش لە سیاسەتی دەرەوەدا خۆی لە پشتیوانی لەم گۆڕانکاریانە و دروستکردنی پەیوەندی و سازدانی سمینار و کۆنفرانسی جیاجیا وهەروەها دروستکردنی ئەمینداریەتیبەردەوامی لە ژێر ناونیشانی (ئەنجومەنی ڕاوێژکاری کۆمەڵەی جیهانی هەستانەوەی ئیسلامی)، خۆی دەبینێتەوە. بەڵام ڕوانگەیەکی تــر بۆ گۆڕانکارییەکان کە ئەم شۆڕشانە بە پیلانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، دەزانن ئەم چەمکانە بەکاردێنن: شۆڕش، بزوتنەوەی داوکاری جەماوەری، داواکاری ئاشتیانە و....هتد، کە ئەمە وادەکات دەرهاویشتەی لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا ببێتە هۆکاری هەوڵدان بۆ دروستکردنی پەیوەندی دیپلۆماتیك لە چوارچێوەی دەوڵەت ـ دەوڵەت و هەروەها یارمەتی بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان لەگەڵ نارازییەکان بۆ ئەوەی حکومەتی ئەو وڵاتانە نەڕووخێت یاخود یارمەتی حکومەتەکان دەدەن بۆ ڕووبەڕووبونەوەی بەرهەڵستکاران، بۆ نموونە دەوڵەتی سوریا (حاجی یوسفی، ١٣٩١: ص ١٥٩-١٦٠). لێرەوە دەردەکەوێت کە کۆماری ئیسلامی ئێران دەیەوێت هاوسەنگییەك دروستبکات لە نێوان خۆگونجاندن و کۆنتــڕۆڵی گۆڕانکاریەکان و هەروەها پاراستنی هاوسەنگی هێز لە ناوچەکە لە ڕێگەی بنەما

بەهاییە ئیسلامییەكان و دژایەتی ڕۆژئاوا، بەڵام لە بەرژەوەندی خۆیدا، كە لێرەوەش ڕۆڵی فاكتەرە ماناییەكان و هەروەها ناسنامە و كاریگەریان لە دروستبوونی بەرژەوەندی لەم هاوكێشانەدا بەرجەستە دەبێت.

## (٤.٧)- پرۆگرامی ئەتۆمی كۆماری ئیسلامی ئێران:

پرۆگرامی ئەتۆمی ئێران دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شای ئێران لە ساڵی (١٩٥٧). لەو سەردەمەدا هەوڵەكانی ئێران بۆ بەدەستهێنانی وزەی ئەتۆمی لە نێوان ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا و ئێراندا دەستپێكرد و تەنانەت ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا چەند كیلۆگرام یۆرانیۆمی پیتێنراوی فرۆشت بە ئێران و لە بواری بەكارهێنانیشدا هاوكاری كرد (عیمانحەمە، ٢٠١٢: ص٧١). لەو سەردەمەدا كە پەیوەندییەكانی ئێران و ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە لوتكەی توندوتۆڵی دابوو، ئامانجی ئەو پرۆگرامە پاراستنی بەرژەوەندی نەتەوەیی ئێران و بەرگری لە هەڕەشەكانی دراوسێكانی باكوور و ڕۆژهەڵاتی ئێران، واتا یەكێتی سۆڤیەت، هیندستان و پاكستان بوو، كە دواتر لە سەردەمی كۆماری ئیسلامیدا جێگەیاندا بە ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا و دەوڵەتی ئیسرائیل. هەروەها ئامانجی ئێران لەو سەردەمەدا، پرسی كۆنترۆڵی نرخ و داهاتی نەوت و غاز، هەروەها پرسی دۆزینەوەی وزەی جێگرەوەی نەوت و غاز بوو بۆ داهاتووی ئێران (پهلوی، ١٣٧١: ص١٥٨ـ١٥٧).

ئێران لە ساڵی (١٩٥٨)وە بۆتە ئەندامی ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی و لە ساڵی (١٩٦٧)یشەوە لە زانكۆی تاران كورەیەكی پێنج مێگاواتی خرایەكار و دواتر لە ساڵی (١٩٧٦)دا، ئێران گرێبەستی كرینی دوو كورەی (١٢٠)مێگاواتی بۆ وێستگەی ئەتۆمی بوشهری لەگەڵ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا واژۆ كرد، هەروەها هەر لەم ساڵەدا، دوو كورەی (٩٠٠) مێگاواتیشی لە وڵاتی فەرانسا كڕی و لە شاری

بەندەرعەباس دایمەزراند. پاش ڕووخانی ڕژێمی شا لە ساڵی (١٩٧٩) پرۆگرامی ئەتۆمی ئێران لە لایەك بە هۆی دابڕانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ڕووی نێونەتەوەییەوە و لە لایەك بۆردومانکردنی دامەزراوەکانی لە لایەن عێراقەوە تاوەکو ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی رابـردوو راوەستا. هەروەها ڕوانگەی ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامی ئایەتوڵڵا خومەینی، کە بڕوای وابوو کە ئێرانی ئیسلامی پێویستی بەم جۆرە دامەزراوانە نییە و ئەمە بە پێچەوانەی ئیسلامە و پرۆژەیەکی تاغوتییە (عثمان حەمە، ٢٠١٢: ص٧٥-٧١).

لە پاش شۆڕشی ساڵی (١٩٧٩)وە، چەندین جار هێرش کرایە سەر بنکەی ئەتۆمی بوشهر و دەوڵەتانی ڕۆژئاواش ئەم پرۆژەیان وەستاند، دواتـر ڕووسیا بەم کارە هەستا، هەرچەندە بە گشتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە پاش ئەزموونی جەنگی هەشت ساڵەدا، دوو سـتراتیژی گشتی لە بواری سەربازی و وزەدا، گرتۆتەبەر، یەکەم: پەرەپێدانی پیشەسازی سەربازی و دووەم: سیاسەتی پەرەپێدانی وزەی ئەتۆمی، کە لە هەردوو بواری سەربازی و جێگرەوەی وزەی نەوت و غازدا بەکاردێت، هەرچەندە کۆماری ئیسلامی ئێران رایگەیاندوە کە پرۆگرامی ئەتۆمی ئەم وڵاتە بۆ مەبەستی ئاشتیخوازانەیە و مەتـرسی بۆ هیچ وڵاتێك نییە، بەڵام ئەمە بە پێچەوانەی بیروڕای وڵاتانی ڕۆژئاواییە (اسدی بیژن،١٣٨٦: ص١١). پاش کۆتایی هاتنی جەنگی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێران لە ساڵی (١٩٨٨)دا، کۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵێکی زۆری خستەگەڕ بۆ پێشخستنی بەرنامە ئەتۆمیەکەی، ئەوەش لە میانەی ئەو هەوڵە گشتگیرانەی کە دەیدا بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو زەرەر و زیانانەی کە لە ماوەی جەنگ لێیکەوتبوون، بە تایبەت قەرەبوو کردنەوەی لاوازییەکانی لە بواری هێزی سەربازی (عثمان حەمە، ٢٠١٢: ص٧٧-٧٦).

لە ساڵی (٢٠٠٢)دا، ڕێكخراوی موجاهیدینی خەڵقی ئێران، كە بارەگای سەرەكییان لە فەرانسا بوو، دوو دامەزراوەی نهێنی ئەتۆمی ئێرانیان ئاشكرا كرد، ئەوانیش دامەزراوەیەكی پیتاندنی یۆرانیۆم لە شاری نەتەنز و وێستگەیەكی ئەتۆمی كە بە ناوی قورس كاری دەكرد لە شاری ئەراك، هەروەها كۆگایەكی یۆرانیۆمی خاو لە ناوچەی سەجاد لە شاری یەزد (فلاحی، ١٣٨٦: ص٨٢). دواتر لە ساڵی (٢٠٠٢)دا، ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ڕێگەی مانگی دەستكردەوە، وێنەی دامەزراوە ئەتۆمیەكانی نەتەنز و ئەراكیان بلاوكردەوە و ئێرانیان تۆمەتبار كرد كە هەوڵی بەدەستهێنانی چەكی ئەتۆمی دەدات. ئەوەبوو كە لە ساڵی (٢٠٠٣)دا، ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی لە ڕاپۆرتێكدا ڕایگەیاند كە كۆماری ئیسلامی ئێران پەیماننامەی قەدەغە كردنی بلاوبوونەوەی چەكی ئەتۆمی (NPT) پێشێل كردووە (عیمان حەمە، ٢٠١٢: ص٨٠). دواتر لە هەشتی مارچی ساڵی (٢٠٠٦)دا، لە ژێر گوشاری ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و پاڵپشتی بەریتانیا و ئەڵمانیا و فەرانسا، دۆسیەی ئەتۆمی ئێران لە لایەن ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمیەوە نێردرایە ئەنجومەنی ئاسایشی ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان و یەكەم بڕیاری ژمارە (١٦٩٦)، لە ساڵی (٢٠٠٦)دا، لە ئەنجومەنی ئاسایش لە دژی كۆماری ئیسلامی ئێران درا، كە لەم بڕیارەدا پرۆگرامی ئەتۆمی ئێران بە تەمومژاوی وەسفكرا و بە جێگەی نیگەرانی دانراوە و لە مادەی پێنجی ئەم بڕیارەدا، لە هەموو وڵاتان داواكرا كە خۆیان بپارێزن لە هەناردە كردنی هەر جۆرە كاڵایەك كە كۆماری ئیسلامی ئێران دەتوانێت لە بواری پیتاندنی یۆرانیۆم و بواری مووشەكی بەكاری بێنێت، بەڵام بەردەوامی كۆماری ئیسلامی ئێران لە جێبەجێ نەكردنی بڕیارەكان وایكرد كە بڕیارەكانی ژمارە (١٧٣٧، ١٧٤٧، ١٨٠٣، ١٨٣٥) و لە كۆتاییدا بڕیاری ژمارە (١٩٢٩) لە لایەن ئەنجومەنی ئاسایشەوە دژی كۆماری ئیسلامی ئێران

بدرێت. بە شێوەی گشتی ئەم بڕیارانە ئابلۆقەی دارایی و تەکنۆلۆژی و سەربازی لە دژی سیستەمی بانکی و هێزە چەکدارەکانی ئێران بە تایبەت سوپای پاسداران و تاکەکانی پەیوەندیدار بە چالاکییە ئەتۆمیەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە خۆ دەگرێت، تەنانەت سەرۆك ئۆباماش کۆماری ئیسلامی ئێرانی بە هۆی سیاسەتەکانییەوە بە هەڕەشەیەکی نائاسایی دژی ئاسایشی نەتەوەیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێناسەکرد (مشیرزاده و جعفری، ١٣٩١: ص٦٦).

ئەم شاردنەوەیەی چالاکییە ئەتۆمیەکانی کۆماری ئیسلامی ئیران، ڕۆژئاوا و بە گشتی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی نیگەران کردووە. لە ڕوانگەی ڕۆژئاواوە، پرۆگرامی ئەتۆمی ئێران لە سەر بەرهەم هێنان و پیتاندنی یۆرانیۆم و پلۆتۆنیۆم کە دوو مادەی خاوی بەرهەمهێنەری چەکی ئەتۆمیە دامەزراوە، بە تایبەت کە کۆماری ئیسلامی ئێران تا ساڵی (٢٠٠٣) ئەم چالاکیانەی شاردبۆوە و بە نهێنی ئەنجامیدەدا و دواتریش نوێنەرانی ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی چەند نموونەیان لە بنکەی نەتەنز تاقیکردەوە کە ئەم پیتاندنانەی نیشاندەدا، هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەی خستۆتە ڕوو کە ئێران ساڵانە هەشت تا دە کیلۆگرام پلۆتۆنیۆم بەرهەم دێنێت کە بۆ دروستکردنی یەك یان دوو بۆمبی ئەتۆمی گونجاوە (محسنی و صالحی، ١٣٩٠: ص٦١٨).

هەوڵەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ دەستپێراگەیشتن بە توانای بەرهەمهێنانی وزەی ئەتۆمی یان وەکو ڕۆژئاوا ڕایگەیاندووە، چەکی ئەتۆمی و شاردنەوەی چالاکییە ئەتۆمیەکانی لە کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی، ئێستاکە گەورەترین خاڵی کێشە و ململانێ نێوان کۆماری ئیسلامی ئێران و ڕۆژئاوایە.

بە شێوەیەکی گشتی کۆماری ئیسلامی ئێران لەم ساڵانەی دوواییدا هەوڵەکانی لە پرۆگرامی ئەتۆمی لە سەر سێ بنەما چڕکردۆتەوە:

١ـ ئاراستەی بەرەو ئەکتەرەکانی تری نێونەتەوەیی، وەکو چین و رووسیا و هەوڵدان بۆ دەرهێنانی کۆنترۆڵی دۆسیەکە لە ژێر دەستی وڵاتانی رۆژئاوا.

٢ـ دەرهێنانی دۆسیەی ئەتۆمی لە پرۆسەی بەسیاسی بوونەوە و هەوڵدان بۆ دروستکردنی چوارچێوەیەکی یاسایی لە بازنەی ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی لە سەر بنەمای بەڵگەنامەکان، وەکو: (NPT) و رێککەوتننامەکانی ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی و پرۆتۆکۆلەکان و ...هتد.

٣ـ هەوڵدان بۆ بەردەوامی و پاراستنی بازنەی سوتەمەنی ئەتۆمی و دووبارە دەستپێکردنەوەی بەشێك لە چالاکییەکانی ئەتۆمی کە پێشتر هەڵپەسێردرابوو (فلاحی، ١٣٨٦: ص ٦٧).

سەرەڕای جەختکردنەوەی بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی ئێران دەربارەی ئاشتیانە بوونی پرۆگرامی ئەتۆمی ئەم وڵاتە، بەڵام دەبێت ئەوە لە بەرچاو بگرین کە سیستەمی سیاسی کۆماری ئیسلامی ئێران سیستەمێکی شۆڕشگێرانە، ئایدۆلۆژیا تەوەر، ئایدیالگەرا و لە سەر بنەمای بەها، پێوەر، ئامانج و ڕوانگەکانی سەروو نەتەوەیی درێژمەودایە، کە دروشمەکان، ئایدیاکان، ئامانجەکان و سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە زیاتر لە سێ دەیەی رابردوو هەموویان دەربری ئەم ڕاستییەن، کەئەمەش کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی نیگەران کردووە (ایزدی، ١٣٧١: ص١٣٥). هەروەها تایبەتمەندیەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران، وای لە وڵاتانی ڕۆژئاوا و تەنانەت وڵاتانی ئیسلامیش کردووە کە کۆماری ئیسلامی ئێران وەك وڵاتێکی مەترسیدار و دژی بەرژەوەندی و ئاسایشی نەتەوەیی خۆیان هەژمار بکەن. هەروەها ڕەفتارەکانی کۆماری ئیسلامی ئێرانیش بە هۆی ناسنامەی بڕوایی و مەزهەبی سیستەمە سیاسییەکەی، لە سەرەتای شۆڕشی ئیسلامییەوە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیلی وەکو دوژمنانی ئیسلام و دژی ئاسایشی نەتەوەیی خۆی ناساندوە و بەرپرسانی باڵای

کۆماری ئیسلامی ئێران باس لە ڕەتکردنەوەی ڕووداوی هۆلۆکۆست و سرینەوەی دەوڵەتی ئیسرائیل لە سەر نەخشەی جوگرافیایی جیهان دەکەن، ئەمانە وایکردووە کە ڕۆژئاوا بە گشتی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل بە تایبەت، بە هەموو شێوە و ئامرازێکەوە گوشار بخەنە سەر کۆماری ئیسلامی ئێران و هەوڵی کۆنتڕۆڵکردن یان سنووردارکردنی یاخود تەنانەت هەوڵی ڕووخانیشیانداوە، بەم پێیەش کۆماری ئیسلامی ئێرانیش بە هەموو شێوەیەك لە هەوڵی بە دەستهێنانی هێز، زیاتر کردنی هێز و نیشاندانی ئەم هێزەیە بۆ پاراستن و بەرگریکرن لە مانەوەی خۆی (اسدی، ١٣٨٦: ص ١٦-١٤).

هەڕەشەکانی کۆماری ئیسلامی ئێرانی خاوەن توانای ئەتۆمی یاخود خاوەن چەکی ئەتۆمی، چ ڕاستەوخۆ بێت بۆ سەر ئیسرائیل یاخود ناڕاستەوخۆ لە ڕێگەی گروپەکانی لایەنگری ئێران لە ناوچەکەوە بێت، بۆ سەر ولاّتانی عەرەبی، ولاّتانی ئەورووپی یاخود بنکە سەربازیەکان و بە گشتی بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ناوچەکە و تەنانەت بۆ سەر شارەکانی ولاّتانی ئەورووپی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، زۆر زیاد دەکات. هەروەها بە هۆی کۆنتڕۆڵی ئێران لە سەر گەرووی هۆرمۆز هەروەها هاوسنووری لەگەڵ سەرچاوەکانی گرنگی وزەی جیهان، ئەمانە هەمووی وادەکات کە کۆماری ئیسلامی ئێران بتوانێت ئەوکاتە کۆنتڕۆڵی بەهای نەوت و بازاری جیهانی نەوت بکات (پوراحمدی، ١٣٨٨: ص٧٩).

بۆ شیکردنەوەی هۆکار یاخود پاڵنەری ولاّتانی خاوەن چەکی ئەتۆمی هەروەها ئەو دەوڵەتانەی کە خوازیاری بەدەستهێنانی ئەم تەکنۆلۆژیایەن شەش فاکتەری هاوبەش هەیە کە دەوڵەتەکان هاندەدات:

١- هەستی نەبوونی ئاسایش.

٢- یارمەتیدەربوونی ئەم تەکنۆلۆژیایە بۆ سەرکەوتن لە جەنگ یان ململانێیە نێونەتەوەییەکاندا.

٣- بەرز کردنەوەی پێگە و نفووز و پرستیژی نەتەوەیی.

٤- لە ڕووی ئابوورییەوە سوودی هەیە بە تایبەت دەستەبەر کردنی وزەی کەم نرخ.

٥- گوشارە کۆمەڵایەتی و سەربازیەکانی ناوخۆیی.

٦- پاڵنەری تـر، وەکو ئاشکرا و ڕوون نەبوونی داهاتووی ڕژێم (گاردن، ١٣٨٣: ص١١٨).

لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا هەستی نەبوونی ئاسایش و ئاشکرا و ڕوون نەبوونی داهاتووی ڕژێم لە فاکتەرە بەهێزەکانە سەرەڕای کاریگەری فاکتەرەکانی تـر، کە ئاست و ڕێژەی کەمتـر هەیە. بە شێوەی گشتی پرۆگرامی ئەتۆمی کۆماری ئیسلامی ئێران لە چەند ڕوانگەوە خوێندنەوەی بۆ دەکرێت کە دەتوانین بەم شێوەیە پۆلینیان بکەین:

١ـ ڕوانگەی ریالیستی: ئەم ڕوانگەیە جەخت لە سەر ئەوەدەکاتەوە کە ئەو ژینگە ناسەقامگیرە ناوچەیی و نێونەتەوەییەی، کە کۆماری ئیسلامی ئێرانی تێدایە، ئێران بۆ کۆنتـرۆڵی هەڕەشەکان و بەرزکردنەوەی توانای بەرگری خۆی لەو ژینگە جیۆپۆلەتیکە، هەروەها ئەزمونی جەنگی هشت ساڵەی ئێران و عێراق و کەمکردنەوەی هەڕەشەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل و هەروەها وڵاتانی سوننەی هاوپەیمانی ئەمریکا لە ناوچەکە، وایکردووە کە کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ درێژەپێدان بە مانەوە و بوونی خۆی هەوڵی بەدەستهێنانی ئەم تەکنۆلۆژیایە بدات، بۆ ئەوەی بتوانێت لە ئاستی ناوچەییدا هاوسەنگی لە هەمبەر ئیسرائیل و وڵاتانی تـر دروست بکات. لە ئاستی

نێونەتەوەییشدا توانای بەدواداچوونی بەرژەوەندی و ئامانجەکانی هەبێت و بە گشتی ئاسایشی خۆی بپارێزێت.

٢ـ ڕوانگەی ئابووری: ئەم ڕوانگەیە جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیە ئابووریەکانی وهەروەها بەرهەم هێنانی کارەبا و لە ئەگەری تەواوبوونی وزەی ژێرزەوی (نەوت و غاز) وزەی جێگرەوەی هەبێت. بە گشتی لەم ڕوانگەیەوە ئامانجی کۆماری ئیسلامی ئێران لە پرۆگرامی ئەتۆمی گەشەپێدان یان گەشەسەندن و بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشگوزەرانی و پێگە و پرستیژی خۆیەتی لە ئاستی ناوخۆیی و نێونەتەوەییدا، بۆیە هەوڵی بەدەستهێنانی وزەی ئەتۆمی دەدات.

٣ـ ڕوانگەی کۆنستـراکتیڤیستی: ئەم ڕوانگەیە بەم شێوەیە دەروانێتە ئەم پرۆگرامە کە کۆماری ئیسلامی ئێران بە هۆی سیاسەتی سەربەخۆییخوازی و دادپەروەری تەوەری و دژایەتی بەها و پێوەرە نێونەتەوەییەکان و بە گشتی بنەماکانی ئایدۆلۆژیکی ناسنامەیی کۆماری ئیسلامی ئێران ئەم هەوڵەی ئێران شیدەکاتەوە، بەم مانایە کە ئەگەر بە پێی لۆژیکی سوود و زیانی ماددی بێت، دەبێت کۆماری ئیسلامی تاوەکو ئێستا بە هۆی ئەو هەموو گوشار و ئابلۆقانەی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی دەستبەرداری ئەم بەرنامەیە بوبایە، بەڵام دەبینین کە ئەم پرسە لە سەرووی لۆژیك و عەقلانییەتی ماددی سوود و زیانەوەیە و پەیوەندی بە تێگەیشتن و درکی نوخبەکانی ڕژێم لە خۆیان، دوست و دوژمن، کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی، پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی، دابەشبوونی هێز، هەڕەشە، مەتـرسی، ئاسایش، بوون و مانەوەی سیستەمەکەیان، بە گشتی ناسنامەی کۆماری ئیسلامی ئێران و پاراستن و ئاسایشی ئەم ناسنامەیە و مانەوەی سیستەمە سیاسییە - ئایینییەکەوە هەیە (هادیان، ١٣٨٩: ص ٣٦١ـ٣٦٠).

## (٤ . ٨)- سیاسەتی کولتووریی کۆماری ئیسلامی ئێران:

لە کاتێکدا بە شێوەیەکی گشتی سیاسەتی دەرەوە بەرژەوەندی و ئامانجەکان لە خۆ دەگرێت، دیپلۆماسی ئامرازێکە یان میکانیزمێکە بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانە، هەروەکو چۆن ئابووری، پروپاگەندە، هێزی سەربازی، کولتوور و ئایدۆلۆژیا، وەك ئامرازی سیاسەتی دەرەوە بەکاردێن، بەڵام دیپلۆماسی گشتی بەرفراوانتـرە لە دیپلۆماسی فەرمی و هەموو ئامرازە فەرمی و نافەرمییەکانیش دەگرێتەوە بە تایبەت ئامرازەکانی پەیوەندی و ڕاگەیاندن کە بۆ کاریگەری خستنەسەر ڕای گشتی، جێبەجێ کردنی بەرنامەی ستـراتیژی، بەرنامەی پەروەردە و کولتووری وڵاتێکە بە مەبەستی دروستکردنی پشتیوانی دەرەکی لە سیاسەتی دەرەوەیدا (آلاد پوش و توتونچیان، ١٣٧٢: ص٨). سیاسەتی کولتووریش بـریتییە لە ئاڵوگۆڕی ئایدیاکان، زانیارییەکان، هونەر، شێوەی ژیان، سیستەمی بەهایی و بیروبڕواکان، بۆ بەدەستهێنانی تێگەیشتنی هاوبەش و بەهێزتـرکردنی تێگەیشتنی هاوبەش لە نێوان نەتەوەکان و دەوڵەتەکاندا، بە گشتی بە واتای بەکارهێنانی هێزی نەرم لە سیاسەتی دەرەوەی وڵاتێکدا دێت (خانی، ١٣٨٦: ص٢٢٧). دەتوانین بڵێین کە دیپلۆماسی گشتی لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران بە پێی بنەماکانی هزری حکومەتی ئیسلامی و ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامی ئێرانە، بۆ نموونە ئایەتوڵڵا خومەینی لە وتەکانیدا زیاتـر نەتەوەکان دەکاتە ئامانج، کە واتا سیاسەتی کولتووری کۆماری ئیسلامی، سوود وەرگرتنە لە هێزی نەرم بۆ کاریگەری دروستکردن لە سەر ڕای گشتی وڵاتانی موسوڵمان (هرسیج و تویسرکانی، ١٣٨٨: ص١٧٣).

ئێران بە تایبەت پاش شۆڕشی ئیسلامی ساڵی (١٩٧٩)وە لە سەرنفووزی ئایینی لە وڵاتانی تـر کاردەکات، پێشتـر ئەمە تەنیا لە سەردەمی ئایەتوڵڵا

بـروجردی، گەورە مەرجەعی شیعە کراوە کە نوێنەر و بانگەشەکاری ئایینی ناردۆتە ولاتانی ئەوروپایی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بۆ نموونە: لە سالّی (١٩٥٩)دا، مزگەوتی لە شاری هامبۆرگی ئەلّمانیا دروستکردووە کە بە مزگەوتی (جەعفەری هامبۆرگ) دەناسرێت (ادهم نژاد، ١٣٨٢: ص١٢٠). کۆماری ئیسلامی ئێران ژمارەی دانیشتوانی زیاتـر لە هەفتاوپێنج میلیۆن کەسە کە (٩٨٪) موسولّمانن، کە لە (٨٩٪) شیعە و(٩٪) سوننە و چەندین کەمینەی تـری ئایینی، پێکدێت. کۆماری ئیسلامی ئێران بە هۆی ناسنامە تایبەتەکەیەوە یەکێك لەو ولاتانەیە کە لە ڕووی ئایینی دەتوانێت کاریگەری زۆری لە سەر ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا هەبێت چونکە (٩٢,٩٦٪) لە دانیشتوانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست موسولّمانن و لەم ڕێژەیە نزیکەی (١٨,٩٤٪) مەزهەبی شیعەیان هەیە(هرسیج و تویسرکانی،١٣٨٨: ص١٨٣). یەکێك لە ئامرازەکانی جێبەجێ کردنی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی گرنگی پێدانە بە سیاسەتی کولتووری و هێزی نەرم، بۆ پەرەپێدان و بلاوکردنەوەی بەها و پێوەرەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران هەروەها نفووز لە ولاتانی تـر، دروستکردنی زەمینەی گونجاو بۆ کاریگەری سیاسی و ئابووری و ئاسایشی لە ولاتانی تـردا یاخود ڕەوایەتی پێدان بە سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران و بوون بە نموونەیەك لە حوکمڕانی ئیسلامی سەرکوتوو لە هەمبەر مۆدێلەکانی تـری ڕۆژئاوایی بە تایبەت لە ولاتانی دراوسێ و ئیسلامی ناوچەکە (دهقاني فيروزآبادی، ١٣٨٩: ص ١٠٨).

لە ئەزموونی جەنگی ئێران و عێراق، بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران دەرکەوت کە ئێران دەبێت ئەوە قبولّ بکات کە لە ئاستی نێونەتەوەییدا ئەکتەری بەهێزی جۆراوجۆر هەیە، وەکو: دەولّەتانی دۆست و نەیار، ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان، کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان، ڕای گشتی، ڕاگەیاندن و...هتد، هەروەها سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ژێر ناونیشانی هێرشی کولتووریدا،

دوورەپەرێز و گۆشەگیر بووە و سیاسەتێكی ئینفعالی هەبووە (امین، ١٣٩٢: ص١٦٧).

بە شێوەیەكی گشتی لە پاش ساڵی (١٩٧٩)، كۆماری ئیسلامی ئێران لە رووی ناردنی بانگەشەكەرانی مەزهەبی بۆ دەرەوەی ئێران و پەروەردەكردن و راهێنانیان وەك فاكتەرێكی كولتووری و مەزهەبی زۆرچالاك بووە، كە دەتوانین ئاماژە بە چەندین رێكخراوی كولتووری و پەیوەندی ئیسلامی بكەین، وەكو: رێكخراوی كولتوور و پەیوەندییە ئیسلامییەكان، كە بەشێكی بە ناوی بەرێوەبەرایەتی گشتی ناردنی بانگەشەكارانی مەزهەبی بۆ دەرەوەی وڵات هەبوو( ئێستا ناوی بۆ ناوەندی نێونەتەوەیی بانگەشە گۆردراوە)، ساڵانە سەدان بانگخواز یان بانگەشەكاری ئێرانی و بیانی پەروەردە دەكات و بۆ شوێنە جیاجیاكانی جیهان رەوانەیان دەكات، یاخود ناوەندی كاروباری خێزانی و ژنان كە سەر بە سەرۆكایەتی كۆماری ئێرانە، كە بانگەشەكاری ژن پەروەردە و بۆ دەرەوەی وڵات رەوانەیان دەكات وهەروەها خولی پەروەردەیی جیاجیان بە ناوی باڵیۆزی نوور و سەبا و شەمیم بۆ رێكدەخات، بە مەبەستی راهێنان و ئاشنابوونیان لەگەڵ كاری رێكخراوە نێونەتەوەییەكان یاخود رێكخراوەكانی نێونەتەوەیی ژنان و شێوازەكانی بانگەشەی مەزهەبی. هەروەها لەم پەیوەندییەدا دەتوانین ئاماژە بكەین بە رێكخراوی بانگەشەی ئیسلامی، زانكۆی نێونەتەوەیی مصگفی لە شاری قوم، رێكخراوی مەعاریفی ئیسلامی ئیمام رەزا و دامەزراوەی ناوەندی جیهانی بڵاوكردنەوەی كولتوور و مەعاریفی ئیسلامی بانگەشە، كە زیاتـر لە بواری بانگەشە و بڵاوكردنەوەی مەزهەبی شیعە لە سەر ئینتەرنێت كاردەكات، هەروەها رێكخراوی حەج و زیارەت كە لە وڵاتانی سعودیا، عێراق و سوریا نوێنەرایەتی هەیە و بودجە و ئامارەكانی نەهێنین (احمدی و لطفی، ١٣٨٩: ص ١١٢-١١١)

لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ دەرەوەی سنوورەکانی خۆی کەناڵەکانی ئاسمانی جامی جەم (١، ٢، ٣)، العالم، سەحەر، الکوثر و پرێس تیڤی دامەزراندوە، کە بە ناوچەی دەرەوەی سنووری ڕێکخراوی دەنگ و ڕەنگی کۆماری ئیسلامی ئێران دەناسرێت. هەروەها بە زیاتـر لە سی زمان رادیۆی هەیە لە دەرەوەی وڵات بۆ وڵاتانی عەرەبی، ئیسلامی، ئەفریقایی، ئەوروپایی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەروەها دەیان پێگەی ئەلکتـرۆنی هەیە لە تۆری ئینتەرنێتدا بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی بیرۆکە و ئایدۆلۆژیای ئیسلامی و ناساندنی شۆڕشی ئیسلامی و هزری ڕێبەرانی ئایینی کۆماری ئیسلامی ئێران و کاریگەریدانان لە سەر ڕای گشتیی وڵاتانی تـری جیهان (مجتهد، ١٣٨٦: ص٢٤). لە بواری چالاکییە جۆراوجۆرەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە دەرەوەی سنوور، دەتوانین ئاماژە بە کۆمەڵەی مانگی سووری کۆماری ئیسلامی بکەین کە (٢٦) نەخۆشخانەی لە وڵاتانی تـردا هەیە، هەروەها وەزارەتی جیهادی ئاوەدانکردنەوە لە نێوان ساڵانی (١٩٨٦ـ١٩٩٩)دا، لە وڵاتانی جیاوازدا لە بواری دابینکردنی دەرمان و دروستکردنی نەخۆشخانەدا کاریکردووە. ئەمە بێجگە لە دامەزراوەی کۆمیتەی ئیمدادی ئیمام خومەینی کە لە وڵاتانی ئەفغانستان، ئازەربایجان، عێراق، لوبنان، سوریا، تاجیکستان و فەلەستین، نوێنەرایەتی هەیە و یارمەتی دارایی و پزیشکی دەداتە خەڵك، هەروەها وەزارەتی جیهادی ئاوەدانکردنەوە نوێنەرایەتی دەرەوەی سنوورەکانی لە وڵاتانی ئاسیایی (لوبنان، ئەفغانستان، پاکستان) و ئەفریقا (تانزانیا، غانا، سودان و گامبیا) و لە ئەورووپا (بۆسنە و ئەلبانیا) کردۆتەوە، ئەمە بێجگە لە ڕێکخراوەکانی سەر بە سوپای پاسدارانی شۆڕشی ئیسلامی کە لە بواری ئەندازیاری و بیناسازی و ئاوەدانکردنەوە لە دەرەوەی ئێراندا کار دەکەن (احمدی و لطفی، ١٣٨٩: ص١١٥). ئەم چالاکیانە ئەوە نیشاندەدات کە کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ سوود

وەرگرتن لە هەلكەوتەی جیۆپۆلەتیكی خۆی بنەما و ڕەگەزەكانی ئیسلامی و شیعی خۆی بە میكانیزمی جۆراوجۆر بەكاردەهێنێت تا لە دەرەوەی سنوورەكانیدا رۆڵی كاریگەر ببینێت و بوارەكانی كولتووری و مەزهەبی و پزیشكی و ئاوەدانكردنەوە و ڕاگەیاندن و ڕای گشتی وەك بەشێك لە ئامرازەكانی جێبەجێ كردنی سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران لە خزمەت ئایدیا و بەرژەوەندییە باڵاكانی ئەم ڕژێمە دایە، بەم مانایە كە كۆماری ئیسلامی ئێران بەم ناسنامە تایبەتەی خۆی لە ڕێگەی هێزی نەرمەوە هەوڵی كاریگەری و شوێندانەری لە دەرەوەی سنوورە جوگرافیاییەكانی خۆی دەدات. هەروەها لەم ڕێگەیەوە بنەمای بانگەشە(دعوە) كەبنەمایەكی هزری و فیقهی شیعەیە جێبەجێ دەكات، بەڵام بە میتۆد و ئامرازی سەردەمیانە.

كۆماری ئیسلامی ئێران لە پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی ناوچەكە بە تایبەت وڵاتانی ناوچەی كەنداو لە ڕێگەی سیاسەتی كولتوورییەوە، هەوڵی زیاتـركردنی كاریگەری ئێران و زیاتـركردنی نفووزی دەدات، ئەمەش بە پێی ئەو هاوبەشیە ئایینی و مێژووییانە و نزیكی جوگرافیایی و بوونی ئێرانییەكان و شیعەكان لەم وڵاتانەدا، هەروەها لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕی بازرگانییەوە. بەڵام سیاسەتی كولتووری و نفووز كۆماری ئیسلامی ئێران لە لایەن ئەم وڵاتانەوە ڕووبەڕووی چەند بەربەستێك دەبێتەوە، بۆ نموونە:

١ـ بێ متمانەیی بەرامبەر بە ئێران بە تایبەتی پاش شۆڕشی ئیسلامی و جەنگی ئێران و عێراق و دەستێوەردان لە كاروباری ئەم وڵاتانەدا.

٢ـ ئایدۆلۆژی و سیاسی بوونی كولتووری ئێرانی، لەم وڵاتانەدا كە زۆرینەیان سوونئە مەزهەبن و ئەم وڵاتانە كولتووری ئێرانی و شیعەی سیاسی و شۆڕشی ئیسلامی بە مەتـرسی و هەڕەشەی سیاسی ـ ئاسایشی دەزانن.

٣ـ ناسیۆنالیزمی عەرەبی و پان عەرەبیزم، کە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی سیاسی لە لایەن ئەو وڵاتانەوە پەیڕەو دەکرێت بە تایبەت دەستیێوەردانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە لوبنان و فەلەستین.

٤ـ بوونی کێشە و ناکۆکی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ ئەم وڵاتانە بۆ نموونە: ئیماراتی یەککگرتووی عەرەبی و ئێران کێشەیان لە سەر دورگەکانی (تنب اکبر، تنب اصغر و ابو موسی) هەیە.

٥ـ بوونی جۆرێك لە سەلەفیگەری توندڕەو و وەهابیەتی سیاسی، هەروەها ئایدۆلۆژیای سیاسی تایبەتی سوننە، وەك (اخوان المسلمین) لە دژی ئیسلامی سیاسی شیعی و شۆڕشگێرانەی کۆماری ئیسلامی.

٦ـ سیاسەتی کولتووری ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و بە گشتی بەها و نۆرمە لیبراڵەکانی ڕۆژئاوایی و هاوپەیمانییەتی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەگەڵ ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و ڕۆژئاوا.

٧ـ ڕۆڵی ڕاگەیاندنی بەهێزی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە دژی سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران (دهقانی فیروزآبادی، ١٣٨٩: ص١١٦ـ١١٥).

لە کۆتایی ئەم بەشەدا، هەروەکوو (د.سیف زادە) دەڵێت، ئێمە دەتوانین ڕەفتارەکانی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران بە سەر چوار جۆر، دابەش بکەین:

١- ئایدۆلۆژیك: بە گشتی دژی ڕۆژئاوا و بە تایبەت ئیسرائیل و ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا.

٢- تاکتیکی و کاتی: قبوڵ کردنی بڕیاری (٥٩٨)ی ئەنجومەنی ئاسایش، هاوکاریکردن لە جەنگی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق و ئەفغانستان و ... هتد.

٣- ئایدۆلۆژیك – تاکتیکی: لە پرس و قەیرانەکانی قەوقاز و ئاسیای ناوەڕاست.

٤- ستـراتیژیك- ئایدۆلۆژیك: لە دەریای خەزەر، لە وڵاتانی عەرەبی بە تایبەت سوریا و لوبنان یاخود قەیرانەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا (سیف زادە، ١٣٨٤ : ص ١٨٨).

لێرەوە دەتوانین بڵێین کە بە پێی تیۆری کۆنستراکتیڤیزم، کۆماری ئیسلامی ئێران لە سیاسەتی دەرەوەی خۆی لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەییدا، بە پێی ناسنامە تایبەتە ئێرانی - ئیسلامی و شیعی - شۆرشگێڕانەکەی، لە سیاسەتی دەرەوەدا ڕەفتار دەکات و بڕیاروەردەگرێت یاخود بەرژەوەندییەکانی پێناسە دەکات، هەوڵ بۆ مانەوە و پاراستنی ئاسایشی خۆی دەدات، هەروەها پەیوەندییەکانی لە سەر بنەماکانی هزری، بەهایی، پێوەری و بەگشتی ناسنامەییانە(بە هەردوو فاکتەری ماددی و مانابییەوە) یاخود پێکهاتەیی و بکەرایەتی، دادەمەزرێنێت. لێرەوە هۆکارەکانی دژایەتی و دوژمنایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران بەرامبەر رۆژئاوا بەگشتی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل بەتایبەت، بۆمان دەردەکەوێت، بەم پێیەش ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە پەیوەندییەکانی ناوچەیی و سەروو ناوچەیی ئاشکرا دەبێت، واتا سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، لە سەر بنەمای تێڕوانین بۆ بەها، پێوەر، پێکهاتە و بکەرەکانی تری نێونەتەوەیی، هەروەها دەرفەت، هەڕەشە و مەترسییەکانی سیستەمی نێونەتەوەیی، لە ژێر کاریگەری ئەم تێگەیشتنەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە خۆی و لە ئەوی ترە ناسنامەییەکەی دایە. بۆیەش بە مەبەستی زیاتر شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی بنەماکانی هزری رەفتارەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران لە بەشی داهاتوودا ڕەگەزەکانی کاریگەر لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، دەخەینەڕوو و بەپێی چوارچێوەی تیۆری کۆنستراکتیڤیستی شیکردنەوەیان بۆ دەکەین.

## (٥) ـ ڕەگەزەکانی کاریگەر لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران:

بە شێوەیەکی گشتی بە بـڕوای جێمز ڕۆزێنا[١]، سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتان لە ژێر کاریگەری پێنج بگۆڕ یاخود فاکتەردایە:

١ـ تاك: کە تایبەتمەندیەکانی تاکی بڕیار وەرگر لە خۆ دەگرێت و ئەوانەی سیاسەتەکان جێبەجێ دەکەن. ئەم فاکتەرە هەموو ڕەهەندەکانی تاکی بڕیار وەرگر وەکو: بەهاکان، تواناکان و ئەزموونەکانی پێشووتـری تاك لە خۆ دەگرێت و وادەکات کە بڕیارەکانی سیاسەتی دەرەوەی یان ڕەفتارەکەی لە دروستکەرانی بڕیاری تر جیاواز بێت.

٢ـ ڕۆڵ: ڕۆڵی بڕیار وەرگر لە خۆ دەگرێت، واتا بە بێ ئەوەی کە گرنگ بێت کە ئەو کەسە چ تایبەتمەندیەکی کەسی هەیە، بەڵکوو گرنگ پێگە و کاریگەری ئەو ڕۆڵەی کە هەیەتی خوێندنەوەی بۆ دەکرێت.

٣ـ بگۆڕەکانی حکومەتی: ئاماژە بەو ڕەهەندانەی پێکهاتەی حکومەت دەکات کە بڕیارەکانی سیاسەتی دەرەوە سنووردارەدەکات یان زیاتـریان دەکات، بۆ نموونە کاریگەری پەیوەندی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و دەسەڵاتی یاسادانان لە

---

١ـ بۆ زانیاری زیاتر بروانە:

Rosenau, James. N. (1971), **The Scientific Study of Foreign Policy**; New York: The Free Press, Pp.36-231.

سیاسەتی دەرەوەدا یاخود پێکهاتە و سیستەمی سیاسی نموونەی بگۆڕەکانی حکومەتیە.

٤ـ بگۆڕی کۆمەڵگە: ئاماژە بەو ڕەهەندە ناحکومیانە دەکات کە لە لایەن کۆمەڵگەوە کاریگەری لەسەر ڕەفتاری دەرەکی هەیە، وەك هەڵوێستە بەهاییەکانی زۆرینەی کۆمەڵگە، یەکێتی نەتەوەیی و ئاستەکەی و ئاستی پیشەیی بوون و...هتد، کە کاریگەری هەیە لەسەر ناوەڕۆکی ئامانج و ئایدیا و سیاسەتە دەرەکییەکانی دەوڵەت.

٥ـ بگۆڕەکانی ژینگەیی: هەموو ئەو ڕەهەندە نامرۆییانەی ژینگەی دەرەکی کۆمەڵگە یان هەر کردەوەیەك کە لە دەرەوە ڕوودات و بابەتەکانی سیاسەتی دەرەوە کە بڕیار وەرگران سنووردارکات یان کاریگەریان لە سەر دابنێت، وەکو: واقعیەتەکانی جوگرافیایی یاخود ئایدۆلۆژیای لایەنە دژەکان کە کاریگەری لە سەر بڕیارەکان دەبێت. بە گشتی ئامانجی (رۆزێنا) تەنیا دەستنیشانکردنی بگۆڕەکانی سیاسەتی دەرەوە نییە، بەڵکوو نیشان دەدات کە هەرکام لەم بگۆڕانە یان فاکتەرانە لە سیاسەتی دەرەوەی وڵاتانی گەورە، بچووك، پێشکەوتوو، دواکەوتوو یان کۆمەڵگەی داخراو و کراوە، چ ڕۆڵێکیان هەیە. بۆ نموونە ناوبراو بڕوای وایە کە لە کۆمەڵگە گەورەکانی پێشکەوتوودا فاکتەرەکانی ڕۆڵ، کۆمەڵگە، حکومەت، سیستەمی نێونەتەوەیی و تاك، دوابەدوای یەك کاریگەریان هەیە، بەڵام لە وڵاتانی دواکەوتوو، فاکتەرەکانی تاك، سیستەمی نێونەتەوەیی، ڕۆڵ، حکومەت و کۆمەڵگە، کاریگەرن (منصوری مقدم و اسمعیلی، ١٣٩٠: ص٢٨٨ـ٢٨٩).

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین کە بە پێی تیۆری کۆنستراکتیڤیزم و ئەم ڕوانگەیەی رۆزێنا، ئەو ڕەگەزانەی کە کاریگەرن لەسەر بکەرایەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە سیاسەتی دەرەوەدا بخەینەڕوو.

### (٥ .١)- وەلی فەقیە (ڕێبەری باڵای شۆڕش):

بنەماکانی هزری ولایەتی فەقیە لە کتێبەکانی ئایەتوڵڵا خومەینی ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران وەکو: (کشف الاسرار)، (ولایت فقیه)، (کتاب البیع) و (تحریر الوسیله) دارێژرا. واتا ڕۆڵ و پێگەی پیاوانی ئایینی لە کاروباری سیاسی و بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتی سیاسی و بە گشتی گرێدانی ئایین و سیاسەت (درخشه، ١٣٨٨: ص٩٥). هەروەها ئایەتوڵڵا خومەینی پێی وابوو کە ئەو بڕوایەی کە دەبێت ئایین لە سیاسەت جیابکرێتەوە و زانا ئایینییەکان دەستێوردان لە سیاسەت نەکەن وتەی ئیستعمارگەرەکانە و ئیسلام هەمووی سیاسەتە و سیاسەتی ئێمە دیانەتە و دیانەتی ئێمەش سیاسەتە (موسوی خمینی، ١٣٧٧: ص١٦). بە بڕوای ئایەتوڵڵا (مطهری) یەکێك لە تیۆریسییەنەکانی حکومەتی ئیسلامی ئێران، ولایەتی فەقیە، ولایەتێکی ئایدۆلۆژیکە، بەڵام خەڵك هەڵیدەبژێرن، ئەوەش واتا دیموکراسی و ئەوە بنەمای کۆماری بوونی کۆماری ئیسلامی ئێرانە و ئەم حکومەتەش کاتییە، تاوەکو سەرهەڵدان و شۆڕشی جیهانی ئیمامی مەهدی (جاوید، ١٣٨٥: ص٧٢).

بە پێی دەستوری کۆماری ئیسلامی ئێران کە لە مادەی پێنجەمی دا هاتووە: ((لە کاتی ئامادە نەبوونی ئیمامی مەهدی وەلی سەردەم، لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا سەرپەرشتیاری کاروبارەکان و پێشەوایەتی ئۆمەت لە ئەستۆی فەقیهێکی دادپەروەر و خاوەن تەقوایە کە ئاگاداری سەردەم و بوێر و بەڕێوەبەر و بەمشوورە کە بە پێی مادەی سەدوحەوت، لە ئەستۆی دەگرێت)) (نخعی، ١٣٧٦: ص١٢٦). بە پێی بنەماکانی هزری فیقهی شیعیەوە، وەلی فەقیە وەکو سەرپەرشتیاری کاروباری موسوڵمانەکان لە ڕێگەی پەیوەندی گشتی لەگەڵ ئیمامی مەهدی، لە لایەن خواوەندەوەیە و فەرمانبەری وشوێنکەوتنی لە سەر

هەموو باوەڕمەندان ئەرکێکی ئایینییە (دهقانی، ١٣٨٦: ص٧٥). چەمکی ولایەت لە ڕوانگەی فەقیهە شیعەکانەوە پەیوەندی بە کولتووری ئیسلامییەوە هەیە، بەم مانایە کە حکومەتی ئیسلامی لە ژێر سێبەری ولایەتدا دەبێت و بە مانای یارمەتی، تەدبیر، ئیمارەت، دەولەت، سولّتان و... هتد، دێت. هەروەها لە زمانی فارسیدا بە مانای سەرپەرەشتی دێت و بە هاوتای حکومەت تەفسیریان کردووە. فیقهی شیعە بڕوای وایە کە حکومەت ڕەهەندی جێبەجێ کاری ولایەتە و لێرەوە ولایەت تەنیا حکومەت ناگرێتەوە بەڵکوو باڵاتـر لە ئەوە، بەڕێوەبـردنی کۆمەڵگە و هەموو بوارەکان لە حکومەت و کۆمەڵگەی ئیسلامیدا لە خۆ دەگرێت و یاسادانان بە پێی شەریعەتی خوا (ئیسلام)دەبێت (پروین و جواهری تهرانی، ١٣٩١: ص٥٠). لەم بارییەوە ئایەتوڵڵا (مصباح یزدی) دەڵێت: (( ئێمە ئەگەر یاسای بنچینەیی کۆماری ئیسلامی قبوڵ دەکەین بەم مانایە نییە کە چونکە خەڵك پەسندی کردووە، بەڵکوو بەم هۆیەیە کە ئەم یاسایە لە لایەن وەلی فەقیهەوە پەسند کراوە و وەلی فەقیەش کەسێکە کە لە ڕوانگەی بیروباوەڕی ئێمە موسوڵمانانەوە (شیعە) لە لایەن ئیمامی زەمانەوە دانراوە و ئەوە وەلی فەقیهە کە ڕەوایەتی دەداتە کۆی یاسا و سیستەمی کۆماری ئیسلامی)) (مصباح یزدی، ١٣٧٨: ص١١٧).

وەلی فەقیە (ڕێبەر) لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا، بە پێی بڕگەی (١، ٢)لە مادەی (١١٠)ی دەستور، دەسەڵاتی دیاریکردنی سیاسەتە گشتییەکانی سیستەم وەك سیاسەتی دەرەوەی هەیە، هەروەها هەموو کاروباری دەرەوە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە ژێر کۆنتـرۆڵ و چاودێری ڕێبەریدایە، وەکو دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و وەزارەتی دەرەوە. ئەمە بێجگە لە ڕاگەیاندنی جەنگ و ئاشتی کە هێمای سیاسەتی دەرەوەن، کە لە مادەی (١١٠)دا لە دەسەڵاتەکانی ڕێبەری کۆماری ئیسلامی ئێراندایە (هاشمی، ١٣٨٨: ص٤٤٩).

لە كۆماری ئیسلامی ئێراندا جەخت لە سەر سەروەری ئیلاهی فەقیە دەكرێتەوە و خەڵك ڕۆڵێكیان لە ڕەوایەتی پێدان بەم حكومەتە نییە، بەڵكوو تەنیا ئەركی بەشداریان لە بەدیهێنانی یان جێبەجێ كردنی بنەماكان و بەرجەستەكردن و هەوڵدان بۆ گەیشتن بە ئامانجەكان چڕدەكرێتەوە. ئەم گوتارەی كۆماری ئیسلامی ئێران، واتا پەیوەندی ڕێبەر (وەلی فەقیە) لە ڕێگەی ئیمامانی مەعسوم بە خوا، ڕێگە لە ڕەوایەتی پێدانی خەڵك بە حكومەت دەگرێت و حوكمرانی تەنیا بە مافی فەقیە دەزانێت و خەڵك دەبێ گوێڕایەڵ بن (پالیزبان، ١٣٨٨: ص١١٧). ڕۆڵی یەكلاكەرەوەی تاك (ڕێبەری شۆڕش) و بنەمای پاراستنی بەرژەوەندی سیستەمی ئیسلامی لە سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێراندا بە ئاشكرا دەبینرێت، بۆ نموونە ستــراتیژی سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران لە جەنگی هەشت ساڵەی ئێران و عێراق و بە سەرنج پێدان بە دروشمەكانی (جەنگ جەنگ تا سەركەوتن)، (ڕێگەی قودس لە كەربەلاوە تێدەپەڕێت)، (جەنگ نیعمەتە)، (ئەگەر جەنگ تەنانەت بیست ساڵیش درێژەی هەبێت ئێمە هەر بەرگری دەكەین)، وادەهاتە بەرچاو كە بە هیچ شێوەیەك و بۆ كەس نییە كە لەم ستــراتیژیە لابدات، بەڵام كاتێك كە بڕیاری (٥٩٨)ی ئەنجومەنی ئاسایش لە لایەن ئایەتوڵڵا خومەینییەوە پەسندكرا، هەموو خەڵكیش ئەمەیان قبوڵ كرد، ئەم ڕۆڵە یەكلاكەرەوەیەی ڕێبەر بەشێكە لە كولتووری سیاسی ئێرانییەكان (زهیری، ١٣٧٩: ص١٢). بە سەرنج پێدان بە پێگەی باڵا و ڕۆڵی وەلی فەقیە لە سیستەمی كۆماری ئیسلامی ئێراندا، ڕۆڵی بكەر لە سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران گرنگی زیاتــری لە بڕیارە سیاسییەكاندا هەیە كە بە هۆی تێگەیشتنی تایبەت لە ئایین و ڕۆڵی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی، ئەم ڕێبەرە سیاسی- مەزهەبیانە لە ئێراندا دەتوانن ببنە هۆی ڕەفتاری جیاوازی سیاسەتی دەرەوە یاخود ناوخۆیی لە كۆماری ئیسلامی ئێران. ئەمەش

بە پێی ڕووداو و گۆڕانکارییەکان یان تێگەیشتنی ئەو ڕێبەرانە لەو ژینگە زەینی ـ ئیدراکییەی دەوروبەریان یاخود بە پێی ئەو بنەما زەینیانەی ناسنامەکەیان، هەروەها ئەو پێکهاتە ماددی و نامادیانەی ناوخۆ و دەرەوەی ئێران دەگۆڕدرێت (سید نژاد، ١٣٨٩: ص١٠). هەروەکو تۆم باتامۆر، کە بڕوای وایە، ئەوە نوخبە سیاسی و ڕێبەرەکانن کە لە وڵاتانی دواکەوتوو یان لە وڵاتانی لە قۆناغی گەشەسەندندا، قسەی کۆتایی دەکەن و زەینییەت و تێگەیشتنی ئەوان ئاراستەی سیاسەتەکان دەکات (باتامور، ١٣٨١: ص ١٠٩). بە پێی ڕوانگەی کۆنستـراکتیڤیزمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم بنەما هزری و بەهایی و بە گشتی ناسنامەییانەیە کە ڕەوایەتی دەداتە ئەو ڕۆڵ و پێگەیەی بکەر(ڕێبەر) لە سیستەمی سیاسی ئێراندا.

## (٢.٥)– ئایدۆلۆژیای ئیسلامی ـ شۆڕشگێرانە:

ئایدۆلۆژیا یەکێك لە گرنگتـرین ڕەگەزەکانی بکەرایەتی نامادی کاریگەرە لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا. ئایدۆلۆژیا لە لایەك بە شێوەی نەرێنی وەکو چەمکێکی ڕەخنەیی خۆی دەردەخات کە جەخت لە سەر شێوازێك لە وشیاری نادروست دەکاتەوە و تێگەیشتنی مرۆڤەکان لە ڕاستییە کۆمەڵایەتییەکان بە لارێدا دەبات. لە لایەکی تـرەوە دەتواندرێت ئایدلۆژیا وەك بابەتێکی ئەرێنی بۆ تێگەیشتن لە جیهانبینی چینێك یان کۆمەڵگەیەك وێنا بکەین (جرویس،١٣٨٧: ص٢٣٢). قامووسی ئۆکسفۆرد، سیاسەتی ئایدۆلۆژی، وەکو بیرۆکە، هزر و ئەندێشەکانی گشتگیر و مەزنی گروپێکی کۆمەڵایەتی دەربارەی جیهانی دەرەوە پێناسە دەکات و کاتۆلیسم، ئیسلام، لیبـرالیزم و مارکسیزم، وەك نموونەی ئایدۆلۆژیا دەناسێنێت (لارین، ١٣٨١: ص٧). ئایدۆلۆژیەکان چوارچێوەیەکن کە لێکدانەوەی تایبەت لە جیهان بە مەبەستی

ڕەفتاركردن بە پێی ئەم لێكدانەوە و ڕوانینە پێشكەشدەكەن و ئەو دەوڵەتانەی كە سیاسەتی دەرەوەیان لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیادا شیدەكرێتەوە، لە دابەشكردنی جوگرافیایی، هێز و نۆرم یان پێوەرەكانی زاڵ لە سەر سیاسەتی نێونەتەوەیی نارازین (قوام، ١٣٨٥: ص١٢١). پەیوەندی ئایدۆلۆژیا و سیاسەتی دەرەوەی هەر وڵاتێك، لە ئەوەدا دەردەكەوێت كە لە هەر سیستەمێكی سیاسی، سیاسەتی دەرەوەی بە هۆی ئایدۆلۆژیای تایبەت سیاسەتێكی دەرەوەی تایبەت بە خۆی پەیڕەو دەكات. هێنری كیسێنجر، وەزیری دەرەوەی پێشووی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بڕوای وایە كە سێ مۆدێلی سیاسەتی دەرەوەمان هەیە كە بـریتین لە: ١ـ كاریزماتیك ـ شۆڕشگێرانە. ٢ـ ئایدۆلۆژیك. ٣ـ پراگماتیك و بیرۆكراتیك (اشتـریان، ١٣٨٢: ص٣٣). هەروەها ماكس ڤیبەر، كۆمەڵناسی ئەڵمانی بڕوای وایە كە ڕۆڵی بیروباوەری مەزهەبی لە ناسنامەی نەتەوەكان بە شێوەیەكە كە تەنانەت مرۆڤی مۆدێرنیش ناتوانێت گرنگی و كاریگەری بیروباوەڕی ئایینی لە سەر كولتوور و تایبەتمەندی ناسنامەی نەتەوەیی ڕەچاو نەكات (وبـر،١٣٧٠: ص١٥٧). ئایدولۆژیا وەك سیستەمێك لە ئەندێشەكان و گریمانەكان شرۆڤەی بەشێك لە كۆمەڵگەی مرۆڤی، تێڕوانینیان لە سەر ڕەگەزەكانی پێكهێنەری جیهانی دەرەوە پێناسە دەكات. واتا ئایدۆلۆژیا لە ئاستی تاك، گروپ و كۆمەڵگەی سیاسی مانا پەیدا دەكات و دەتوانێت پێكهاتەی سیاسی حكومەتێك دیاری بكات. لەم ڕوانگەیەشەوە، كۆماری ئیسلامی ئێران وەك دەوڵەتێكی ئایینی كە خاوەن ئایدۆلۆژیای ئیسلامییە، لە پەیوەندی لەگەڵ ڕەگەزەكانی پێكهێنەری دەولەت ڕوانگەی تایبەت بە خۆی هەیە. لەم ڕوانگەیەدا، دەوڵەتی ئیسلامی پێگە و سەرچاوەی خوایی و ئایینی هەیە، سەروەری ئیسلامیش بە مانای سەروەری ئیلاهیە كە لە سەردەمی ئیمامەكانی شیعە لە

لایەن ئەوانەوە و لە کاتی ئامادەنەبوونیان لە ڕێگەی فەقیهەکان بە نوێنەرایەتی ئیمامەکان بەڕێوە دەبـردرێت (آقا محمدی، ١٣٩٠: ص٢٣).

لە تایبەتمەندییەکانی شۆڕشی ئیسلامی ئێران دووبارە زیندوو کردنەوەی بەها و بیرۆکەی ئیسلامی سیاسی بووە، کە بێجگە لە گۆڕانکاری ڕیشەیی لە سیستەمی سیاسی و کۆمەڵگەی ئێران لە دەرەوەی سنوورەکانیشدا، مانەوەی خۆی لە بڵاوکردنەوە و پەرەپێدانی ئایدۆلۆژیا لە ئاستی ناوچەیی و جیهانی دەزانێت (احمدی و لطفی، ١٣٨٩: ص١٠٨). بە بڕوای ئایەتوڵڵا (مطهری)، وشەی (ئیسلامی) کە ناوەڕۆکی حکومەتی ئیسلامییە لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا بە مانای ئەوەیە کە ئەم حکومەتە بە پێی بنەماکان و یاساکانی ئیسلام بەڕێوە دەچێت، ئیسلامیش قوتابخانەی هزری و ئایدۆلۆژیایە بۆ هەموو ژیانی مرۆڤ (مطهری، ١٣٧٢: ص٨٠). هەروەها ئایەتوڵڵا خومەینی دەربارەی بنەماکانی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران دەڵێت: ((ئێمە دەبێت زۆر بە توندی شۆڕشەکەمان بۆ هەموو جیهان هەناردە بکەین، ئێمە پشتیوانی هەموو بەشخوراوانی جیهانین و هەموو زلهێزەکان بۆ لەناوبـردنی ئێمە هەستاون. ئەگەر ئێمە لە سنوورێکدا بمێنینەوە بە دڵنیاییەوە تووشی شکست دەبین)) (خمینی، ١٣٨٠، صحیفە نور، جلد ٣: ص١٢٧). بە ئایدۆلۆژیا کردنی سیاسەت لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا و ڕەنگدانەوەی لە سیاسەتی دەرەوەدا، دەگەڕێتەوە بۆ بە بنەماکردنی ئیسلام بۆ کاردانەوە بەرامبەر ژینگەی گۆڕاوەی دەوروبەری خۆی کە بە ئامرازی ئایدۆلۆژیا ئەم بۆشاییە پڕدەکاتەوە. لە لایەکی تـرەوە بە ئایدۆلۆژیایی کردنی بارودۆخی ناوخۆ و دەرەوە، هەوڵی شۆڕشگێری و بەهێزکردنی دەوڵەت بۆ ئامانجەکانی دەدات (روآ، ١٣٧٨: ص٣٥). لە ڕوانگەی ئایدۆلۆژیای کۆماری ئیسلامی ئێران، ئایین لە سیاسەت جیا نەکراوەتەوە و ئەم سیاسەتە ئایدۆلۆژێك، ئیسلامییە ـ شیعەیە، هەوڵ دەدات کە سیستەمی نامۆ بەم

ئایدۆلۆژیایە لە ناو بچێت، هەروەها كۆمەڵگەیەك لە ناوخۆ و لە ئاستی جیهانی بێنێتەئاراوە كە لەسەر بنەمای ئەم ئایدۆلۆژیایە بێت، كە ئەمەش ڕەنگدانەوەی هزر و تێگەیشتنی ڕێبەرێكی شكۆمەندە لەم بەستێنە ئیسلامییەدا (دكمجیان، ١٣٧٧: ص٥٥). لە ڕوانگەی ئایدۆلۆژیای كۆماری ئیسلامی ئێران، بۆ تێگەیشتن لە جیهانی دەرەوە و ڕۆڵی موسوڵمانان جەخت لەسەر سێ بابەت دەكرێتەوە: ا- خەلافەت. ب ـ تەكلیف (ئەرك). ج ـ سەروەری. بەم پێیە مرۆڤ جێگری خوایە لە سەر زەوی و موسوڵمانان دەبێت ئەم تەكلیف (ئەركەی) خەلافەتكردنە لە ئەستۆبگرن بۆ سەروەری و جێبەجێ كردنی حوكمی خوا لە جیهان بۆ ئەوەی ئەم ئەركە گرێبدەنە سەروەری خوا دەبێت هەوڵ بدەن حكومەت و سیستەمێك لە سەر بنەمای شەریعەتی ئیسلامی پێكبێنن. بە هۆی ئەوەی كە دەوڵەتی ئیسلامی دەوڵەتێكی بڕواییە، دەبێت جیهان دابەشبكرێت بۆ سەر باوەڕداران (موسوڵمانان)، پەیڕەوانی كتێبی ئاسمانی و كافرەكان. لێرەوە دەوڵەت ـ نەتەوە مانای نامێنێت و سیستەمی نێونەتەوەیی كە لە سەر بنەمای گرێبەست و یاساكانی دروستكراوی مرۆڤ دانراوە، لەگەڵ بنەماكانی ڕەوایەتی ئیسلامی هاوتەریب نییە (صالحی نجف آبادی و رضائی، ١٣٨٨: ص١١).

ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەی ئەو دەوڵەتانەی كە بە شۆڕش یان بزوتنەوەیەك دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست لە ژێر كاریگەری ئەم شۆڕشەدا، ڕەفتارێكی شۆڕشگێرانەیە و ناچێتە ژێر ڕێسا باوەكان یان پێشبینیكردن. شۆرشگێڕەكان دەیانەوێت بنەماكانی شۆڕشەكەیان لە چوارچێوەی سنوورەكانیاندا قەتیس نەمێنێتەوە و هەناردەی دەرەوە بكرێت. بۆیە سروشتی هەرشۆڕشێك پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەیەتی و كۆماری ئیسلامی ئێرانیش كە لە ژێر كاریگەری هزری سیاسی شیعە و ڕوانگەی جیهانگەرایی و دادپەروەری تەوەریدایە، بەردەوام هەوڵی فراوانبوون و دژایەتی پێكهاتە هەنووكەیەكانی سیستەمی نێونەتەوەیی دەكات و

ڕەوایەتی خۆی لە بنەما هزری و فیقهیەکانی شیعە وەردەگرێت، وەکو: (الامر بالمعروف والنهي عن المنكر)، (الدعوة)، (العدالة)، (نفي سبيل) و ...هتد (حسینی،١٣٨٧: ص٨٦٣). کۆماری ئیسلامی ئێران لە سیاسەتی دەرەوەدا هەوڵ دەدات، بنەما ئایدۆلۆژیاییەکانی بۆ دروستکردنی بەرهەڵستکاری لە هەمبەر سیستەمی ڕۆژئاوا پێناسە بکات، بۆ نموونە:

١ـ جەختکردنەوە لە سەر ئیسلام وەکو شێوازی ژیانی گشتگیر و هەمەلایەن.

٢ـ بڵاوکردنەوەی ئەو بڕوایەی کە دەڵێت: قبوڵ کردنی شێوەی ژیانی نائایینی و ڕۆژئاوایی و جیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەت سەرچاوەی هەموو کێشە کۆمەڵایەتی، ئابووری، سەربازی و سیاسییەکانی کۆمەڵگەکانی موسوڵمانانە.

٣ـ بڵاوکردنەوەی ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت: تەنیا لە ڕێگەی گەڕاندنەوەی هێز و شکۆی موسوڵمانان، گەڕانەوەیە بۆ ئیسلام و سەروەری ئایینی ئیلاهی لە جێگەی سەرمایەداری ڕۆژئاوایی و مارکسیزم و سۆسیالیزم و...هتد.

٤ـ ناساندنی دووبارەی شەریعەتی ئیسلامی وەك شێوازێکی کۆمەڵگەیی نموونەیی و کۆمەڵگەیەکی دادپەروەرانە و ئەخلاقی.

٥ـ بانگەشەکردن و بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی جیهاد لە دژی ناڕاستییەکان و نادادپەروەرییەکان و قبوڵ کردنی هەموو ئازارەکانی ئەم ڕێگەیە و تەنانەت شەهید بوون لە ڕێگەی خوا (علیدادی، ١٣٩٠: ص١٧٨).

جێگەی ئاماژەیە کە ئایدۆلۆژیای کۆماری ئیسلامی ئێران بە هۆی زاڵبوونی گوتاری مارکسیستی لە سەر هێزە سیاسییەکانی سەرەتای شۆڕشی ئیسلامی و ئایدۆلۆژیای شۆڕشگێرانەی ئیسلامی – شیعی، خوێندنەوەی تایبەتی بۆ چەمك، پرس و بابەتەکان هەبووە وەکو: دەوڵەت، چین، دادپەروەری، مێژوو، ئابووری، سەرمایەداری و ئیمپریالیزم و سیستەمی نێونەتەوەیی، ڕۆژئاوا و ...هتد (قریشی، ١٣٨٨: ص٢٢٣). بۆیە بە پێی تیۆری کۆنستراکتیڤیزم ئەم سیستەمە

هزریەی كۆماری ئیسلامی ئێران و درك و تێگەیشتنی تایبەت لە جیهان وادەكات كە ئێمە ئەوە بە ڕوونی لە: ئۆمەتگەرایی كۆماری ئیسلامی، دژایەتی ئیمپریالیزم، دژایەتی چینایەتی و بورژووازی و بەها لیبـراڵەكان و سەرمایەداری، دژایەتی سیستەمی هەنووكەیی نێونەتەوەیی و ڕێكخراوە نێونەتەوەییەكان، لایەنگری هەژاران و لێقەوماوان و پاڵپشتی بزوتنەوە ڕزگاریخوازەكان و كۆنتـڕۆڵی دەوڵەت بە سەر كۆمەڵگە لە هەموو بوارەكاندا، ئایدۆلۆژیاگەرایی و دادپەروەری تەوەری و سەربەخۆییخوازی و...هتد، لە كۆماری ئیسلامی ئێراندا دەبینین.

دروشمەكانی دژایەتی گەندەڵی و دادپەروەری و سازش نەكردن بۆ نموونە لە پڕۆگرامی ئەتۆمی، كاریگەری زۆری لە سەر ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەی ئێران و كاردانەوەی كۆمەڵگەی نێونەتەوەیی هەبووە. لە ڕوانگەی ڕێبەرانی كۆماری ئیسلامی ئێرانەوە، دەوڵەتی نەتەوەیی تەنیا لە چوارچێوەی ئایدولۆژیای ئیسلامی ـ شیعی پێناسە دەكرێت و سروشتێكی ئایینی و ئیسلامی هەیە، لەم ڕوانگەیەدا دەوڵەت و حكومەت دروستكراوەیەكی ئەخلاقین نەك ماددی و سیكۆلار. دامەزراندنی كۆمەڵگەی ئایینی لە سەر بنەمای بەهاكانی سەروو زەمەن و سەروو شوێنی شەریعەتی ئیسلام، تەوەری سەرەكییە و ناسنامەی كۆماری ئیسلامی ئێران دەرەنجامی ڕەگەزەكانی ناسنامەی ئیسلام و شۆڕشی ئیسلامی و ناسنامەی ئێرانییە. بەڵام ناسنامە و سروشتی ئیسلامی ـ شۆڕشگێرانەی كۆماری ئیسلامی ئامانج و بەرژەوەندییەكانی ئێران دەستنیشان و پێناسە دەكات. ئەمەش بە پێی بەهاكان و ئایدیاكان و بنەماكانی ئیسلامی، شۆڕشی ئیسلامی ئێران دەبێت (عیوضی، ١٣٨٧: ص٢١٠ـ٢٠٩). لێرەدا بە ڕوونی گریمانەكانی كۆنستـراكتیڤیزم دەربارەی پرسی كاریگەری بنەما و ڕەگەزە ناسنامەییەكان لە دیاریكردنی ئامانج و بەرژەوەندییەكانی دەوڵەت و سیاسەتی دەرەوەی ئێران دەسەلمێنرێت.

لەم بارەیەوە لێکۆڵەرێکی کاروباری ئێران بە ناوی شیرین هانتــر، بڕوای وایە کە کاریگەری ئایدۆلۆژیای شۆڕشگێرانە لە سەر سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران بەرزی و نزمی تێدا بووە، ئەمەش بە هۆی ئەم هۆکارانە:

١ـ زاڵبوونی نەریتگەرایی نوێ لە پێکهاتەی سیاسی ئێران و ڕۆڵی لە سیاسەتی دەرەوەدا.

٢ـ هەڵسەنگاندنی ئایدۆلۆژیکی تواناکان و ڕۆڵی لە سەر ویست و داواکاری نەگونجاو و ناواقعی لە ئاستی نێونەتەوەییدا.

٣ـ کاردانەوەی وڵاتانی تـر و دامەزراوە نێونەتەوەییەکان لە هەمبەر ئایدۆلۆژیای شۆڕشگێرانەی کۆماری ئیسلامی و کۆنتــڕۆڵ کردنی، هەروەها سزا و ئابلۆقە ئابووریەکان.

٤ـ گۆڕانکارییە ناوخۆییەکان و گۆڕانکارییەکانی دەرەوەی ئێران و ڕووداوەکان و جۆری کاردانەوەکان لە هەمبەر ئەم گۆڕانکاریانە (هانتــر، ١٣٨٠: ص٢١٩).

## (٣.٥)– تێڕوانین بۆ پێکهاتەی هێز و دامەزراوە نێونەتەوەییەکان:

کۆماری ئیسلامی ئێران لە هەلومەرجێکدا دروستبوو کە پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی دوو جەمسەری بوو. ڕێبەرانی شۆڕشی ئێران ئەو تێگەیشتنەیان هەبوو کە هەموو نەهامەتییەکانی ئێران لە لایەن زلهێزەکانەوە بووە و ڕوانگەیەکی زۆر ڕەخنەییان بۆ ئەم سیستەمە هەبوو کە لە بنەمای (نە شەرقی نە غەربی) لە سیاسەتی دەرەوەدا بەرجەستە بوو. واتا کۆماری ئیسلامی ئێران پابەندبوون بە هەر ئایدولۆژیایەکی تـر ڕەتدەکاتەوە و سیاسەتی پابەندنەبوون پەیڕەو دەکات و دژایەتی چۆنیەتی دابەشبوونی هێز لە ئاستی سیستەمی نێونەتەوەیی و دامەزراوە نێونەتەوەییەکان دەکات (محمدی، ١٣٧٧: ص٤٨).

### (١-٣-٥)- تێڕوانین بۆ پێكهاتەی هێز:

لە ڕووی كردەییەوە ڕووبەڕوو بوونەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران و سیستەمی نێونەتەوەیی دەگەڕێتەوە بۆ بەرگری وڵاتان لە حكومەتی شای ئێران لە كاتی شۆڕشی (١٩٧٩) و دواتر لە جەنگی ئێران و عێراق، هەروەها كێشەی بە بارمتەگرتنی دیپلۆماتەكانی باڵیۆزخانەی ئەمریكا لە ساڵی (١٩٧٩)، كێشە و پرسی سەلمان روشدی و فەتوای ئایەتوڵڵا خومەینی بۆ كوشتنی لە ساڵی (١٩٨٨)، ململانێ لە كەنداو، پرسی تیرۆریزم و تاوانبار كردنی كۆماری ئیسلامی ئێران بە دالّدەدانی تیرۆریستەكان و ڕاهێنان و یارمەتیدان و هاندانیان. دواتر پرسی مافەكانی مرۆڤ و پێشێلكردنی مافی مرۆڤ لە كۆماری ئیسلامی ئێران، ئەمە جگە لە پرسی دۆسیەی ئەتۆمی ئێران (امین، ١٣٩٢: ص١٥٣). كۆماری ئیسلامی ئێران ڕوانگەیەكی دژە ڕۆژئاوایی هەیە بە ناوەندیەتی دژایەتی لەگەڵ ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و ئیسرائیل و ئەم ڕوانگەیە خۆی لەم ڕەگەزانەدا دەبینێتەوە: سەربەخۆییخوازی، ئازادیخوازی، دژایەتی زۆرداری، خەبات دژی ئیستكبار، دژایەتی زوڵم و زۆرداری و دادپەروەری خوازی. هەرچەندە لە سەرەتادا جۆرێك لە ڕوانگە و گوتاری ناسراو بە نەتەوەیی- ئیسلامی دەبینرا، بەڵام دواتر گوتار و ڕوانگەی ئیسلامی- شۆڕشگێرانە زاڵ بوو (قیصری، ١٣٨٥: ص١٥٨). گوتاری نەتەوەیی ـ ئیسلامی، لە دوای كودەتای ساڵی (١٩٥٣) لە دژی كابینەی مۆسەدیق دروست دەبێت و لە پاش شۆڕشی (١٩٧٩)دا لە كابینەی كاتی مەهدی بازرگاندا بەرجەستە دەبێت، بەڵام پاشان بە داگیركردنی بالیۆزخانەی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە تاران گوتاری ئیسلامگەرایی بە جەخت كردنەوە سەر دادپەروەری و دژایەتی زۆرداری سەرهەڵدەدات. ئەم گوتارەش هەوڵ دەدات ڕۆژئاوا لە جێگەی عەرەب وەكو ئەوی تری ناسنامەی ئێران دابنێت و خۆی لە ڕوانگەی گوتاریەوە لە دەرەوەی مۆدێرنیتە و فەلسەفەی

سیاسی ڕۆژئاوا پێناسە بکات (صادقی، ١٣٨٧: ص٢٥٩). هەروەها ئاراستە گشتییەکانی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی بە پێی مادەکانی (١٥٢، ١٥٤) لە دەستوردا بریتیین لە: ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتخوازی بێگانەکان، ڕەتکردنەوەی قبوڵ کردنی هێزە دەسەڵاتخوازەکان، پەیوەندی ئاشتیانە لەگەڵ دەوڵەتانی دۆست و خۆلادان لە دەستێوەردانی ناوخۆیی لە کاروباری نەتەوەکانی تر (نبوی، ١٣٩١: ص٣٦). بەڵام سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، خاوەن سیستەمێکی بەهاییە کە لە سەر بنچینەی فەرمانەکان و بنەماکانی هزریی ئیسلامی ـ شیعەی دووازدە ئیمامییە. گرنگی بەهاکان لەوەدایە کە دەتوانێت ببنە بنەمای زۆرێك لە ڕەفتار و ڕوانگەکان لە سیاسەتی دەرەوەدا و پاساوی ئامانجەکان و کردەوەکان. کاتێك ژمارەیەکی زۆر لە بەهاکان لە تۆڕێکی پەیوەندیدا لەگەڵ یەکتر بەشێوەی پەیوەندیدار (هۆ و بەرهۆ) جۆرێك لە پەیوەندی دروستبکەن، ئەوە سیستەمێکی بەهایی پێك دێت کە لە وانەیە لەگەڵ سیستەمی نێونەتەوەیی (ڕێساکان و پێوەرەکان) گونجاو یان دژایەتی هەبێت (رفیع پور، ١٣٧٨: ص٢٧٠).

ئایەتوڵڵا خومەینی ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە ساڵی (١٩٧٩)دا، گوتاری (نە شەرقی نە غەربی، کۆماری ئیسلامی) هێنائاراوە، لە ڕوانگەی ئایەتوڵڵا خومەینییەوە، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، ئەوی تری کۆماری ئیسلامیان پێکدەهێنا، ناوبراو نەیدەویست گوتاری ئیسلامی لە ئێران ببێتە بەشێك لە شارستانییەتی ڕۆژئاوا (رمضانی، ١٣٨٣: ص٦٠). لە ڕوانگەی ئایەتوڵڵا خومەینییەوە هەروەك چۆن لە قورئاندا مرۆڤ دەبێت بە ڕێگەی ڕاستدا بڕوات، لە سیاسەتی دەرەوەشدا دەبێت دەوڵەتی ئیسلامی ئەم کارەبکات، واتا دروشمی (نە ڕۆژهەڵات، نە ڕۆژئاوا) لە سیاسەتی دەرەوەدا هەڵقوڵاوی ئەم ڕوانگە و لێکدانەوە ئایینییە (ستوده، ١٣٧٨: ص٣). هەروەها ئایەتوڵڵا خومەینی دەڵێت:

((زلهێزەكان رێز لە ئێمە ناگرن تەنیا لەو ئاستەی كە ئێمە خزمەتكاریان بین و ئێمە لاواز و ئەوان بەهێز بن، ئەوان سەرپەرەشتی ئێمەبن و ئێمە پارێزەری بەرژەوەندییەكانیان بین، ئەوان ئێرانێك بە ناسنامەی ئیسلامی ئێرانی قبوڵ ناكەن بەڵكوو ناسنامەیەكمان پێدەدەن كە خۆیان دەیانەوێت)) (خواجه سروی، ١٣٨٥: ص٢٦٤). رێبەرانی كۆماری ئیسلامی ئێران هەموو كات خەبات دژی ئیستكبار و دژایەتی لەگەڵ زلهێزەكانیان وەك بنەمایەكی بنچینەیی سیاسەتی دەرەوە دەستنیشان كردووە، هەوڵیش دەدەن لەگەڵ ئەكتەرە لاوەكییەكانی سیستەمی نێونەتەوەیی دژی ئەكتەرە سەرەكییەكانی پێكهاتەی هێزی جیهانی هاوپەیمان بن. ئەم جیاوازییە ئایدۆلۆژییەی نێوان پێكهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی و كۆماری ئیسلامی ئێران، دوو خوێندنەوەی جیاوازیان بۆ جیهان و پەیوەندییەكان هەیە كە كۆی ئەوانە كار و كارلێك پێكەوە دروستدەكەن و كاریگەریان لە سەر سیاسەتی دەرەوەی ئێران هەیە (آقا محمدی، ١٣٩٠: ص٣٣). بە پێی تیۆری كۆنستراكتیڤیزم دەردەكەوێت كە ئەم جیاوازیە لە بەها و پێوەرەكان لە نێوان پێكهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی و كۆماری ئیسلامی ئێران دەبێتە هۆی دروستبوونی ململانێ و دژایەتی و ناكۆكی. لێرەوە دەتوانین ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەخلاقی و بەهایی كۆماری ئیسلامی ئێران لە ڕووی ئایینییەوە بۆ سیستەمی نێونەتەوەیی بەم شێوەیە پۆلین بكەین:

لە ڕوانگەی كۆماری ئیسلامییەوە، ئایینی ئیسلام و مەزهەبی شیعەی دووازدە ئیمامی بۆ هەموو ڕەهەندەكانی ژیانی تاك و كۆمەڵایەتی مرۆڤ و پەیوەندی نێونەتەوەیی حوكمی (بڕیاری) هەیە، بۆ نموونە:

١ـ ئامانجی ئایینی ئیسلام وەك ئایینێكی جیهانی لە كۆتاییدا دروستكردنی كۆمەڵگەیی گەورەی ئیسلامی لە ژێر ناوی ئۆمەتی ئیسلامییە، ئیمامی زەمان (مەهدی)یش رزگاركەری هەموو مرۆڤەكانە و دامەزرێنەری ئاشتی جیهانییە لە

ژێر ئاڵای ئیسلام. لێرەوە سیاسەتی دەرەوەی حکومەتی ئیسلامی ئەم ئامانجە کۆتاییەی هەیە کە لە کورتخایەندا هەموو جیهانی ئیسلام و لە درێژخایەندا هەموو جیهان بخاتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلام.

٢ـ لە ئیسلام خەبات دژی زۆرداری سنووری جوگرافیایی ناناسێت یان سنووری سیاسی ناوخۆیی و دەرەکی دەگرێتەوە. لە ڕووی هزرییەوە خەبات دژی دەوڵەتە زاڵم و زۆردارەکان لە بەرنامەی کاری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندایە.

٣ـ سەربەخۆیی ناوخۆیی حکومەتی ئیسلامی پەیوەندی بە بڕینی وابەستەیی بە وڵاتانی تری ناموسوڵمانەوە هەیە و دەبێت ڕێگە لە کافران بگرن بۆ دەستێوەردان. پێویستە کە موسوڵمانان بەرەیەکی هاوکاری و هاوپەیمانی دژی کوفر و زوڵم دروستبکەن.

٤ـ سیستەمی یاسایی ئیسلامی ـ شیعی (نظام شرع)، هەموو ڕێسا و یاساکانی تاکەکەسی، بنەماڵەیی، مەدەنی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری، دادوەری و نەتەوەیی و نێونەتەوەیی دەگرێتەوە. بۆ نموونە: مافی مرۆڤی ئیسلامی دژی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤە لە هەندێ بواردا، واتا عەقلانییەتی ئیسلامی جیاوازی هەیە لەگەڵ عەقلانییەتی ڕۆژئاوایی بە هۆی بەها و پێوەرەکانی ئیسلامی-شیعی (امین، ١٣٩٢: ص١٤٦). بە پێی تیۆری کۆنستراکتیڤیزم هەڵسوکەوت لەگەڵ پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی دەرهاویشتەی ئەو ڕوانگە و بیروباوەڕەیە کە ڕەفتارەکان لە چوارچێوەی پاراستنی دۆخی هەنووکەیی یاخود گۆڕینی دۆخی هەنووکەیی ئاراستەدەکات. جیاوازی ڕەفتار لە سیاسەتی دەرەوە تا ڕادەیەك لە جیاوازی ئایدۆلۆژیا و گوتارە زاڵەکانە. لە کۆماری ئیسلامی ئێرانیش، ڕەفتاری دەرەکی لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی و ناسنامەی ئیسلامی ئێرانە، کە لەم گۆشە نیگایەوە دەڕوانێتە

سیستەمی نێونەتەوەیی، كۆماری ئیسلامی بە ڕوانگەیەكی ئاینییەوە سیستەمی نێونەتەوەیی بە پێكهاتوو لە ئایدۆلۆژیاكان دەزانێت نەك پێكهاتوو لە دەوڵەتان. هەروەها لە ڕووی سیاسییەوە سنووری بڕوایی دارولئیسلام و دارولحەرب یان (استكبار و استچعاف)، ڕوانگەیەكی جیهانگەرایانە بە مەبەستی دروستكردنی ئۆمەتی یەكگرتووی ئیسلامی و سیستەمی جیهانی ئیسلامی پێكدێنێت (یزدانی و قاسمی، ١٣٩٠: ص٢١٦).

بە پێی تیۆری كۆنستراكتیڤیزم و كاریگەری پێكهاتە لە سەر هەمواركردنی ناسنامە و ڕەفتار و بە گشتی بكەرایەتی و سیاسەتی دەرەوە، دەتوانین بڵێین گۆڕانكاری لە پێكهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی لە پاش جەنگی سارد بە چەند شێوەیەك كاریگەری و گوشاری لە سەر بكەرایەتی و سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران دروستكردووە:

١ـ لە ڕێگەی پێناسە كردنەوە و دەستنیشان كردنی جۆرێكی تایبەت لە ناسنامەی سیاسی، سیستەمی سیاسی ڕەوا و ناڕەوای لە یەكتر جیاكردۆتەوە.

٢ـ لە بكەرە سیاسییەكان هەروەها كۆماری ئیسلامی ئێران چاوەروان دەكرێت كە لە ستراتیژی سیاسەتی دەرەوەیاندا بنەماكان و پێوەر و بەهای ڕەوای پێناسەكراوی نێونەتەوەیی پەیڕەو بكەن.

٣ـ ڕژێمە نێونەتەوەییەكان كەكۆمەڵێك بنەما و ڕێسا وپێوەرن، سنووریان بۆ كۆماری ئیسلامی دروستكردووە.

٤ـ ئەم بنەما پێوەری و بەهاییە نوێیانە وادەكات كە تێگەیشتنی وڵاتانی تر بۆ ئامانج و مەبەستەكانی كۆماری ئیسلامی(بۆ نموونە پرۆگرامی ئەتۆمی)، كاریگەری لە سەر جۆری پەیوەندی و شێوەی ڕەفتاری دەوڵەتانی تر لە هەمبەر كۆماری ئیسلامی ئێران دابنێت. كاریگەری پێكهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی لە سەر سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی لە سەردەمی دوو جەمسەریدا وایكردبوو كە

سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە سەر بنەمای ململانێ و گۆشەگیری بەڕێوە بچێت. بە کۆتایی هاتنی سیستەمی دوو جەمسەری و ئاڵوگۆڕەکان لە ئاستی نێونەتەوەییدا، وایکرد کە گۆڕانکاری لە سەر ئاستی ناوچەیی ڕووبدات کە ئەمەش دیسانەوە کاریگەری لە سەر سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی و ڕەفتاری جیاوازی لەم ژینگە نوێیەدا دروستکرد (خجستەنیا، ١٣٨٥: ص٦-٥). ئەگەر بە پێی ڕوانگەی ڕەخنەیی شیکردنەوە بۆ سیاسەتی دەرەوەی ئێران بکەین ئەوە چەمکی رزگاری و لۆژیکی بەرپرسیاریەتی لە زەینییەتی گشتی کۆماری ئیسلامی ئێران بە پێی ڕوانگەی کۆنستـراکتیڤیزم دەردەکەوێت، بە تایبەت کە کۆماری ئیسلامی ئێران لە سیستەمی هەنووکەیی ناڕازیە و هەوڵی تێکشکانی ئەو سیستەمە، یان دژایەتی ئەم سیستەمە نێونەتەوەییە دەدات و ئەمەش سیاسەتی دەرەوەی ئێران تووشی گرفت و کێشە دەکات.

### (٥-٣-٢)- تێڕوانین بۆ دامەزراوە نێونەتەوەییەکان :

کۆماری ئیسلامی ئێران لە پاش شۆڕشی ساڵی (١٩٧٩)دا و هەروەها سەردەمی جەنگی نێوان عێراق و ئێران، و باوەڕی بە ناڕەوایەتی دامەزراوە نێونەتەوەییەکان، بەشداری لە دانیشتنەکانی ساڵانەی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان نەدەکرد و تەنیا لە ساڵی (١٩٨٠)، لە پاش چوونی موحەممەد عەلی ڕەجایی، سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتەی ئێران بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، پاشان بەشداری خامنەیی وەك سەرۆك کۆماری ئەوکاتەی ئێران لە ساڵی (١٩٨٨) لە چل و دووهەمین دانیشتنی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەشداریان کرد. ئایەتوڵڵا خامنەیی، لە وتەیەکدا مافی ڤیتۆ و ئەندامیەتی هەمیشەیی لە ئەنجومەنی ئاسایش وەك بەربەستی سەرەکی ئاشتی جیهانی و هۆکاری جەنگ و ئاژاوە لە جیهاندا ناساند، هەروەها ڕایگەیاند

كە دەبێت وڵاتانی جیهانی سێیەم بۆ بەرگری لە مافەكانیان لەگەڵ یەكتـر یەكگرتوو بن (حامی كلوانق، ١٣٨٧: ص٤). ڕێبەران و نوخبە سیاسییەكانی كۆماری ئیسلامی لە ڕووی بنەماكانی هزری شۆڕشی ئیسلامی، ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتوەكان بە دامەزراوەیەك دەزانن كە لە خزمەت بەرژەوەندی و ئامانجی هێزە چەوسێنەرەكاندایە و دژی وڵاتانی بێوار (مستعضف) كاردەكات. ئەوان بڕوایان وایە كە ئەو پێكهاتە نادادپەروەرانەیە كە لە ئەنجومەنی ئاسایش و مافی ڤیتۆدا بەرجەستە دەبێت بگۆڕدرێت، ئێرانیش بە سیاسەتی نەڕۆژئاوا و نەڕۆژهەڵات هەروەها خەبات دژی ئیستكباری جیهانی هەوڵیدەدا ئەم ڕێكخراوە وەك خزمەتكاری هێزە گەورەكان بناسێنێت. لە لایەكی تـرەوە، بزوتنەوەی وڵاتانی بێلایەن لە جێگەی ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان، وەك دامەزراوەی سەرەكی كۆمەڵگەی نێونەتەوەیی بناسێنێت. بەڵام لە پاش كۆتایی جەنگی ئێران و عێراق، كۆماری ئیسلامی ئێران بە هۆی پێویستی دارایی، خۆی لە دامەزراوەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان وەكو بانكی جیهانی و سەندوقی نێونەتەوەیی دراو، نزیك كردەوە (كرمی، ١٣٨٥: ص٣٢).

بە شێوەیەكی گشتی ڕەوتی بەشداری و تەعامولی كۆماری ئیسلامی ئێران لە ڕێكخراوە نێونەتەوەییەكاندا، بە سەر چەند قۆناغێك دابەشدەكرێت. بە پێی ستـراتیژی سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی لە هەر قۆناغێك بە هۆی گوشارە دەرەكییەكان و گۆڕانكاریە ناوخۆییەكان گۆڕانكاری بەسەردا هاتووە:

١ـ قۆناغی یەكەم: ١٩٧٩ ـ ١٩٨٠، پەیوەندی سنوورداری فەرمی.

٢ـ قۆناغی دوهەم: ١٩٨٠ ـ ١٩٨٨، بەرەنگاربوونەوە و دژایەتی.

٣ـ قۆناغی سێیەم : ١٩٨٨ ـ ١٩٩٧، هەوڵدان بۆ پێكەوە ژیانی ئاشتیانە.

٤ـ قۆناغی چوارەم: ١٩٩٧ ـ ٢٠٠٥، هاوكاری سنووردار لەگەڵ ڕێكخراوەكان.

٥ـ قۆناغی پێنجەم: ٢٠٠٥ ـ ٢٠١٣، دژایەتیکردن.

٦- قۆناغی شەشەم: ٢٠١٣- تائێستا، هەوڵدان بۆ هاوکاری و سڕینەوەی بارگرژیەکان (کریمی، ١٣٨٦: ص١٤).

بە شێوەیەکی گشتی کۆماری ئیسلامی هەوڵ دەدات لە هەمبەر ئەو ڕێکخراو و دامەزراوە نێونەتەوەییانەی کە بە ئامرازی دەستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ڕۆژئاوایان دەزانێت، لە ڕێگەی کۆمەڵێك ڕێکخراو و دامەزراوەی تـرەوە جێگرەوەیەك بۆ ئەوان دروستبکات، بۆ نموونە: ڕێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی و لەو ڕێگەیەوە گفتوگۆ لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەورووپا بکات، یاخود دروستکردنی یەکێتی نێوان پەرلەمانەکانی ئیسلامی (اتحادیە بین المجالس اسلامی)، هاوکاری لەگەڵ ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری(ECO)، گرووپی (٧٧)، بزوتنەوەی بێلایەنەکان و یەکێتی ئەفریقی و...هتد (دهشیری، ١٣٨٣: ص٤٨).

لێرەدا بە پێی تیۆری کۆنستـراکتیڤیزم، لە خشتەیەکدا بە شێوەی گشتی کاریگەری بنەما و ڕەگەزە بەهایی و پێوەریە جیاوازەکانی پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی و کۆماری ئیسلامی ئێران و ڕۆڵیان لە سەر ناکۆکییەکانیان، هەروەها بکەرایەتی و سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە پرس و بابەتە جۆراوجۆرەکاندا دەخەینە ڕوو.

## بەراورد كردنی جیاوازییەكانی سیستەمی نێونەتەوەیی و كۆماری ئیسلامی ئێران:

| ریزبەند | بابەت | سیستەمی نێونەتەوەیی | كۆماری ئیسلامی ئێران |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | ئامانج | پاراستنی دۆخی هەنووكەیی | گۆڕینی دۆخی هەنووكەیی و هەناردە كردنی شۆڕش |
| ٢ | ستـراتیژی | یەكێتی و هاوپەیمانی | بێلایەنی، سەربەخۆییخوازی،یەكێتی ئیسلامی |
| ٣ | ئەكتەر-بكەر | دەوڵەت ـ نەتەوە، ڕێكخراو و دامەزراوە نێونەتەوەییەكان و...هتد. | ئۆمەت ، حكومەتی جیهانی ئیسلام |
| ٤ | بەرژەوەندی | بەرژەوەندی و ئاسایشی نەتەوەیی | بەرژەوەندی ئیسلامی ـ شیعی، مانەوە وپاراستنی سیستەمی سیاسی كۆماری ئیسلامی ئێران |
| ٥ | گوتاری فەلسەفی | ریالیزم ـ مادە گەرا | ئایدیالیزم ـ بەها تەوەر، ئایدۆلۆژیك |
| ٦ | ڕێسای گەمە | كێبـركێ و ململانێ | خێر - شەر، دۆست — دوژمن، دارولئیسلام -دارولحەرب |
| ٧ | مافەكان و سەروەری | دەسەڵاتی خەڵك، حكومەتی كۆماری | دەسەڵاتی خوا و حكومەتی ئیسلامی، ولایەت |
| ٨ | پێكهاتە | جەمسەرگەرایی | دژە جەمسەر،حكومەتی جیهانی ئیسلام |
| ٩ | ناسنامە | نەتەوەیی | ئایینی ـ ئایدۆلۆژیك، شۆڕشگێرانە وئیسلامی-شیعە |

## (٥ . ٤)- پاراستنی بەرژەوەندی و ئاسایشی سیستەم:

یەکێکی تر لە پێوەرەکانی بەهایی گرنگ لە ناسنامەی کۆماری ئیسلامی ئێران کە ڕۆڵی سەرەکی لە ڕەفتارەکانی سیاسەتی دەرەوەدا هەیە، پاراستنی بەرژەوەندی سیستەمی ئیسلامییە. ئەم پێوەرە بەهاییە لە بواری پەیوەندی دەرەکی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ سیستەمی نێونەتەوەیی و وڵاتانی تر دەتوانێت ببێتە هۆی دوو جۆرە ڕەفتاری جیاواز، یەکەم: لە هەندێ حاڵەتدا بە پێی ئەم بنەمایە بەرژەوەندی دەوڵەتی ئیسلامی وادەخوازێت، کە لە سەر بنەمای زەرورەتی مانەوەی دەوڵەتی ئیسلامی، هەوڵ بدات خۆی لەگەڵ بەها و پێوەرە نێونەتەوەییەکان بگونجێنێت یاخود قبوڵیان بکات هەرچەندە کاتی بێت. دووهەم: لە هەندێ حاڵەتدا ئەم بەرژەوەندییە بە مانای پاراستنی بەهاکان و ڕێساکانی ئیسلامی و ڕێگرتنە لە نفووزی بێگانەکان لە وڵات کە لەم حاڵەتەدا، بۆ پاراستنی ئەم بەها باڵایانە دەتوانێت پێوەر، بەها، ڕێسا و یاسا نێونەتەوەییەکان، لە بەرچاو نەگرێت یان پێشێلیان بکات (مشیرزادە، مقالە، ١٣٨٥: ص٢٣). لێرەوە دەتوانیین بڵێین کە پاراستنی بەرژەوەندی سیستەم ڕەوایەتی هزری خۆی لە (بنەمای تەقییە) وەردەگرێت. هەروەها لەم بارەیەوە ئایەتوڵڵا خومەینی دەڵێت: ((پاراستنی ئیسلام و حکومەتی ئیسلامی، لە نوێژ گرنگتر و پربایەختر)) (موسوی خمینی، ١٣٧٧: ص٥٨). جێگەی ئاماژەیەکە کاتێك ئێمە باس لە کۆماری ئیسلامی دەکەین، لە سەرەتادا ئەوە تایبەتمەندیە ئیسلامییەکەیە کەدەستنیشانکەری کۆمەڵێك پێوەر و بەهایە وجۆرێك لە ناسنامەی ئیسلامی بۆ ئەم دەوڵەتە دروستکردووە، کە کاریگەری لە سەر ئاراستە کردنی سیاسەتی دەرەوەی ئەم وڵاتە لە سیستەمی نێونەتەوەییدا داناوە و کۆمارییبوون تەنیا ڕواڵەتی سیستەمە سیاسییەکەیە، بەڵام ئیسلامییەت ناوەڕۆکی سیستەمەکەیە

(رسولی ثانی آبادی، ١٣٩٠: ص٨٨). لەم پەیوەندییەدا محمد جواد لاریجانی، لە تیۆریسیەنە ئیسلامییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران، ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران بەم جۆرە پۆلین دەکات: ١- پاراستن و مانەوەی ئێران. ٢- ئاوەدانکردنەوەی ئێران. ٣- بلاوکردنەوەی هزری ئیسلامی-شیعی. هەروەها محمود سریع القلم، پسپۆر و لێکۆڵەری بواری سیاسەتی دەرەوەی ئێران بەم جۆرە باس لە ئامانجەکان دەکات: ١- پاراستنی یەکپارچەیی وڵات، سەروەری نەتەوەیی و گەشەپێدانی ئابووری. ٢- بەرگری لە موسوڵمانان و بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکان و دژایەتی لەگەڵ ئیسرائیل. ٣- دامەزراندنی کۆمەڵگەی جیهانی ئیسلامی لە سەر بنەمای مەزهەبی شیعە (رنجبـر، ١٣٨١: ص٩).

ئێران وەك هەر ئەکتەرێکی نەتەوەیی بەدوای دەستەبەرکردنی بەهاکانییەتی، کە لە سەر بنەمای پێویستیەکان و ئایدیا و ئامانجەکانییەتی کە لە بەڵگەنامە فەرمییەکان وەکو دەستور، بەڵگەنامەی ڕوانگەی بیست ساڵە و سیاسەتە گشتییەکانی پەسندکراوی کۆمەڵەی دەستنیشان کردنی بەرژەوەندییەکانی سیستەم لە ڕەفتاری دەرەوەی ئێراندا ڕەنگیداوەتەوە و بەرجەستە بووە. لێرەوە دەردەکەوێت کە سەربەخۆیی، سەروەری و پاراستنی خاك و ناسنامەی ئیسلامی حکومەتی ئیسلامی لە سەر بنەمای ولایەتی فەقیە و یەکێتی جیهانی ئیسلام لە ڕەهەندەکانی بەرژەوەندی نەتەوەیی ئێرانن (آدمی، ١٣٨٩: ص٩٩). ئامانجەکانی نەتەوەیی لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران بە پێی یاسای بنچینەیی لە مادەکانی (٣، ٩، ٦٧، ١٢١، ١٥٢، ١٥٣)دا، هاتووە کە پاراستنی ئیسلام، ئازادی و سەربەخۆیی لە هەموو ڕەهەندێکەوە، یەکێتی و یەکپارچەیی وڵات، بەشداری هەمووخەڵك و بەهێزتـرکردنی توانای سەربازی و بەرگری و پرستیژ، لە خۆدەگرێت (نبوی، ١٣٩١: ص٣٦).

بە پێی ئەم بنەمایەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی سیستەمی ئیسلامی، گرنگتــرین ئەرکی دەوڵەتی ئیسلامی ئەوەیە کە لە هەر قۆناغێك، بە پێی ڕەچاوکردنی پاراستنی بەرژەوەندی سیستەم، لە دوو سیاسەتی خۆگونجاندن و قبوڵ کردنی بەهاکانی نێونەتەوەیی یاخود ڕەچاو نەکردنیان، بە پێی بەرژەوەندی، یەکێکیان هەڵبژێرێت و ڕەفتار و سیاسەتی دەرەوەی خۆی ئاراستە بکات.

هەروەها بە هۆی ئەوەی کە ڕەگەزە بنەرەتییەکانی سیستەمی سیاسی ئێران، ئیسلام و شۆڕشی ئیسلامییە، بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی لە سەر بنەمای بەهاکان، ئایدیاکان، بنەماکانی ئیسلام و شۆڕشی ئیسلامییە، چونکە نەتەوە ڕەسەنایەتی نییە و بەرژەوەندی نەتەوەیی لە چوارچێوەی بەرژەوەندی ئیسلام و حکومەتی ئیسلامیدایە، ئەمەش بە جۆرێك ڕەگەزی ناسنامەیی ئێرانی لە پلەی دووهەم یان تێکەڵ بە ناسنامە ئیسلامییەکەیە و ئێران نیشتمانێکی ئیسلامییە (بە پێی ئەم ئایدۆلۆژیایە) و لە ئەنجامدا پاراستنی ئەم کیانە، مانەوەی، سەربەخۆیی و سەروەریەکەی و ئاسایشی، خۆشگوزەرانی و گەشەسەندنی لە سەر بنەماکانی بەهایی ئیسلامی شۆڕشگێڕانەی کۆماری ئیسلامی ئەرکە. بەم مانایە جگە لە بەرژەوەندییە حەیاتییەکان و پرسی ئاسایش و ئابووری لە کورتخایەندا، بەرژەوەندی و ئامانجەکانی دوورمەودای گۆڕینی سیستەمی جیهانی و ئایدۆلۆژیەکان لە سیاسەتی دەرەوەدا کاری بۆ دەکرێت، هەروەها دەبێت سیستەمێکی سیاسی ـ ئابووری لە ئاستی نێونەتەوەیی پێکبهێندرێت کە کۆماری ئیسلامی ئێران تیایدا هەست بە ئاسایش بکات (دهقانی فیروز آبادی، ١٣٨٦: ص٨١). لێرەوە دەتوانین بڵێین کە بە پێی چەمکی (ئاسایشی بوونناسانە)[١]، نە تەنیا تاکەکان، بەڵکوو بوونەکانی کۆمەڵایەتی تـر وەك دەوڵەت، بە دوای دەستەبەر کردنی ئاسایشی بوونناسانەی خۆیانن، بەم مانایە کە

---

-1Ontological Security

دەوڵەت جگە لە هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایشی فیزیکی و ماددی خۆی، واتا خاك و پێکهاتە سیاسییەکەی، دەیەوێت ئاسایشی ناسنامەیی خۆی وەك بکەرێك دەستەبەر بکات. ئەم تێگەیشتنەی دەوڵەت لە ناسنامە هەڵقوڵاوی ئەولەویەتەکان و ئامانجەکان و بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتە، هەروەها نەبوونی دڵنیایی بزوێنەری ئاسایشی بووناسانەی دەوڵەتە لە سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتاندا و گۆڕان لە ڕەفتارەکانیش لەم چوارچێوەیەدا مانا پەیدا دەکات، کە دەوڵەت دەیەوێت درك و تێگەیشتنی خۆی لە واقع و ژینگە، دووبارە بەرهەم بێنێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەقامگیری ئاسایشی ناسنامەیی خۆی (دهقانی و نوری، مقاله، ١٣٩١: ص١٥٣).

چەمکی ئاسایشی بووناسانە، لە لایەن پسپۆڕانی بواری پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان و سیاسەتی دەرەوەدا، بەکارهاتووە. جێنیفر میتزێن[١]، یەکێکە لەو کەسانە و بڕوای وایە کە بە پێچەوانەی تیۆری ریالیستی، دەوڵەت لە کێشە ئاساییشییەکان هەڵنایەت، بەڵکوو دەچێتە پێشوازیان تاوەکو لەم ڕێگەیەوە ئاسایشی بووناسانەی خۆی دەستەبەر بکات. هەروەها وڵاتان ئەم دڵنیایی و متمانەیان لە ژینگەی دەرەکیدا لە ڕێگەی ناسنامەکانی بەکۆمەڵ وەکو نەتەوەگەرایی و ئایین بەرهەم دێنن، لەم ڕێگەیەوە دڵنیایی و متمانە بەدەست دەخەن کە پێی دەگوترێت سیستەمی متمانە تەوەر[٢]. ئەم سیستەمەش وادەکات دەوڵەتان خۆیان وەك (خود) لەگەڵ کۆمەڵێك لە ناسنامەکان و بەرژەوەندییەکان پێناسە بکەن، کە لە پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی تـردا بەدواداچوون بۆ

---

٢- ١ بۆ زانیاری زیاتربڕوانە:

Mitzen, Jennifer. (2006),”**Ontological Security in World Politics: State Identy and the Security Dilemma**”, European Journal of International Relations, vol. 12, No.3, Pp.341-370.

2 - 3 The Basic Trust System

دەستەبەربوونیان دەکەن. لەم ڕووەوە، لەوانەیە ئاسایشی بووناسانە هەندێ کات بە پێچەوانەی ئاسایشی ماددی دەوڵەت بێت، بەم مانایە کە لە وانەیە دەوڵەتان بۆ بەردەوامبوون لە پێناسە کردنی خود و ئەوانی تـر و بکەرایەتی لە سیستەمی نێونەتەوەییدا، ئاسایشی فیزیکی خۆیان بخەنە مەتـرسییەوە و پێشوازی لە ململانێ و جەنگ لەگەڵ ئەوانی تـر بکەن، تا لەم ڕێگەیەوە پێناسەیەکی بەردەوام و جێگیر لە دۆست - دوژمن و خود — ئەوی تـر بەدەستبێنن، کە ئەمەش بە مانای ئەوەیە کە ئاسایشی بووناسانە، بزوێنەر و پاڵنەرێکی بەهێزی ڕەفتاریە لە سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتاندا (مشیرزادە و مسعودی، ١٣٨٨: ص٢٦٢ـ٢٦١). پرسی ناسنامە لە ناوەندی سەرنجی ڕوانگەی ئاسایشی بووناسانە دایە و لەم ڕوانگەیەوە ناسنامەی کۆماری ئیسلامی، ئاگایی و تێگەیشتنی ئەم سیستەمە سیاسییەیە لە خۆی و تێگەیشتنی وڵاتانی تـر لەم سیستەمە پێویستی بە دووبارە بەرهەم هێنانەوەیە، لە ڕێگەی هەوڵەکان و ڕەفتارەکانییەوە لە ئاستی ناوخۆ و دەرەوەدا پێویستی بە دانپێدانان و پاڵپشتی لێکردنە. هەروەها بە پێی تیۆری کۆنستـراکتیڤیزم، تێگەیشتن وخوێندنەوەی بکەرەکان بۆ ئاسایش و ناسنامە و بەرژەوەندی بە پێی سیستەمی بەهاکان و پێوەرکانیان و ئەو ژینگە و فاکتەرە ماددیانە هەروەها ناسنامە و ڕەفتاری بکەرەکانی تـر، هۆکارەکانی هەوڵدانی کۆماری ئیسلامی ئێران، سەرەڕای هەموو گوشار و ئابلۆقەکانی نێونەتەوەیی بۆ بەدەستهێنانی توانای ئەتۆمی و پاراستنی ئاسایشی ناسنامەییەکەی لێرەدا ڕوون دەبێتەوە.

بە پێی تیۆری ئاسایشی بووناسانە، دەوڵەتان بۆ زاڵبوون بە سەر نەبوونی ئاسایشی ناسنامەیی خۆیان ڕوو دەکەنە پرۆسەی ڕێساسازی و بنیاتنانی ڕەفتاری ئاساییکراو. کۆماری ئیسلامی ئێرانیش ڕەفتارەکانی لە سیاسەتی دەرەوەی خۆیدا ئاساییکردۆتەوە و ئەمەش لە دەیەی یەکەمی دوای شۆڕشی ئیسلامی و لە

ژێر کاریگەری گوتاری شۆڕش لە ناسنامەسازی سیاسەتی دەرەوەدا دەرکەوت. گرنگتــرین سیماکانی ئەم ڕەفتارە ئاساییکراوانە کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی هەستی نەبوونی ئاسایشی بووننادانە، بــریتیین لە:

١- پشتیوانیکردن لە بێوارەکان (مستضعفان)، لە هەمبەر زۆرداران (مستکبــران).

٢- جەخت کردنەوە لە سەر سەربەخۆبوون لە زلهێزەکان.

٣- دژایەتی (استکبار) لە ڕێگەی دژایەتی لەگەڵ ڕۆژئاوا، بە تایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

٤- دژایەتی و خەبات دژی ئیسرائیل و پشتیوانی لە هێزە ئیسلامییەکان لە لوبنان و فەلەستین.

٥- ویستی گۆڕانکاری و ریفۆرم لە سیستەمی نێونەتەوەیی (دهقانی فیروز آبادي و نوری، ١٣٩١: ص١٦١).

لەم پەیوەندییەدا، ڕێبەری کۆماری ئیسلامی ئێران، ئایەتوڵڵا خامنەیی لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت: ((هەرچەندە پێکهاتەی یاسایی و فەرمی کۆماری ئیسلامی ئێران گرنگە، بەڵام لەوە گرنگتــر ناوەڕۆك و سروشتی کۆماری ئیسلامی ئێرانە، کە بە گشتی ناسنامەی کۆماری ئیسلامی ئێرانە، وەکو: دادپەروەری، پاراستنی بەهاکان، بەرگری لە هەمبەر دوژمنەکانمان و... هتد)). هەروەها دەڵێت: ((کۆماری ئیسلامی ئێران نەفی و سەلماندنی لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە، نەفی کردنی چەوساندنەوە، نەفی کردنی سوڵتەی زلهێزان، بەڵام ناسنامەی نەتەوەیی و ناسنامەی ئێرانی و ئیسلامی و بەهاکانی ئیسلام دەسەلمێنێت، هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەڵێت کە ئێمە نالێین کۆماری ئیسلامی نەمێنێت، بەڵکوو کۆماری ئیسلامی ڕەفتاری خۆی بگۆڕێت، ئەمە بە مانای ئەوەیە کە ئەم نەفی و سەلماندنە نەمێنێت، کەواتا کۆماری

ئیسلامی نامێنێت)) (خامنەیی: ٢٠٠٨/١٢/١٤)[١]. لێرەوە بە پێی تیۆری کۆنستراکتیڤیزم دەتوانین بڵێین کە یەکێك لە سەرەکیترین ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵدانە بۆ ئەوەی کە بەهاکان و پێوەرەکانی ناوخۆیی کە بنیاتنەری ناسنامەی کۆماری ئیسلامییە، ببێتە پێوەر(نۆرم) و بەهای جیهانی، بەم ڕێگەیەوە مانەوەی خۆی مسوگەر دەکات یاخود لەم ڕێگەیەوە پارێزگاری لە مانەوەی سیستەمەکەی خۆی دەکات، هەروەها زۆر ئاسانتر دەتوانێت ئامانج و بەرژەوەندییەکانی بێنیتە دیی، واتا ئامانجی دامەزراوەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران بۆ ئەم مەبەستە بریتین لە بەدەستهێنانی پێگە و بەرزکردنەوەی ڕەوایەتی سیستەمی سیاسی ئێران و کاریگەری لە سەر ڕای گشتی لە ئاستی ناوخۆ و دەرەوە. ئەمانەش هەموویان بۆ مانەوەی سیستەم و پاراستنی بەرژەوەندی و ئاسایشی کۆماری ئیسلامی ئێرانە.

بە گشتی چەمکی ئاسایش لە ڕوانگەی هزری سیاسی شیعەوە و لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە بریتییە لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا، بانگەشە بۆ یەکریزی و یەکێتی و پاراستنی بەهاکان و بنەماکانی ئیسلام لە کۆمەڵگە. لە ڕووی سەربازیشەوە بریتییە لە جیهاد لە ڕێگەی خوا بە ئامانجێکی پیرۆز و بەرگری لە وڵاتانی ئیسلامی و داراییەکانی موسوڵمانان هەروەها پاراستنی ئیسلام. لە ڕوانگەی کولتووریشەوە بریتییە لە فەرمان پێکردن بە چاکە و ڕێگرتن لە خراپە و پاراستنی کولتووری ئیسلامی، لێرەوەیە کە دژایەتی ئیستعمار و پرسی هێرشی کولتووری و بەرگری و بانگەشەی ئایینی دێتەکایەوە و لە ڕووی سیاسییەوە لە حکومەتی ئیسلامیدا بەرجەستە دەبێت، بۆ ئەوەی کە بتوانێت بنەماکانی ئیسلام بپارێزێت و کۆمەڵگە و تاکەکان لە جێبەجێ کردنی

---

١ـ چاوپێکەوتنی خامنەیی ڕێبەری شۆڕشی ئێران، لەگەڵ مامۆستا و قوتابیانی زانکۆی (علم و صنعت) ٢٠٠٨/١٢/١٤.

شەریعەتی ئیسلامی چاودێری بكات، پەیوەندییەكانی موسوڵمانان و ناموسوڵمانانیش ڕێكبخات، هەروەها لە ڕووی ئابوورییەوە دارایی موسوڵمانان بپارێزێت و كاروباری ئابووری و دارائی موسوڵمانان ڕێكبخات و پەیوەندی ئابووری بە پێی بنەماكانی شەریعەت لەگەڵ جیهانی دەرەوەی ئیسلام كۆنتـڕۆڵ بكات (آیت اللە جزایری، ١٣٧٩: ص٨ـ٥).

## (٥ . ٥)– دۆكتۆرینی (ام القری):

دەتوانین بڵێین بنچینەی سیاسەتی دەرەوە و ئامانج لە پەیوەندییەكانی دەرەوە لە ڕوانگەی هزری سیاسی شیعی، پاراستنی دارولئیسلامە، كە بنەماكانی تـر لە ژێر ئەودا دروست دەبێت یاخود مانا پەیدا دەكات و هەموو پەیوەندییەكانی ئاسایشی، كولتووری، ئابووری، دەرەكی و...هتد، بۆ پاراستن و بەهێزتـركردنی دارولئیسلامە (عطازادە، ١٣٨٧: ص١٠٤).

محمد جواد لاریجانی، وەك تیۆریسیەنێكی كۆماری ئیسلامی و داهێنەری دۆكتۆرینی (ام القری)ی ئیسلامی لە سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێراندا، پاراستنی سروشتی ئیسلامی سیستەم هەروەها پێگەی كۆماری ئیسلامی ئێران لە جیهانی ئیسلام و پاراستن و بڵاوكردنەوەی بیرۆكەی كۆماری ئیسلامی، وەك سەرەكیتـرین ئامانجەكانی ئەم دۆكتۆرینە ڕاگەیاند. لە ڕوانگەی ناوبـراوەوە، (ام القری) لەگەڵ جیهانی ئیسلام پەیوەندی دیالێكتیكی هەیە، بە شێوەیەك كە ئەگەر (ام القری) بكەوێتە مەتـرسییەوە، ئەوە پاراستنی لە ئەستۆی جیهانی ئیسلامدایە و ئەگەر جیهانی ئیسلام بكەوێتە مەتـرسیەوە، ئەوە (ام القری) دەبێت كاردانەوەی هەبێت (ازغندی، ١٣٨١، ص١٥). لاریجانی بڕوای وایە كە پێگەی كۆماری ئیسلامی ئێران لە جیهانی ئیسلامدا زۆر گرنگ و پڕبایەخە، بۆیە نابێت لە جوگرافیای خۆیدا سنووردار بكرێت. بەم مانایە كە

دەبێت ئێران دیپلۆماسی و سیاسەتەکانی بە جۆرێك بێت کە هاوتەریبی پێگەکەی بێت و بڕوای وایە کە هیچ وڵاتێکی تـر بێجگە لە کۆماری ئیسلامی ئێران ناتوانێت ڕێبەرایەتی جیهانی ئیسلام بکات و ئەمە بە دۆخێکی گەورەی مێژوویی دەزانێت. لاریجانی بە جەخت کردنەوە لەسەر (ام القری) بوونی ئێران دەڵێت: ((وڵاتێك دەتوانێت وەکو (ام القری)ی جیهانی ئیسلام بێت کە خاوەن ڕێبەرێکی شایستە و شیاو بێت، واتا ڕێبەرایەتێك کە شیاوی هەموو ئۆمەتی ئیسلامی بێت)) (لاریجانی، ١٣٦٩: ص ٤٨-٤٥). بە پێی هزری سیاسی شیعی، یەکێك لە گرنگتـرین ئەرکەکانی دەوڵەتێکی ئیسلامی، وەك کۆماری ئیسلامی ئێران، هەوڵدانە بۆ یەکگرتوویی موسوڵمانەکان و دەبێت هەموو مرۆڤایەتی بۆ ناسین و پەیڕەو کردنی بڕیارەکانی ئیسلام بانگهێشت بکات. بە هۆی ئەم ڕۆڵە سەرەکییە لە جیهانی ئیسلامدا، ئۆمەتی ئیسلامی و (ام القری)ی موسوڵمانان بە گشتی بەهێز دەکات. بە پێی ئەم تێگەیشتنە، کۆماری ئیسلامی ئێران کە دەوڵەتێکی ئیسلامییە دەبێت ئەرکەکانی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەستۆ بگرێت کە سەرووتـر لە خاك و نیشتمان و جوگرافیای ئەم وڵاتەیە، سەرووتـر لە بەرژەوەندی نەتەوەیی ئێرانە، بەڵام لە ئاراستەی ئەرکی ئایینی و خوایی و بەرژەوەندی ئیسلامدایە (رسولی ثانی آبادی، ١٣٩٠: ص٩١).

ئایدیالیستە ئیسلامییەکانی ئێران بە لێکدانەوەی وتەکانی ئایەتوڵڵا خومەینی لە سەر ناڕەوا و نادادپەروەرانە بوونی سیستەمی نێونەتەوەیی، هەوڵیاندەدا کە پەیوەندییەکانی نێونەتەوەیی لە ڕێگەی یەکگرتوویی نەتەوە موسوڵمانەکان و دروستکردنی بلۆکێکی بەهێز لە دەوڵەتانی ئیسلامی بگۆڕن. هەرچەندە ئەم ئایدیالیزمە هەندێ دەرفەتی بۆ ئامانجەکانی سەروو نەتەوەیی و هەروەها بواری بۆ نفووزی سیاسی و یەکگرتوویی ئایدۆلۆژیکی لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەیی، گەشەپێدانی پیشەسازی، تەکنۆلۆژیایی، دروستکرد،

بەڵام لە دوای هەشتاکانی سەدەی رابردوو لە ژێر گوشارەکانی نێونەتەوەیی و گیروگرفتی ناوخۆیی، پێویستی دۆکتۆرینێکی ناوەند تەوەر و بەرگریکردن لە یەکپارچەیی خاك هاتەئاراوە. لێرەوەیە کە دۆکتۆرینی پاراستنی(ام القری)ی موسوڵمانان دێتەئاراوە (ازغندی، ١٣٨١: ص١٤).

لێرە بەدواوە، هەناردە کردنی شۆڕش لە چوارچێوەی دۆکتۆرینی شۆڕشی جێگیردادەبێت، کە بە شێوەی ڕوون کردنەوەی هزر و ئەندێشەکانی شۆڕشی ئیسلامی ئێران، هەروەها ڕزگارکردنی نەتەوەکانی موسوڵمان و چەوساوە لە جیهاندا و لە چوارچێوەی (ام القری)ی ئیسلامی کە ناوەندی جیهانی ئیسلامە دادەبێت، کە جگە لە هەوڵ بۆ پاراستنی دەبێت بەرپرسیاریەتی جیهانی هەبێت وئەو رۆڵانەی کە کۆماری ئیسلامی ئێران لە جیهاندا دەبێت بیگێرێت لە ژێر ئەم دۆکتۆرینەدایە، کەگرنگترینیان بریتیین لە: سەنگەری شۆڕش، دەوڵەتی رزگارکەر، دەوڵەتی عادل، پاڵپشت و پشتیوانی بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکان، بەرگریکاری موسوڵمانان، ئەکتەری دژە ئێمپریالیست، دەوڵەتی دژە ئیستکبار و...هتد (دهقانی فیروز آبادی و رادفر، ١٣٨٨: ص١٣٢). هەروەها ستراتیژی خستنەڕووی (ام القری)، ڕاگەیاندنی ئەوەبوو کە کۆماری ئیسلامی ئێران وەك بنکەیەکی ماددی و مەعنەوی هەر کاتێك بکەوێتە ژێر هەڕەشەوە ئەوە لە سەر هەموو موسوڵمانانی جیهان ئەرکە کە بەرگری لە (ام القری) بکەن. لە ڕوانگەی ئایەتوڵڵا خومەینییەوە: ((ئەم ئەرکە لە هەموو ئەرکەکان باڵاترە و پاراستنی ئیسلام و ئێران تەکلیفە)) (خومەینی، ١٣٧٩، ج١٧: ص٢٢٢).

ئامانج لە ڕوانگە و خستنەڕووی (ام القری) تیۆریزەکردنی ئەولەویەتی بەرژەوەندییەکان و ئاسایشی(ام القری) لە حالەتی هەڕەشە بۆ سەر مانەوەی بوو، هەرچەندە ئەوە بووە هۆی گرنگیپێدان بە مانەوەی کۆماری ئیسلامی و گرنگیپێدان بە پێشکەوتن و گەشەسەندنی ئێران لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا. بەڵام

لێرە ئەم چەمکە جیاوازی لەگەڵ بەرژەوەندی نەتەوەییدا هەیە و(ام القرى) وەکو کیانێکی سیاسی و مەزهەبیە لە جیهانی ئیسلامدا، نەوەك دەوڵەت-نەتەوە و جەخت لە سەر حکومەتی ئیسلامی و بەرژەوەندی حکومەتی ئیسلامی دەکاتەوە. ئەگەر باس لە هەڕەشە لە ئاسایشی وڵات دەکرێت، ئەوە مەبەست هەڕەشەیە لە سنوورەکانی حکومەتی ئیسلامی یان (ام القرى)ی جیهانی ئیسلام (یزدانی و قاسمی، ١٣٩٠: ص٢١٨).

دەتوانین بڵێین، دژایەتیەکانی ڕۆژئاوا بە گشتی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە تایبەت، هەروەها تـرس و دڵەڕاوکێیەکانی وڵاتانی ناوچەکە چ عەرەب و چ نەتەوەکانی تـر لە سیاسەتی هەناردە کردنی شۆڕشی ئیسلامی و کاردانەوەکانیان لە دژی ئێران، وایکرد کە (ام القرى) جێگەی هەناردە کردنی شۆڕش بگرێتەوە، بە مەبەستی کەمکردنەوەی گوشارەکانی ژینگەیی ناوچەیی و نێونەتەوەیی، هەروەها کەمکردنەوەی بارگرژییەکانی نێوان کۆماری ئیسلامی ئێران و وڵاتانی ئیسلامی و کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی (یزدانی و قاسمی، ١٣٩٠: ص٢٢٢). ڕۆڵی (ام القرى) بینین لە لایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە، پابەندبوونێکی ناسنامەیی بۆ دروستدەکات کە لە ئاراستە کردنی سیاسەتی دەرەوەیدا دەردەکەوێت. بۆ نموونە یارمەتیدانی ماددی و مەعنەوی بۆ حەماس و حیزبوڵڵا و...هتد، یاخود دژایەتیکردنی توند و بە فەرمی نەناسینی ئیسرائیل (جوادی ارجمند، ١٣٨٩: ص٤٣). بە پێی تیۆری کۆنستـراکتیڤیزم، کۆماری ئیسلامی لە پرۆسەی تەعامولکرن لەگەڵ بکەرەکانی تـر و کاردانەوەیان هەروەها کاریگەری و سنوور و بەربەستەکانی پێکهاتەیی سیستەمی نێونەتەوەیی و پێکدادانی بەها و پێوەرە جیاوازەکانیان، هەروەها دروستبوونی تێگەیشتنی نوێ لە تواناکانی خوێ و دابەشبوونی هێز، ئەمە جگەلە گۆڕانکارییە ناوچەیی و نێونەتەوەیی و تەنانەت ناوخۆییەکان، هاتنە ئارای دۆکتۆرینی(ام القرى) بە

جۆرێك هەمواركردنەوەیەك لە ئاست و پلەی سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێرانە: لە ئایدیالیزمی رادیكال و شۆڕشگێرانەوە بۆ ئایدیالیزمی بنەما خواز. بەم مانایە كە ئەم گۆڕانكارییە لە چوارچێوەی ناسنامەیی كۆماری ئیسلامی ئێراندا شیكرنەوەی بۆ دەكرێت.

## (٥ . ٦) . فاكتەرە كۆمەڵایەتی و كولتوورییەكان لە سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران:

تایبەتمەندییەكانی دۆخی كۆمەڵگەی ئێرانی، پێكهاتەی دانیشتوان، تایبەتمەندییە ئایینی، مێژوویی، كولتووری، مەزهەبی، چینایەتییەكان و...هتد، لە گرنگتــرین فاكتەرەكانی كۆمەڵایەتین كە كاریگەریان لە سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێراندا هەیە. لێرەدا بە شێوەی گشتی شیكردنەوەیان بۆ دەكەین.

### (٥ ـ ٦ ـ ١)- دۆخی گواستنەوەی كۆمەڵگەی ئێران:

كۆمەڵگەی ئێران لە دۆخی گواستنەوەدایە، واتا لە قۆناغی نەریتی بەرەو قۆناغی مۆدێرن. ئێران زیاتــر لە سەدەیەكە گرفتی چۆنیەتی سازان لە نێوان نەریت و مۆدێرنیتەی هەیە و هەردوو تایبەتمەندی نەریتی و مۆدێرنی هەیە. گرنگتــرین تایبەتمەندییەكانی كۆمەڵگەی نەریتی و گەشەنەسەندوو، بریتییە لە ڕەوایەتی لە سەر بنەمای نەریت و وەفاداری و بەرژەوەندی خێڵ و تایفە، ئاستی كەمی بەشداری و لاوازی وەزیفەكانی حیزبی سیاسی، گەشەنەسەندوویی كۆمەڵگەی مەدەنی و بیرۆكراسی و...هتد، لە كاتێكدا گرنگترین تایبەتمەندییەكانی كۆمەڵگەی مۆدێرن بریتییە لە ڕەوایەتی عەقڵانی، وەفاداری و بەرژەوەندی نەتەوەیی، بەشداری سیاسی بەربڵاو و فراوان، دروستبوونی حیزبی

سیاسی بەهێز و کارا، کۆمەڵگەی مەدەنی گەشەسەندوو و بەهێز (نقیب زادە، ١٣٧٩: ص١٥٩). سروشتی دۆخی گواستنەوەی کۆمەڵگەی ئێرانی، بە چەند شێوە کاریگەری لە سەر سیاسەتی دەرەوەی ئێراندا هەیە:

**یەکەم:** ڕۆڵی هەیە لە دەستنیشان کردنی بەرژەوەندی و ئامانجە نەتەوەییەکانی ئێران، چونکە ئامانج و بەرژەوەندی نەتەوەیی لە سەر بنەمای بەها سەرەکی و بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگە دەبێت. ئەم دووانەیی نەریت و مۆدێرن، لە بەرژەوەندی و ئامانجەکاندا دەردەکەوێت، هەروەها دەبێتە هۆی دروستبوونی دوو جۆرە نوخبەی مۆدێرن و نەریتی کە ئامانجی جیاوازیان هەیە لە سیاسەتی دەرەوەدا و بە لاچوونیان یان هاتنەسەرکاریان، بە جۆرێك گۆڕانکاری لە سیاسەتی دەرەوەدا ڕوودەدات، بۆ نموونە: لە سەردەمی ڕەفسەنجانی و لە سەردەمی خاتەمیدا، تەکنۆکرات و ڕۆشنبیران کۆنتـرۆڵی سیاسەتی دەرەوەیان کردبوو، بەڵام دواتـر نوخبە بنەماخوازە نەریتییەکان هاتنە سەرکار، ئەمانە هەمووی نیشاندەری ئەم ڕاستییەن.

**دووەم:** ئەم هەلومەرجە گواستنەوەیەی کۆمەڵگەی ئێران جۆرێك لە تەعامول لە سیاسەتی دەرەوەدا زاڵ دەکات کە لە لایەك ویستی گەشەسەندن، نوێبوونەوە و بێلایەنی دروستدەکات، لە لایەکی تـرەوە جۆرێك پێداچوونەوەخوازی لە هەوڵی چاکسازی یان گۆڕینی دۆخی هەنووکەیی سیستەمی نێونەتەوەییدان دێتە ئاراوە. لە لایەکی تـریشیەوە تەعامول لەگەڵ وڵاتانی گەشەسەندوو دەکاتە پێویستیەکی حاشاهەڵنەگر (سجادپور، ١٣٨٣: ص٥ ـ٣ ).

**سێیەم:** کاریگەری لە سەر چۆنیەتی دروستکردنی بڕیار و سیاسەت دارشتنی دەرەوە دەردەکەوێت، بۆ نموونە: تایبەتمەندی سیاسەتی دەرەوەی تاك تەوەر، دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵگەی نەریتی، بەڵام تایبەتمەندی سیاسەتی دەرەوەی

دامەزراوەیی و لە سەر بنەمای بەرژەوەندی نەتەوەیی دەگەڕێتەوە بۆ كۆمەڵگەی مۆدێرن كە لە ئێراندا، لە نێوان هەر دووكیاندایە.

**چوارەم:** كێشە و قەیرانەكانی دەوڵەت وەك قەیرانی ناسنامە، وادەكات كە پەیوەندییەكانی كۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ وڵاتانی تر هەروەها ڕۆڵی جیاواز و تەنانەت دژبەیەكی لە سیاسەتی دەرەوەدا، دەربكەوێت، یان قەیرانی ڕەوایەتی ناوخۆیی جۆرە گوشارێك لە سەر سیاسەتی دەرەوە و بڕیارەكانی دروستدەكات، ئەمانەش ئاماژەیە بۆ كاریگەری ئەم فاكتەرە (دهقانی فیروزآبادی، ١٣٨٨: ص ٢٣٣). روح الله رمضانی، لێكۆلەری بواری سیاسەتی دەرەوەی ئێران، بڕوای وایە كە كۆمەڵگەی ئێرانی لە سەردەمی پەهلەوی تا ئێستا بەردەوام لە دۆخی گوزار و گۆڕانكاریدایە و ناسەقامگیرە. بۆیەش ئێمە ئەم ناسەقامگیریە لە سیاسەتی دەرەوەی ئێراندا دەبینین، هەروەها ناوبراو بڕوای وایە كە ئامانجە ئابوورییەكان و پاراستنی یەكپارچەیی وڵات لە بنەما قبوڵ كراوەكانی نێونەتەوەین، بەڵام ئامانجەكانی پێكهێنانی جەمسەری ئیسلامی و پشتیوانی لە بزوتنەوە ڕزگاریخوازەكان و دژایەتی ڕۆژئاوا و... هتد، لە لایەك لە كۆمەڵگەی نێونەتەوەیی خوازراو و ویستراو نییە. لە لایەكی تریشەوە لەگەڵ تواناكانی كۆماری ئیسلامیدا هاوتەریب و گونجاو نییە (رمضانی، ١٣٨١: ص ١٨ ).

### (٢-٦-٥)- پێكهاتەی دانیشتوان:

تایبەتمەندی مرۆڤی و دانیشتوانی ئێران وادەكات كە كاریگەری لە سەر سیاسەتی دەرەوەی هەبێت. كۆمەڵگەی ئێران، كۆمەڵگەیەكی گەنجە، كە وادەكات دەوڵەت داواكارییەكانی خۆشگوزەرانی ئابووری و دامەزراندن و نیشتەجێبوون و... هتد، بەرەو ڕووی بێتەوە، ئەمەش وادەكات سیاسەتی دەرەوەی ئێران هەوڵی پڕكردنی ئەم پێداویستیانە لە تەعامول لەگەڵ جیهانی دەرەوەیدا بدات، یان

ڕەخنەکانی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی لە ئازادییەکانی ژنان لە ئێران کە کێشە بۆ پێگەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە دەرەوە دروستدەکات یاخود پێکهاتەی نەتەوەیی، ئێتنیکی، زمانی، ئایینی و مەزهەبی کۆمەڵگەی ئێران کە بە چەندین شێوە کاریگەری لە سەر سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران هەیە:

یەکەم: کێبــرکێ و داواکاریەکانی خوارنەتەوەیی، کە بەرژەوەندی نەتەوەیی دەخاتە ژێر کاریگەری خۆی، بۆ نموونە دانیشتوانی سنوورەکانی ئێران کە لە نەتەوە جیاوازەکان و کەمینە مەزهەبیەکانن وادەکات کە ئاسایشی سنوورەکان و یەکپارچەیی ئێران و یەکێتی نەتەوەیی لە بەردەم مەتــرسی دابێت و ڕەواندنەوەی ئەم مەتــرسیانە ببێتە ئەولەویەتی ئامانج و بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران. دووەم: نفووز و کاریگەری ئەکتەرە دەرەکییەکان لە ئێراندا بەرزدەکاتەوە، بە هۆی ئەو جیاوازییانەی کۆمەڵگەی ئێران کە ئەمەش کاریگەری لە سەر پەیوەندی ئێران و ئەو دەوڵەتانە دەبێت، کە بەرجەستەتــرینیان سیاسەتی دەرەوەی ئێرانە لە عێراق کە لە ژێر کاریگەری نیگەرانییەکانی ئێراندایە لە گۆڕانکاریەکانی کوردستانی عێراق و کاریگەری لە سەر کوردەکان لە ئێراندا. هەروەها یەکێك لە هۆکارەکانی نزیکبوونەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران و دروستکردنی پەیوەندی و هاوکاری لەگەڵ ئەرمەنستان و یۆنان، سیاسەتەکانی دەوڵەتانی کۆماری ئازەربایجان و تورکیا بووە کە کاریگەریان لە سەر نەتەوەی ئازەری و تورکەکانی دانیشتووی ئێران کە ژمارەیەکی بەرچاون هەیە، لە ڕێگەی هاندان و پاڵپشتی ئەو وڵاتانەوە.

ئێران بەردەوام مەتــرسی جیابوونەوە یان شۆڕشی ئەو نەتەوانەی هەیە. هەروەها ڕەخنەی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ لە ئێران دەربارەی پرسی کەمینە نەتەوەیی و مەزهەبیەکان لە ئێراندا، کە کاریگەری لە سەر سیاسەتی دەرەوە و پەیوەندییەکانی ئێران و دەوڵەتانی تــر هەبووە، هەرچەندە کۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵیداوە کە ئەم فاکتەرە بە پێچەوانەوە بۆ نفووزی خۆی

سوودی لێوەرگرێت. هەروەها ناتوانین ڕۆڵی توێژی مەلاكان و كاریگەریان لە سەر كۆمەڵگەی مەزهەبی ئێران و ئاراستەكردنیان لە ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەی ئێران، كە بەرەو ئایدۆلۆژی بوونی رەهای دەبات، فەرامۆش بكەین. هەروەها ڕۆڵی دامەزراوەكانی ئایینی وەكو:حەوزەی عیلمیە، مزگەوتەكان، ئەنجومەنە ئیسلامییەكان، بازاریە نەریتیەكان یاخود گروپە توندڕەوە چەكدارەكان، وەك بەسیج و ململانێ رەوتە توندەڕەو یان میانەڕەوەكان و كاریگەرییان لە سیاسەتی دەرەوەی ئێران، دەبێت لە بەرچاو بگرین (دهقانی فیروزآبادی، ١٣٨٨: ص ٢٣٨-٢٣٤).

## (٣ـ٦ـ٥)- كولتوور و كولتووری سیاسی:

بەهاكان و تایبەتمەندییەكانی كولتووری سیاسی هەر وڵاتێك رۆڵێكی گرنگی لە سەر پێكهاتنی ناسنامەی ئەو وڵاتە هەیە. بە مانایەكی تـر لە ئاستی نەتەوەییدا، كولتوور بە گشتی و كولتووری سیاسی بە تایبەت وەكو سیستەمی باوەڕەكان و مانا نێوان زەینییەكانی هاوبەش، ناسنامەی وڵات دروستدەكەن. لێرەوە كولتووری سیاسی وەكو یەكێك لە ڕەهەند و سیماكانی كولتووری گشتی كە ڕەهەندەكانی سیاسی كولتوور دەگرێتەوە، یان ئەو ڕەهەندە تایبەتانەی كولتووری گشتی كۆمەڵگەیە كە تایبەتە بە ژیانی سیاسی و دەرئەنجامی ئەزموونی مێژوویی نەتەوەكەیە لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ڕووداو و دیاردە سیاسییەكان، كە سیمبۆل، ئەدەبیات، بەها و ئەفسانەیی لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە كە كاریگەریان لە سەر ژینگەی سیاسی هەیە (مصلی نژاد، ١٣٨٧: ص٤٥ـ٤٢). ڕۆڵی كولتوور بە گشتی و كولتووری سیاسی بەتایبەت لە سەر سیاسەتی دەرەوە، كاریگەری لە سەر دامەزراوە و پێكهاتەكانی حكومی هەیە، واتا پێكهاتەكانی حكومەت و چۆنیەتی پەیوەندیان و ڕۆڵ و پێگەیان لە سیاسەتی دەرەوەدا و جۆری تەعامول لە نێوان ئەندامان و دامەزراوەكان لە سیاسەتی

دەرەوەدا بە پێی کولتووری ئەو کۆمەڵگەیە دەردەکەوێت. بۆ نموونە ڕۆڵ و کاریگەری زانایانی ئایینی لە سیاسەتی دەرەوەی سیستەمە سیاسییەکانی ئایینیدا، زۆر زیاترە لە ڕۆڵیان لە سیستەمەکانی تردا (نقیب زاده، ١٣٨١: ص٣٥ـ٣٤). بە شێوەیەکی گشتی بە پێی ڕوانگە یاخود تیۆری کۆنستراکتیڤیزم کولتووری هەر وڵاتێك بە سێ شێوەی سەرەکی پەیوەندی لەگەڵ سیاسەتی دەرەوەدا پەیدا دەکات:

١ـ بیروباوەڕە ئۆستورەییەکان لە خۆ دەگرێت کە ئەزموونەکانی مێژوویی نەتەوەییەك و ڕێبەران و نوخبەکان و ڕوانگە و تێگەیشتنێك کە ئەوان دەربارەی ڕۆل و پێگەی ئێستای وڵاتی خۆیان لە گۆڕەپانی جیهانیدا هەیانە.

٢ـ ئەو وێنا و تێگەیشتنەی کە نوخبە زانستی و سیاسی و تەنانەت خەڵکیش دەربارەی دەوڵەتانی تر و نەتەوەکانی تر یان دامەزراوە و ڕێکخراوەکانی تری نێونەتەوەیی لە زەینی خۆیاندا دروستیان کردووە.

٣ـ ئەو ئادات و بۆچوون و ڕوانگەیەی کە بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفت و کێشەکان بە گشتی و ململانێ و کێشەکانی نێونەتەوەیی بە تایبەت هەیانە (قوام، ١٣٨٤: ص٢٩١). چوارچێوەی کولتووری نەتەنیا لە سەر پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان شوێندانەری هەیە، بەڵکوو شوێنەوار و دەرەئەنجامەکانی دەتوانین لە سەر جیۆپۆلەتیك و ژیۆکالچەری سیستەمی نێونەتەوەییدا ببینین. بۆ نموونە گرنگترین ڕۆڵی شۆڕشی ئیسلامی لە مەیدانی عەرەبی ـ ئیسلامیدا، بەرجەستەکردنی کولتووری ئیسلامییە، کۆماری ئیسلامی ئێران خۆی وەك پێشەنگی بەربەرەکانی لەگەڵ کولتووری ڕۆژئاوا ناساندووە، حکومەتی ئیسلامی ئێران لە سەر بنەماکانی ئیسلام و ولایەتی فەقیە، ئەم ڕێبەرایەتیە دژی ڕۆژئاوا و ناموسوڵمانان دەکات، کە بۆتە هۆی مەترسی بۆ دەوڵەتانی عەرەبی ئیسلامی لە لایەك و لە لایەکی ترەوە مەترسی بۆ سەر ڕۆژئاوا (ابوالنصر، ١٣٧٨:

ص١٢٦). گراهام فولێر، سەربەخۆییخوازی ئێرانییەکان بە دەرهاویشتەی هەستی کولتووری دەوڵەمەند و ئیمپراتۆری پڕشکۆی رابــردوو و لە لایەکی تــرەوە سەرچاوەگرتوو لە نەبوونی ئاسایشی نەتەوەیی لە ئەنجامی شکستەکان و دەسەڵاتی بێگانەکان لە سەدەکانی رابــردوو دەزانێت (فولر، ٣٧٣١: ص١). بەم پێیە هەستی سەربەخۆییخوازی ئێرانییەکان بە سەرچاوەگرتوو لە هێرشی وڵاتان بۆ ئێران و دەستیوەردانی وڵاتانی تــر لە کاروباری ناوخۆیی دەزانرێت بۆ نموونە گرێبەستەکانی ساڵەکانی (١٩٠٧)، (١٩٠٩)، گوڵستان و تورکمانچای، لە سەدەی نۆزدە و بیستدا، کە لە لایەن فەرانسا و بەریتانیا و رووسیا بە سەر ئێراندا سەپێنراوە، ئەم زەینییەتەی لە بیرەوەری بەکۆمەڵی ئێرانییەکان دروستکردووە، کە ئەمەش بۆتە هۆی هەستی دژایەتیکردنی بێگانەکان و سەربەخۆییخوازی لە کولتووری سیاسی ئێرانییەکان و ئەم هەستیاریە لە هەمبەر سەربەخۆیی وڵات، هەڵقوڵاوی ئەوهەستە مێژووییە و بەشێکە لە کولتووری سیاسی ئێرانییەکان (دهقانی فیروزآبادی، ١٣٨٨: ص ٢٢٣). یەکێکی تــر لە تایبەتمەندیەکانی کولتووری سیاسی ئێران، کە دەگەرێتەوە بۆ هەستی سەربەخۆییخوازی، ستایش و رێزلێنان لە ئەو سیاسەتمەدارە ئێرانیانەیە کە هەوڵیانداوە سەربەخۆیی ئێران لە پەیوەندی دەرەکیدا دەستەبەر بکەن، بۆ نموونە میرزا تەقی خانی ئەمیرکەبیر، راوێژکاری سەردەمی ناصرالدین شای قاجار، کە بۆ یەکەم جار سیاسەتی بێلایەنی ئێرانی لە ململانێیەکانی رووسیا وبــریتانیا راگەیاند، کە تەنانەت رەفسەنجانی سەرۆك کۆماری پێشووتــری ئێران، ئەمیرکەبیر بە قارەمانی دژایەتی ئیستعمار و نوێنەری راستەقینەی سەربەخۆییخوازی لە ئێرانی دەزانێت (هاشمی رفسنجانی، ١٣٦٤: ص٤٥). یان موحەممەدی موسەدیق، باوکی خۆماڵی کردنی نەوت لە ئێران لە ساڵی(١٩٥٠)، زۆر جێگەی شانازی ئێرانییەکانە بە هۆی ئەوەی کە دژی بەریتانییەکان هەڵوێستی توندی نواندوە

(ازغندی، ١٣٨٨: ص٣٣). تەنانەت لێکۆڵەرێکی ئێرانی بە ناوی روح الله رمچانی، دەربارەی سەربەخۆییخوازی ئێرانییەکان دەڵێت: (( بەهەمان ڕادە کە لە شۆڕشی ساڵی (١٩٧٩)دا، خەڵك دژی سیاسەتە ناوخۆییەکانی شای ئێرانبوون، بە هەمان ڕادەش لە سیاسەتی دەرەوەی شا، نارازیبوون کە لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هاوپەیمان بوو و بە شای ئێرانیان دەگوت شای ئەمریکایی)) (رمضانی،١٣٨٣: ص٤٦).

یەکێك لە دەرهاویشتەکانی سەربەخۆییخوازی ئێرانییەکان لە کولتووری سیاسی کۆماری ئیسلامی ئێران، بێ متمانەییە لە هەمبەر ڕۆژئاوا و بە تایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە کولتووری سیاسی ئێراندا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك گەورەتـرین هێز ڕووبەڕووی کۆماری ئیسلامی ئێران دەبێتەوە لە ناوچەکە. بۆیە سیاسەتمەدارە ئێرانییەکان دەبێت هەوڵی بەرەنگاربوونەوە لە هەمبەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و سیاسەتەکانی بدەن (فولر، ١٣٧٣: ص٢٨٥). هەروەها ئایدیالیزم، یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی کولتووری سیاسی ئێرانییەکان کە هەندێ جار ئەمە بە جیهانگەرایی، ویستـراوخوازی، خۆتەوەری، پێناسەی بەربلاو لە ڕۆڵ، پێگە و بەرژەوەندی نەتەوەیی و لە کۆتاییدا بە توندڕەوی تەعبیر دەکرێت، کە ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ مێژووی ئێرانییەکان وەك هێزێکی بەشکۆ و بەهێز، کە ئەمە وایکردووە ئێرانییەکان خۆیان بە ناوەندی سیستەمی نێونەتەوەیی بزانن. ئەمەش بۆتە جۆرێك لە خۆ بەگەورەزانین و هەڵە کردن لە هەڵسەنگاندنی وردی تواناکانیان و هەروەها ڕاستییەکان (فولر، ١٣٧٣: ص٣٥ـ٣٤). بە گشتی کولتووری سیاسی لە ئێران سروشتێکی ئارمانگەرایانەی هەیە کە ئەمە دەربـڕی ڕۆحی ڕەخنەیی ئێرانییەکانە لە هەمبەر ژینگەی دەوروبەر، بۆیە ئێرانییەکان هەوڵ دەدەن کە ژینگەی سیاسی و نێونەتەوەیی بە پێی پێوەر و تایبەتمەندییەکانی خۆیان هەڵسەنگێنن کە لە کولتووری ئێراندا، بە ئێرانشار دەناسرێت (جهانگیر و یوسف نیا، ١٣٩١: ص١٤٠).

بەڵگەنامەی ڕوانگەی بیست ساڵەی كۆماری ئیسلامی ئێران، یەكێكی تــرە لە سیماكانی ئارمانگەرایی كۆماری ئیسلامی ئێران، لەم بەڵگەنامەیەدا كۆماری ئیسلامی ئێران وەك وڵاتێكی خاوەن پێگەی یەكەم و سەرەكی لە ڕووی ئابووری، زانستی و تەكنۆلۆژیا لە ئاستی ناوچەی ئاسیا و ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناسێنراوە، كە دەبێت لە ماوەی بیست ساڵدا (٢٠٢٥تا٢٠٠٥)، ببێتە هێزی یەكەمی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. هەروەها كۆماری ئیسلامی ئێران وەك هێزی یەكەمی وڵاتانی ئیسلامی ناسێنراوە كە دەبێت ئەم سیستەمە ببێتە مۆدێل یاخود نموونەیەك بۆ هەموو وڵاتانی ئیسلامی (جعفری ارجمند، ١٣٨٨: ص٦٧). لێرەوە بە پێی تیۆری كۆنستــراكتیڤیزم بۆمان دەردەكەوێت كە فاكتەر و ڕەگەزە مێژوویی و كولتووریەكان بە چ شێوەیەك كاریگەری لە سەر زەینییەت و تێگەیشتنی بكەرەكان لە خۆیان و لە جیهانی دەرەوەیان دروستدەكەن، ئەم زەینییەتەش دەبێتە هۆی ڕەفتاری تایبەت بە كۆماری ئیسلامی لە سیاسەتی دەرەوەیدا، هەروەها پێناسە كردنی دۆست و دوژمن لە سەر ئەم بنەما هزری و ناسنامەییانە، راوەستاوە.

## (٤ـ٦ـ٥)- كێبــركێ و ململانێ نێوان ئایدیالیست و ریالیستەكانی ناوخۆ:

كێبــركێ و ململانێیە ناوخۆییەكانی نێوان رەوتە سەرەكییەكان لە كۆماری ئیسلامی ئێران و ڕوانگەیان بۆ ڕۆڵ و سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران لە لایەك، لە لایەكی تــرەوە پێگە كۆمەڵایەتییەكان هەروەها ڕۆڵیان لە ئاراستە كردنی سیاسەتی دەرەوەی ئێران هەیە. بۆ نموونە ریفۆرم خوازەكان بە هۆی ئەو پێگە كۆمەڵایەتییەی كە ڕۆشنبیران و چینی ناوەڕاست هەیانە، زیاتــر مەیلیان بۆ باشتــركردنی پەیوەندییەكان لەگەڵ ڕۆژئاوا هەیە. بەڵام بنەماخوازەكان دژایەتی نزیكبوونەوە لەگەڵ ڕۆژئاوا دەكەن، بە هۆی پێگەی كۆمەڵایەتی خۆیان لە نێو

بەشی نەریتی کۆمەڵگە و زیاتــر جەخت لە سەر ناوچەگەرایی و پەیوەندی لەگەڵ چین و رووسیا و هیندستان دەکەنەوە، یاخود بۆ نموونە داواکاری ئەندامیەتی کۆماری ئیسلامی ئێرانن لە پەیمانی شانگهای لە بــری ئەندامەتی لە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی (سیف زاده، ١٣٨٤: ص١٦٨).

فرێد هالیدی، کە توێژینەوەی لە سەر کۆمەڵگەی ئێرانی هەیە، بڕوای وایە کە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، ئەوەندە لە ژێر کاریگەری پرسە ناوخۆییەکاندایە کە ژینگەی نێونەتەوەیی فەرامۆش کردووە (هالیدی، ١٣٥٨: ص١١٤). محمود سریع القلم، پسپۆر و لێکۆلەری ئێرانی بڕوای وایە کە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران بە هۆی کاریگەری بگۆڕەکان یان فاکتەرەکانی ناوخۆیی وەکو: تاکەکەسی، ڕۆڵ یان پێگە، حکومەت و فاکتەری کۆمەڵایەتی زیاتــر لە فاکتەرەکانی نێونەتەوەیی، لە ژێر کاریگەری ئایدۆلۆژیا و زەینییەتی نوخبە سیاسییەکاندا بووە. واتا سیاسەتی دەرەوەی ئێران درێژەپێدەری سیاسەتی ناوخۆیی بووە، هەروەها ئەم سیاسەتە بە پێی بیروبروا و شێوەی بەڕێوەبــردنی حکومەت و ڕوانگەی ڕێبەرانی ئێران بۆ گۆڕانکاریەکانی سیستەمی نێونەتەوەیی لە نێوان ریالیزم و ئایدیالیزمدا لە هاتووچۆدا بووە (سریع القلم، ١٣٨١: ص٧٥). ململانێ نێوان ریالیزم و ئایدیالیزم یەکێك لە کێشە تیۆریکەکانی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامییە کە دروستکەرانی بڕیار تێیدا ڕووبەڕووی ئەم پرسیارە دەکاتەوە کە ئایا بە ڕوانگەی ئایدیالیستیەوە لەسەر هەناردەکردنی شۆڕش و بەهاکان خوازیاری گۆڕانی بنەڕەتیی لە پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی بن و پشتیوانی ماددی و مەعنەوی گروپەکانی دەرەوەی ئێران کە ئایدۆلۆژیای هاوبەشیان هەیە بکەن یان بە ڕوانگەی ریالیستییەوە، بە جەختکردنەوە لە سەر سنوورەکانی توانا و هێزی ئێران و کاردانەوەی سیستەمی نێونەتەوەیی لە هەمبەر شۆڕشی ئیسلامی، ڕەفتارێکی پارێزگارانە و

پراگماتیستیان هەبێت و لە جێگەی بڵاوکردنەوەی بیروبڕوا و ئایدۆلۆژیای شۆڕشگێرانە و ئیسلامی، تەنیا بیروبڕواکانیان بۆ نەتەوەکانی تـر ڕوون بکەنەوە و هەروەها پەیوەندی و پیشەسازی بەهێزبکەن و بیکەنە مۆدێلیکی سەرکەوتوو بۆ وڵاتانی تـر؟ (دهشیری، ١٣٨٠: ص٥٢). لێرەوە دەتوانین بڵێین کە بە شێوەیەکی گشتی لە ناو خودی نوخبە سیاسییەکانی ئێران دوو خوێندنەوە یاخود لێکدانەوە بۆ ئایدۆلۆژیای کۆماری ئیسلامی هەروەها سیاسەتی دەرەوە لە ئێراندا بوونی هەیە: یەکەمیان ئایدیالیستەکانن و دووهەمیان ریالیستەکانن.

### (٥ـ٦ـ٤ ـ١)- ئایدیالیستەکان:

کۆماری ئیسلامی ئێران لە ڕووی تیۆرییەوە بڕوا و پابەندبوونی بە ڕێسا و بنەمای نەفی سبیل، لە ڕووی فیقهیەوە هەیە، لە ڕووی پراکتیکیشەوە سیاسەتی پشتیوانی لە بزوتنەوە ئیسلامییەکان لە وڵاتانی ئیسلامی و سیاسەتی نە شەرقی و نە غەربی، کردە بنەما و بیرۆکەی هەناردەکردنی شۆڕشی گرتەبەر، هەروەها لە هەوڵی پێکهێنانی بەرەیەکی دژە سیستەمی نێونەتەوەیی دووجەمسەری دابوو، ئەمەش وایکرد کە ڕۆژئاوا، ئێران بە هاوپەیمانی تیرۆریزمی نێونەتەوەیی بناسێنێت. بەڵام جەنگی هەشت ساڵەی ئێران و عێراق، ئەم ئایدیالیزمەی کۆماری ئیسلامی ئێرانی دامرکاندەوە و وایکرد کۆماری ئیسلامی ئێران لە فکری پاراستنی یەکپارچەیی خاکی خۆی دابێت و دروشمی ((جەنگ جەنگ تا سەرکەوتن)) شکست بێنێت و ئێران پابەندبێت بە هەندێ پێوەر و یاسای نێونەتەوەیی (امینی، ١٣٩٢: ص١٦٦).

بە گشتی دەتوانین بیروباوەڕی بنەماخوازە توندڕەوەکان بەم شێوەیە پۆلین بکەین: ١- بنەما خوازەتوندڕەوەکان لە سەر پەیوەندی و ڕۆڵی ئایین لە کۆمەڵگە و سیاسەتدا بڕوایان بە سەروەری ڕەهای ئایین لە سەر هەموو پرسەکاندا هەیە.

٢- بنەماخوازەکان، دەربارەی پرسی ئازادی، ڕەخنە لە ئازادی بەمانا مۆدێرنەکەی دەگرن و زیاتر جەخت لە سەر دادپەروەری کۆمەڵایەتی و ئابووری دەکەنەوە هەروەها ڕۆڵی بەرفراوانی دەوڵەت. ٣- بنەماخوازەکان دەربارەی پەیوەندی ئایین و بەها لیبراڵەکان بڕوایان وایە کەئەمانە دژ بە یەکترین. ٤- بنەماخوازەکان لە پەیوەندی لەگەڵ سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا، خەبات دژی ئێمپریالیزم و ئیستکباری جیهانی و ڕۆژئاوا و ئیسرائیل و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکەنە بنەمای سەرەکی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەت (قریشی، ١٣٨٨: ص٢٢٦).

لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا، ئایدیالیستەکان بڕوایان وایە کە ئایدۆستراتیژی لە سەروو ژیۆستراتیژی دایە. لەم سۆنگەیەوە ئایدیا و بنەماکانی وەك: دادپەروەریخوازی، خێرخوازی، مرۆڤدۆستی و ئەخلاقگەرایی، دەبێت ڕێگە نیشاندەری ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوە بێت، هەروەها ئەگەری گۆڕانکاری لە سیستەمی هەنووکەیی بۆ سیستەمێکی ویستراو هەیە و بە جەختکردنەوە لەسەر تواناکانی کۆماری ئیسلامی بۆ ڕێکخستنی شۆڕشی هاوشێوە لە وڵاتانی تر، پاڵپشتی سیاسی و هەناردەکردنی یارمەتی بۆ بزوتنەوەکانی رزگاریخوازی ئیسلامی و بزوتنەوەکانی تری دژە ئێستعماری لە جیهاندا، پێداگری دەکەن و ئەولەویەت دەدەنە پەیوەندی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ وڵاتانی ئیسلامی (ازغندی، ١٣٨١: ص١٢).

هەروەها ئایدیالیستە ئیسلامییەکان لەسەر ئەو بڕوایەن کە بۆ بەدیهێنانی ئایدیا ئیسلامییەکانیان پێویستە بە بێ گرنگی پێدان بە تێچووە ماددیەکان هەوڵ بدەن، هەروەها وتەکانی ئایەتوڵڵا خومەینی لە دژی زلهێزەکانی سیستەمی نێونەتەوەیی بە بنەما وەردەگرن، بڕوایان وایە کە دەبێت دژی نادادپەروەری لە جیهاندا خۆراگری بکەن و بەرژەوەندی خۆیان ڕەچاو نەکەن (دهقانی فیروز آبادی،

١٣٨٤: ص٧٩). هەروەها ئایدیالیستە ئیسلامییەكان، جیهان بە سەر دوو بەرەی دارولحەرب و دارولئیسلامدا، دابەشدەكەن و بڕوایان وایە كە دەبێت هەموو تواناكانیان بخەنەگەڕ بۆ ئەوەی كە لە ڕێگەی شۆڕشی بەردەوام لە وڵاتانی ئیسلامی و خەبات لە دژی ڕێبەرانی كوفر، حكومەتی جیهانی ئیسلام پێك بهێنن (دهقانی فیروز آبادی، ١٣٨٤: ص ٩٢).

**(٢-٤-٦-٥)- ریالیستەكان:**

ریالیستەكان لە كۆماری ئیسلامی ئێراندا، گرنگی بە پەیوەندی ئاشتیانە و پەیوەندی ئابووری لەگەڵ وڵاتانی تـر دەدەن وخوازیاری بەهێز كردنی ئاسایشی نەتەوەیین، لە ڕێگەی دابین كردنی بەرژەوەندییە نەتەوەییەكان و گەشەپێدانی ئابووری، دروستكردنی پێوەندی بەهێز لەگەڵ وڵاتاندا. هەروەها بڕوایان وایە كە بە هۆی گۆڕانكارییەكانی ژینگەی ناوچەیی و نێونەتەوەیی، گۆڕانكاری لە ڕەفتاری ئەكتەرەكان و پێداویستیەكانی ناوخۆیی ئێران، سیاسەتێكی پراگماتیستی پەیڕەو بكەن بۆ مانەوە و بەردەوام بوونی كۆماری ئیسلامی ئێران بە پێی بنەمای فیقهیی (الضرورات تبیح المحظورات)، واتا زەرورەتەكان بابەتە قەدەغە كراوەكان ڕەوا دەكەن (قامت، ١٣٩٠: ص١٨٢).

بە شێوەیەكی گشتی بیروڕای ریفۆرمخوازەكان یاخود ریالیستە ئیسلامییەكان دەتوانین بەم شێوەیە پۆلین بكەین: ١- ریالیستە ئیسلامییەكان بڕوایان وایە كە ئایین بە گشتی (ئایدۆلۆژیای شیعەی دووازدە ئیمامی) لە بواری ئامانجە سەرەكییەكانی جیهان و ژیان و مرۆڤایەتی و دەربارەی بەهاكان و حوكمڕانی لە خۆ دەگرێتەوە، بەڵام شێواز و چۆنیەتی بەڕێوەبـردنی كۆمەڵگە و حكومەت پەیوەندی بە زانست و عەقڵەوە هەیە. ٢- ریالیستە ئیسلامییەكان دەربارەی ئازادیەوە، بڕوایان بە گەڕانەوە بۆ ڕای خەڵك هەیە. ٣- ریالیستە ئیسلامییەكان

دەربارەی پرسی پەیوەندی نێوان ئایین و بەها لیبـرالەکان باوەڕیان وایە کە ئایین دژایەتی لەگەڵ بەها لیبـرالەکان نییە، تەنیا لە هەندێ بواری تاکەکەسیدا نەبێت.

٤- پێوەری ریالیستە ئیسلامییەکان بۆ سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، بەرژەوەندی نەتەوەییە (قریشی، ١٣٨٨: ص٢٢٧). بە گشتی لەم ڕوانگەیەوە ریالیزم لە سیاسەتی دەرەوە، لە ژێر ناونیشانی چەمکێکە بە ناوی (عەقلی سەلیم) کە لە دەورەیەکی زەمەنیدا درك و تاقیکردنەوە دەکرێت، واتا جۆرە عەقلانییەتێکی تایبەت کە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی و تێگەیشتنی بکەرەکان ڕاوەستاوە. لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا و لە دیپلۆماسی و هەندێ جار پەیڕەو کردنی پێوەرەکانی نێونەتەوەیی یان گرنگیدان بە دامەزراوە نێونەتەوەییەکاندا دەردەکەوێت، بەڵام بە مەرجێك کە دژی ئەو بنەما و پرەنسیپە بنەڕەتییانەی ناسنامەی ئیسلامی ـ شۆڕشگێرانە و کۆماری ئیسلامی نەبێت (گاهایی، ١٣٨٨: ص٩٢). هەروەها ئەم ریالیستیە ئیسلامییە بە جۆرێك بۆتە نەریتی سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هەڕەشە و مەتـرسییەکانی سەر مانەوەی کۆماری ئیسلامی، هەروەکو پێشووتـریش لە ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا بینراوە، بۆ نموونە ئازادکردنی بارمتەکانی باڵیۆزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران، یاخود قبوڵ کردنی بڕیاری ژمارە (٥٩٨)ی ئەنجوومەنی ئاسایش، یان هاوکاریکردن لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کاتی هێرش بۆ سەر عێراق و ئەفغانستان و...هتد، کە ئێرانییەکان ناوی لێدەنێن (تەعامولی بنیاتنەر)[1]، یاخود خۆگونجاندنی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی ژینگەیی بە پێی (یاسای ئاسنی جیۆپۆلەتیك) [2] (متقی، ١٣٩١: ص١٧٢).

---

1 Constructive Interaction
2 The Iron Law of Geopolitic

بە پێی بنەماكانی تیۆری كۆنستراكتیڤیزم، لێرەدا ڕۆڵی زەینییەت و تێگەیشتنی بكەرەكانی ناوخۆیی بە پێی بنەما بەهایی و هزریە ئایینی-ئایدۆلۆژییەكان لەسەر دروستبوونی ئامانج و بەرژەوەندی تایبەت بە بێ ڕەچاو كردنی بەها و پێوەرە پێكهاتەییە نێونەتەوەییەكان لە لایەن ئایدیالیستە ئیسلامییە توندڕەوەكان، هەروەها كاریگەریان لە ئاراستە كردنی ڕەفتار و ستراتیژی سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران دەردەكەوێت. بۆشمان ڕوون دەبێتەوە كە توندڕەوە ئایدیالیستەكان لە سەر چ بنەمایەكی ناسنامەیی لە ڕاستییە نێونەتەوەییەكان تێدەگەن، یاخود خۆیان و ناسنامەی كۆماری ئیسلامی ئێران وەك بكەرێك پێناسە دەكەن یاخود بەرژەوەندی و ئامانجەكانیان بنیاتدەنێن و بە پێی ڕوانگەی ناسنامەیی هۆكارەكانی ئەم دوژمنایەتی و ناكۆكی و ململانێیانەی كۆماری ئیسلامی و ڕۆژئاوا یاخود وڵاتانی ناوچەكەمان بۆ دەردەكەوێت. هەروەها ئەم بنەما ناسنامەییە بۆ ریالیستە ئیسلامییەكانیش هەر ڕاستە لە سەر تێگەیشتن لە خۆیان و ئەوی تر و بەها وپێوەرە نێونەتەوەییەكان. عەقلانییەتی تایبەت بەخۆیان بۆ ئامانج و بەرژەوەندی و ئاراستەكردنی كردنی سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران بە پێی فاكتەرە ماددیەكان یاخود ڕاستییەكان، بۆ نموونە جیۆپۆلەتیك.

## (٧.٥)- كاریگەری جیۆپۆلەتیك و ئابووری كۆماری ئیسلامی ئێران لەسەر سیاسەتی دەرەوە:

### (٥ـ٧ـ١)- جیۆپۆلەتیك:

پێگەی جیۆپۆلەتیكی ئێران فاكتەر یاخود ڕەگەزێكی جێگیری بكەرایەتی و كاریگەرە لە سیاسەتی دەرەوەی ئێراندا. لە پێناسەی جیۆپۆلەتیكدا، پیروز مجتهدزادە دەڵێت: ((جیۆپۆلەتیك بریتییە لە ئامانجی دروستكردنی هاوسەنگی هێز لەگەڵ لایەنەكانی تر لە ئاستی ناوچەیی و جیهانی بە ئاراستەی دەستەبەر

کردنی ئاسایش بۆ پاراستن و پەرەپێدانی بەرژەوەندی نەتەوەیی)) (مجتهد زادە، ١٣٨٠: ص٢٣).

ئێران سێ تایبەتمەندی سەرەکی و گرنگی جیۆپۆلەتیکی هەیە، یەکەم: ئەو وڵاتە گرێدراوە بە ئۆراسیا. دووەم: کەنارەکانی کەنداوی فارس و دەریای عمان. سێیەم: کۆنتـرۆڵی گەروی هۆرمۆز، کە یەکێکە لە شادەمارەکانی ئابووری جیهان لە ڕووی گواستنەوەی وزە(نەت و غاز). هەروەها ئێران بە هۆی بارودۆخی تایبەتی ژیۆستـراتیژیك و ژیۆئێکۆنۆمیك، لە ژێر کاریگەریدایە. هەروەها خۆی شوێندانەری هەیە لە سەر بارودۆخی ئاسایشی نێونەتەوەیی و ناوچەیی و تاوەکو ئێستا ئەو ڕەگەزە کاریگەری لە سیاسەتی دەرەوەی ئێراندا هەبووە و ئێرانیش هەوڵ دەدات سیاسەتی دەرەوەی خۆی بە پێی ئەم فاکتەرە بەهێزتـر بکات (آقا محمدی، ١٣٩٠: ص٢٨). کۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵ دەدات لە پێگە جیۆپۆلەتیکەکەی سوودی فراوان ببینێت و دوو ناوچەی ستـراتیژیکی گرنگی قەوقاز و ئاسیای ناوەڕاست و کەنداو، کۆنتـرۆڵ بکات، یان لانیکەم نفووزی هەبێت و پێکەوەیان گرێبدات. بۆ نموونە ئێران لە ڕووی ئابوورییەوە هەوڵی هاوکاریەکی ڕێژەیی لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپایی دەدات یان لە ڕووی وەبەرهێنانەوە هەوڵ دەدات کە وڵاتی چین لە ئێراندا وەبەرهێنان بکات، هەروەها پەیوەندی ئابووری و سیاسی لەگەڵ ژاپۆن دروستبکات و لەگەڵ هیندستان و ڕووسیاش پەیوەندی ستـراتیژی هەبێت (دهشیری، ١٣٨٣: ص٤٥).

فاکتەری جیۆپۆلەتیکی سەرەڕای دەرفەت، بەربەست و سنووریشی بۆ سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران داناوە، بۆتە هۆی هەمووارکردنەوە یان دووبارە پێناسەکردنەوەی ناسنامە یان بکەرایەتی کۆماری ئیسلامی. لێرەوە بە پێی تیۆری کۆنستـراکتیڤیزم دەردەکەوێت کە فاکتەر و ڕەگەزە مادديەکانیش بە

چ شێوەیەك کاریگەریان لە سەر ناسنامەی کۆماری ئیسلامی و پاشتریش لە سەر بکەرایەتی ئەم دەوڵەتە لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەییدا هەیە.

### (٢.٧.٥)- پێگەی ئابووری:

### (٥-٧-٢-١)- سیستەمی ئابووری:

سیستەمی ئابووری کۆماری ئیسلامی ئێران، بە پێی دەستور تێکەڵاوە و لە سێ بەشی حکومی و تایبەت و هاوبەش پێکهاتووە، بەڵام هیچ کاتێك لە نێوان ئەم سێ بەشەدا هاوسەنگی نەبووە و بەکردەوە هاوسەنگییەکە لە بەرژەوەندی کەرتی حکوومی و هاوبەشدا بووە. لە سەرەتای شۆڕشی ئیسلامی تا کۆتایی جەنگی ئێران و عێراق، بە هۆی دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووری و گەورەبوونی کەرتی حکومی، ئابووری ئێران بە شێوەی حکومی و ناوەندی بەڕێوە دەچووە بەڵام ئەمە کەمێك پاش کۆتایی ئەو ەجەنگ کەمتربووە و تاڕادەیەك کەرتی تایبەت گەشەی کرد، ئەم جۆرە لە سیستەمە ئابووریە بە تایبەت لەو سەردەمە سیاسەتی دەرەوەی ئێرانیشی خستە ژێر کاریگەری خۆی، یەکەم: بە هۆی کۆنترۆڵی دەوڵەت لەسەر ئابووری و نەبوونی کەرتی تایبەتی بەهێز، گروپەکانی بەرژەوەندی ئابووری ناحکومی ڕۆڵی زۆرلاوازیان لە سیاسەتی دەرەوەدا هەبوو. دووەم: ڕۆڵ و گرنگی ئامانج و بەرژەوەندی ئابووری و خۆشگوزەرانی لە سیاسەتی دەرەوەدا لاواز بوو. سێیەم: ئەم سیستەمە ئابوورییە وایکرد کە ستراتیژی گۆشەگیربوونی کۆماری ئیسلامی ئێران لە سیستەمی نێونەتەوەییدا زیاتر بەرجەستەبێت، واتا یارمەتی ئەم ستراتیژیەی داوە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و ئێمە بینیمان کە لە پاش کۆتایی جەنگ و سیاسەتی ئابووری بە تایبەتیکردن لە سەردەمی سەرۆکایەتی ڕەفسەنجانی، بازرگانی و کێبرکێ تاڕادەیەك ئازادتر، توانی کاریگەری لە سەر سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران دابنێت،

توانی ئامانج و بەرژەوەندی ئابووری (بە هۆی پێداویستیەکانی دوای جەنگ١٩٨٠-١٩٨٨) بێنێتە ناو سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران. تاڕادەیەك ئەم گەشەسەندنە ئابووری و بازرگانییە وایکرد کە پەیوەندی دەرەکی ئێران لەگەڵ جیهانی دەرەوە باشتــر بێت و کۆماری ئیسلامی بە باشتــر کردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتان، هەوڵی هاندانی وەبەرهێنانی بیانی لە ئێراندەدا، بۆ نموونە پەیوەندییەکانی ئێران و وڵاتانی ئەوروپایی و وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست تاڕادەیەك لە ژێر کاریگەری ئەم فاکتەرەدا بووە. بە شێوەیەکی گشتی جۆر و شێوەی سیستەمی ئابووری وڵات بە تایبەت لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا، دەتوانێت کاریگەری بەرچاوی لە سەر شێواز و ئاستی پەیوەندییەکان و سیاسەتی دەرەوە هەبێت (دهقانی فیروز آبادی، ١٣٨٨: ص٢٣٩). بە شێوەیەکی گشتی سیستەمی ئابووری کۆماری ئیسلامی ئێران کە دەرهاویشتەی سیستەمە سیاسییەکە و چۆنیەتی ڕوانینی نوخبە سیاسییە ئایدۆلۆژیکەکانییەتی، کاریگەری لە سەر ئاستی ئابووری و بازرگانی ئێران داناوە، بۆ نموونە قەبارەی هەناردە کردنی ئێران (بە نەوت و غازیشەوە) لە ئاستی جیهانی کە لە ساڵی (١٩٧٥)دا، (٢/٣) بوو لە ساڵی (٢٠٠٠) دابەزیوە بۆ (٠/٥) و لە ساڵی (٢٠٠١ ) بۆ (٠/٤)، هەروەها پلەی ئێران لە بازرگانی جیهانی لە نێوان شەست وڵاتدا پلەی(٥٨) بووە، کە کۆی ئەو ئاماژە و ئامارانە دەربــڕی ئەو ڕاستییەن کە کۆماری ئیسلامی ئێران بە هۆی سیاسەتەکانییەوە گۆشەگیر و دابڕاو بووە (امامی خویی، ١٣٧٩: ص٢٢٠). بە پێی ئامارەکان لە ساڵی (٢٠٠٥)دا، لە ڕووی قەبارەی وەبەرهێنانی بیانی لە کۆماری ئیسلامی ئێران بە قەبارەی تەنها(٣٠ میلیۆن دۆلار) لە ئاستی جیهانیدا پلەی (١٣٠) بووە، کە بە لەبەرچاوگرتنی قەبارەی وەبەرهێنانی وڵاتانێك وەك تورکیا کە (٢٢٣ جار زیاتــر

لە ئێران) و ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی (٤٠٠ جار زیاتـر لە ئێران)، ئاستی نزمی ئەم ڕێژەیەمان بۆ دەردەکەوێت (جوادی ارجمند، ١٣٨٦: ص٨٥).

**(٥-٧-٢-٢) فاکتەری وزە:**

ئابووری کۆماری ئیسلامی ئێران، بە شێوەی سەرەکی لە سەر سەرچاوەکانی نەوت و غاز و داهاتەکەیەتی، ئەمەش ڕۆڵی سەرەکی لە سیاسەتی دەرەوەی ئێراندا دەبێت. لە لایەك ڕۆڵی کۆمەڵگەی مەدەنی وڕای گشتی لە سیاسەتی دەرەوەدا کەمدەکاتەوە، چونکە ئابووری ڕانتیەر و کۆنتـرۆلی لە لایەن دەوڵەتەوە سەربەخۆیی زیاتـردەداتە دەوڵەت، لە لایەکی تـرەوە گۆڕانکارییەکانی بازاری جیهانی وزە کاریگەری لەسەر سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی دەبێت، لە لایەکی تـریشەوە، ئەم سەرچاوانە وادەکات کە ئێران بە پشتبەستن بە داهاتەکانی فرۆشتنی نەوت و غاز سیاسەتێکی پێداچوونەوەخوازی هەبێت لە هەمبەر سیستەمی نێونەتەوەییدا. پشتبەخۆبەستن و دوورکەوتنەوە لە پێوەرەکانی بازاری ئازادی جیهانی و سیستەمی نێونەتەوەیی بکاتە بەرنامەی کاری خۆی یاخود ئەم خاڵە دەتوانێت ببێتە هۆی جۆرێك لە دروستکردنی هاوکاری و پەیوەندی نێوان ئێران و وڵاتانی تـر، وەکو وڵاتانی ئەورووپا، چین و ژاپۆن یان وڵاتانی هەناردەکەری نەوت و غاز. بۆ نموونە سزاکانی ڕۆژئاوا وایکردووە کە کۆماری ئیسلامی ئێران گۆشەگیربێ و لەگەڵ وڵاتانی چین، هیندستان و پاکستان لە سەر هەنارەکردنی نەوت و غاز پەیوەندی هەبێت، کە بە مەبەستی دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤی کڕیاری وزە لە جێگەی وڵاتانی ئەورووپایی و بە گشتی ڕۆژئاوایی بووە (دهقانی فیروز آبادی، ١٣٨٨: ص٢٤٣). کۆماری ئیسلامی ئێران لەو ڕاستییە تێگەیشتووە کە وزە (بە تایبەت نەوت و غاز) بۆ وڵاتانی پیشەسازی و ئابووری جیهانی گرنگی تایبەتی هەیە. ئێران لە پەیوەندیەکانی لەگەڵ جیهانی دەرەوەی خۆیدا، بە تایبەت

لە سیاسەتی دەرەوەیدا سوود لەو فاکتەرە وەردەگرێت، هەروەکو دیڤید هارویێ، لە کتێبی خۆیدا لە ژێر ناونیشانی (ئیمپریالیزمی نوێ)، دەربارەی نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەڵێت: ((هەر کەسێك نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کۆنتــڕۆڵ بکات، نەوتی جیهانی کۆنتــڕۆڵ کردووە و هەرکەسێکیش نەوتی جیهان کۆنتــڕۆڵ بکات، دەتوانێت ئابووری جیهانی، لانیکەم بۆ داهاتوویەکی نزیك کۆنتــڕۆڵ بکات)) (Harvey, 2003:p.19). کۆماری ئیسلامی ئێران، بۆ بەرەو پێشبــردنی سیاسەتەکانی، لە چوارچێوەی سیاسەتی دەرەوەدا، سوود لە فاکتەری وزە(نەوت و غاز) وەردەگرێت. ئەم پرسە بەشێکی سەرەکی و گرنگ لە ستــراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی کۆماری ئیسلامی ئێران پێکدێنێت، کە ئەمەش لە بەڵگەنامەی ڕوانگەی بیست ساڵەی گەشەسەندن (٢٠٠٥ - ٢٠٢٥)دا، دەردەکەوێت، بە تایبەت لە بواری ناوچەییدا (موسوی شفائی، ١٣٨٩: ص ١٦٦ ).

لە ڕوانگەی دارێژەرانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران، وزە وەك گرنگتــرین خاڵی پێکەوەبەستنی ئێران بە سیستەمی نێونەتەوەیی و یەکێك لە کاریگەرتــرین فاکتەرەکانی شوێندانەر لە سەر بارودۆخی خۆشگوزەرانی ناوخۆیی و بەرنامەکانی گەشەپێدانی نەتەوەیی، ئەو توانایییەی هەیە کە ببێتە دەرفەتێك بۆ تەعامول و هاوکاری لەگەڵ سیستەمی نێونەتەوەیی، لە لایەکی تــرەوە زیاترکردنی شوێندانەری ئێران لە ئاستی نێونەتەوەیی.(Roger, 2007:p.377). بەڵام بە هۆی سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامی بە تایبەت لە پرسی دۆسیەی ئەتۆمی ئێران و سیاسەتەکانی لە ناوچەکەدا و هەروەها سزا و ئابلۆقەکانی نێونەتەوەیی بۆ سەر ئێران و دژایەتیکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل و بە گشتی ڕۆژئاوا، ئەم فاکتەرە بۆتە خاڵی لاوازی کۆماری ئیسلامی. بۆیە گوشار و سزای ئابووری بۆ سەر ئێران زیاتــر لە ڕێگەی فاکتەری وزەوە دەکرێت. ئەمەش ئاماژیە بۆ سیستەمی لاوازی ئابووری لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا و کاریگەری

نەرێنییەکەی ئەم سیستەمە بۆ سەر بکەرایەتی کۆماری ئیسلامی لە سیاسەتی دەرەوەیدا، کە بە پێی تیۆری کۆنستـراکتیڤیزم ئەم پێکهاتە سیاسی ئابوورییەی کۆماری ئیسلامی دەرهاویشتەی جۆری هزر و تێڕوانین و ئامانج و بە گشتی تێگەیشتنی بڕیار وەرگرانی کۆماری ئیسلامییە. لە لایەکی تـرەوە بەها و پێوەرە زاڵە پێکهاتەییەکانی نێونەتەوەیی و بکەرانی تـری ناوچەیی و نێونەتەوەیی، ئەم بکەرایەتییەی ئێران سنووردار دەکەن. بەم مانایە کە فاکتەر و ڕەگەزە ماددی و واتاییەکان کاریگەریان لە سەر ئەم ناسنامەیەی کۆماری ئیسلامی ئێران و ئامانج و بەرژەوەندییەکانی دەبێت، کە لە پەیوەندی لەگەڵ بکەرانی تـر لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێراندا بەرجەستە دەبێت.

## (٦)- ئەنجامەكان

شیكردنەوە و لێكدانەوەی سیاسەتی دەرەوە، یەكێكە لە گرنگترین و ئاڵۆزترین بوارەكانی تیۆری و خوێندنەوەی پەیوەندییە نێونەتەوەییەكان. لە هەر ڕوانگە وتیۆرییەكدا، بە میتۆد و شێوازی جیاواز هەوڵی شیكردنەوەی ڕەفتاری دەرەكی دەوڵەتان دەدرێت، كە بە شێوەیەكی گشتی بە سەردوو ڕوانگەی گشتی تیۆرییە عەقڵگەراییەكان و تیۆرییە ڕەخنەگەراییەكان، یان ماددی و مانایییەكان دابەشدەبێت. هەرچەندە ئێمە هەوڵمانداوە كە ڕوانگەیەكی مام ناوەندی یان ئاستی ناوەڕاست وەربگرین كە هەم فاكتەرە ماددیەكان و هەم فاكتەرە مانایییەكان لەبەرچاو بگرین. لەم سۆنگەیەوە تیۆر و ڕوانگەكانی ناسنامە تەوەر هەردوو فاكتەری پێكهاتە و بكەر، هەروەها ماددی و مانایی، لەبەرچاو دەگرن. هەرچەندە تیۆرە ڕەخنەگەراییەكان هێشتاكە نەبوونەتە ڕوانگە و پاراداَیمی زاڵ لە بواری پەیوەندی نێونەتەوەیی و سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتاندا، بەڵام تاڕادەیەكی زۆرباش بۆشاییەكانی تیۆرییە باوەكانی ئەم بوارە پڕدەكەنەوە.

گریمانەی توێژینەوەكەمان ئەوە بوو: ((بنەماكانی هزری و ئایدۆلۆژیك - شۆڕشگێڕانەی كۆماری ئیسلامی ئێران لە چوارچێوەی بنەماكانی هزری فیقهی شیعەدایە، كە سیستەمی سیاسی كۆماری ئیسلامی ئێران و پێكهاتە فەرمییەكەی ڕەوایەتی لێوەردەگرێت. بەم پێیەش ئەو ڕۆڵ و پێگەیەی كۆماری ئیسلامی ئێران بۆ خۆی لە سیستەمی نێونەتەوەییدا پێناسەی دەكات، لە سەر بنەمای ناسنامەیەكی تایبەتی ئێرانی - ئیسلامی و شیعی - شۆڕشگێڕانەیە، كە

وادەكات سیاسەتی دەرەوەی ئاراستە و بەرژەوەندییەكانی پێناسە بكات و هەوڵی بەدیهێنانی ئامانجە باڵاكانی بدات، بەڵام پاراستنی ئاسایش و مانەوەی ئەم سیستەمە ئایینی - سیاسییە، ئامانجی سەرەكی سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێرانە. پێگە و تێگەیشتنی ڕێبەر و نوخبە ئایینی- سیاسییەكانی ئێران لە خۆیان و لە جیهانی دەرەوە و پرسی پاراستنی ئاسایش و بەرژەوەندی سیستەم، هەروەها كاریگەری و گوشارەكانی پێوەرەكان، بەهاكان و پێكهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی و دابەشبوونی هێز، جارێكی تـر ئەم ناسنامەیەی كۆماری ئیسلامی ئێران و بەدوایدا بەرژەوەندی و ڕەفتارەكانی ئەم بكەرە هەموار دەكاتەوە)).

لە كۆتایی توێژینەوەكەمان گریمانەكەمان سەلمێندرا و وەڵامی پرسیارەكانمان بەم شێوەیە درایەوە و گەیشتینە ئەم ئەنجامەی خوارەوە كە دەیخەینە ڕوو :

١- بە هۆی سروشتی ئاڵۆز، فرەیی و ناڕوونی ڕەهەند و ڕەگەز و فاكتەرەكانی كاریگەر لە سەر سیاسەتی دەرەوەی ئێران، بە پێی ڕوانگە و تیۆرییە باو یاخود زاڵەكانی بواری پەیوەندییە نێونەتەوەییەكان و سیاسەتی دەرەوە، كە بە تیۆرییەكانی عەقڵانی ناسراون و گرنگی بە فاكتەرە ماددییەكان و بەرژەوەندییە نەتەوەییەكان دەدەن، ناتوانین بە ڕوونی لە سیاسەتی دەرەوەی ئێران تێبگەین. هەروەها گرنگی پێدان تەنها بە ئاستێكی شیكردنەوە، وەك تیۆری ریالیزمی نوێ كە گرنگی بە پێكهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی دەدات یان تیۆری ریالیزم كە تەنها لە ئاستی نەتەوەیی شیكردنەوە دەكات و دەوڵەت وەك بكەرێكی عەقڵمەند دادەنێت، یاخود بە تیۆرییەكانی دروستكردنی بڕیار بە تەنیا، دیسانەوە ناتوانین سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران شیبكەینەوە. بۆیە پێویستە لە لایەك سوود لە هەموو ڕەگەز و فاكتەرە بەسوودەكانیان وەربگرین و لە لایەكی تـرەوە هەردوو فاكتەرەكانی ماددی و مانایی لەبەرچاو بگرین. بۆ ئەم مەبەستەش

تیۆری كۆنستراكتیڤیزم كە ناسنامەتەوەر و ماناتەوەرە، باشتر ئەم ناڕوونی، ئاڵۆزی و فرە ڕەهەندیەی كۆمەڵگەی ئێرانی و كولتووری سیاسییەكەی ڕوون دەكاتەوە و وەڵامدەردەبێت. هەرچەندە ئێمە سوودمان لە تیۆر و ڕوانگەكانی تریش وەرگرتووە، بەڵام بە هۆی بابەت و ناوەڕۆكی توێژینەوەكە كە بنەماكانی هزری و چوارچێوەی تیۆری سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێرانە و بۆ دووركەوتنەوە لە بەربڵاوبوونی توێژینەوەكە، زیاتر لەم تیۆر و ڕوانگەیە سوودمان وەرگرتووە.

٢- لەم توێژینەوەیەدا بۆمان دەركەوت كە سەرچاوەكانی ناسنامەسازی لە كۆماری ئیسلامی ئێران فرە و جۆراوجۆرن، وەكو: مێژووی ئێران و ڕەگەز و فاكتەرە ماددی و ماناییە مێژووییانەی كە بۆ ئێرانییەكان بەجێماوە و بۆتە هۆی تێگەیشتنی تایبەت لە (خود) و (ئەویتر) لە لای ئێرانییەكان، بە هەموو شكست، سەركەوتن، شانازی و شكۆمەندیەكانییەوە، هەروەها ڕەگەزی ئایینی، مەزهەبی شیعەی دووازدە ئیمامی، زاڵە بە سەر سیستەمی سیاسی و تێگەیشتنی نوخبە سیاسییەكانی كۆماری ئیسلامی ئێران ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی كە ڕۆڵی تایبەت و جیاواز بۆ خۆیان لە سیاسەتی دەرەوەدا پێناسە بكەن، وەكو: دەوڵەتی دادپەروەریخواز، دەوڵەتی دژی زوڵم و زۆرداری، دەوڵەتی دژی ئیمپریالیزم و سەهیونیزم، دژی ئیستكبار، سەنگەری شۆڕش و ڕزگاریخوازی، بەرگریكاری ئۆمەتی ئیسلامی و شیعەكان، نموونە و سەرمەشقی جیهانی ئیسلام، ناوەندی جیهانی ئیسلام، پشتیوانی بزووتنەوە ڕزگاریخوازەكان، هەروەها ئەم سەرچاوە ئایینی - ئیسلامییە، كە لەسەر بنەمای فیقهی شیعە و جۆرە ڕوانگەیەكی توندڕەوانە و خوێندنەوەی تایبەت بۆ ئایینە، لەسەر كۆمەڵێك بنەمای هزری ڕاوەستاوە كە بۆتە بەشێك لە ناسنامەی كۆماری ئیسلامی، وەكو: بنەماكانی دادپەروەریخوازی، بنەمای ولایەت و ڕێبەرایەتی فەقیە، بنەمای

(تەوەلا و تەبەڕی)، بنەمای بانگەشەکردن، بنەمای دارولئیسلام و دارولحەرب، تەقییە و چاوەڕوانی دەرکەوتنی ئیمامی مەهدی بۆ رزگارکردنی هەموو جیهان، بنەمای شەهادەتخوازی و جیهاد لە ڕێگەی خوا، بنەمای نەفی سەبیل کە بۆتە هۆی پەیڕەو کردنی سیاسەتی (نە شرقی و نە غربی) لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، هەروەها گوتاری جیهانی سێیەمگەرایی و بەرگری لە چەوساوەکانی جیهان، دیسانەوە ئاراستەی ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران دەکات. ئەمە جگە لە فاکتەری جیۆپۆلەتیك و جوگرافیای تایبەتی کۆماری ئیسلامی ئێران، کە لێرەوە بە پێی تیۆری کۆنستـراکتیڤیزم، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئەم بنەما ماددی و هزریانە، ناسنامەی تایبەتی دەوڵەتی ئێران دروستدەکەن، دواتـر ئەم تێگەیشتنە و ناسنامەیە دەبێتە هۆی پێناسەکردنی جۆرێکی تایبەت لە بەرژەوەندی نەتەوەیی. لە ئەنجامدا سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران، ئامرازی جێبەجێکردن و بەدیهێنانی ئەم ئامانج و بەرژەوەندیانەیە و بەدواداچوونیان بۆ دەکات و دەبێتە بەشێکی نەگۆڕ لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران.

٣- لەم توێژینەوەیەدا بۆمان ڕوون بووە کە چۆن دەوڵەتێك وەك ئێران، بە هۆی شۆڕشی ئیسلامی ساڵی (١٩٧٩)، سیاسەتێکی دەرەوەی تەواو جیاواز لە سیاسەتی دەرەوەی پێش شۆڕشی گرتەبەر، کەئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە ناسنامەی نوێ، جۆر و سروشتی سیستەمە سیاسییەکە، بنەماکانی هزری و ناسنامەیی، ئایدولۆژیایی فەرمی، ڕۆڵی ڕێبەر و نوخبە ئایینی - سیاسییەکانی کۆماری ئیسلامی و تێگەیشتنیان لە پێکهاتەی سیستەمی نێونەتەوەیی، هێز و پەیوەندییە دەرەکییەکان، بە چ شێوەیەك ئاراستەی ڕەفتاری سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران دەکات، ئەمەش بە شێوەیەك کە هاوپەیمانەکانی دوێنێ دەبنە گەورەتـرین دوژمن یان ئەوی تـری ئەم دەوڵەت و ناسنامە نوێیە، بەڵام

ئەمەشمان بۆ دەرکەوت کە ئەم بەها و پێوەرە ناسنامەییانە چۆن لە قۆناغە جیاوازەکاندا بە هۆی گۆڕانکاری ناوخۆیی و دەرەکی هەروەها ڕۆڵی فاکتەر و ڕەگەزەکانی ماددی، مانایی و پێکهاتەیی سیستەمی نێونەتەوەیی هەمواردەبن، ئەمەش کاریگەری راستەوخۆی لە سەر سیاسەتی دەرەوە دەبێت. لە لایەکی تـرەوە ئەوە دەسەلمێنێت کە گۆڕانکارییەکانی ژینگەیی دەوروبەری دەوڵەت و مەتـرسی و هەڕەشەکان، دەبنە هۆی ڕەفتار و سـتـراتیژی جیاواز لە سیاسەتی دەرەوەدا، وەکو بنەمای هەناردەکردنی شۆڕش لە سەرەتای شۆڕشی ئیسلامی ئێران کە دواتــر بە هۆی گوشار و گۆڕانکاریەکانی پێکهاتەیی و لە لایەن ئەکتەرە بەهێزەکانەوە هەمواردەکرێت و خۆی لە چوارچێوەی دۆکتۆرینی (ام القری)دا دەبینێتەوە .

٤- لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا ڕۆڵی ڕێبەر (وەلی فەقیھ) هەم لە ڕووی دەستووریی و یاسایی و فەرمییەوە لە سیاسەتی دەرەوە و سیاسەتە گشتییەکاندا، هەم لە ڕووی بنەما ئایینی و مەزهەبی و ئایدۆلۆژیەکانەوە رۆڵێکی سەرەکی و یەکلاکەرەوی هەیە. ئەم ڕۆڵ و پێگەیەش زیاتــر ریشەی لەم هزرە فیقهیەوە هەیە کە لە ناسنامە نوێیەکەی کۆماری ئیسلامی ئێران بۆ وەلی فەقیە (ڕێبەر) پێناسە کراوە.

٥- لەم توێژینەوەیە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە هەرچەندە ئایدۆلۆژیای شیعی — ئیسلامی، ڕۆڵی سەرەکی لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی هەیە، بەم مانایە کە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی درێژکراوەی سیاسەتە ناوخۆییەکەیەتی، بەڵام بە هۆی کاریگەری فاکتەر و ڕەگەزە ماددیەکانەوە، ئێمە دەبینین کە پاراستن و مانەوەی ئەم سیستەمە سیاسییە و هەروەها خوێندنەوەی ریالیستی یان ئایدیالیستی نوخبە سیاسییەکان، کاریگەری لە سەر ڕەفتارەکانی کۆماری ئیسلامی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی تــر هەیە.

٦- کۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵی دروستکردنی جۆرە هاوسەنگییەك لە هەمبەر گوشارەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا دەدات لە ڕێگەی پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی و ئاسیا بە تایبەت چین و ڕووسیا و وڵاتانی جیهانی سێیەم، تاوەکو بتوانێت لە ڕووی ئابووری، سیاسی و سەربازیەوە خۆی بەهێزبکات، تاوەکو لەو گوشارە ئابووری و سیاسیانەی سەرخۆی کەمبکاتەوە، تابتوانێت پەرە بە پرۆگرامە ئەتۆمیەکەی بدات، هەروەها هەوڵ دەدات بە ئەندامبوون و ڕۆڵ بینین لەو ڕێکخراوە و دامەزراوە نێونەتەوەییانەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ڕۆژئاوا بە گشتی ڕۆڵیان تێدا کەمتــرە. بۆ نموونە ڕێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی، بزوتنەوەی بێلایەنەکان و...هتد، بە جۆرێك کاریگەری و ڕۆڵی هەبێت لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەییدا.

٧- بە پێی ڕوانگەی ئاسایشی بوونناسانەوە، کۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵی بەرگری و بەردەوامی ئاسایشە ناسنامەییەکەی دەدات، کە پەیوەستە بە مانەوەی سیستەمە سیاسییەکەی. ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی کۆماری ئیسلامی ئێران سەرەڕای گوشار و ئابلۆقەکانی نێونەتەوەیی و ئەو تێچووە زۆرە و زیانە ماددیانە لە بواری پرۆگرامی ئەتۆمیەکەی، هەر هەوڵی بەرهەمهێنان و بەدەستهێنانی ئەم وزەیە دەدات. لەم ڕوانگەشەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بە پێی ئەم ناسنامە و تێگەیشتنەی کۆماری ئیسلامی ئێران چەمکەکانی دەوڵەت، ئاسایش، هێز، ڕەوایەتی و...هتد، جیاوازی هەیە لەگەڵ تێگەیشتنی باوی ئەکتەرەکانی تــر(دەوڵەت-نەتەوە). هەروەها چەمکی عەقلانییەتی ڕۆژئاوایی جیاوازی هەیە لەگەڵ عەقلانییەت لە ڕوانگەی کۆماری ئیسلامی ئێران کەئەمەش دەرهاویشتەی بنەماکانی هزری مەزهەبی شیعەی دووازدە ئیمامی و ئایدۆلۆژیای کۆماری ئیسلامی ئێرانە.

٨- لەم توێژینەوەیەدا بۆمان ڕوون بۆوە کە فاکتەری کۆمەڵایەتی، کولتووری، میژوویی و پێکهاتەی دانیشتوان و فرەیی نەتەوەیی و ئایینی لە ئێران، کاریگەریان لە سەر سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران هەیە، بۆ نموونە فاکتەری نەتەوەیی کورد لە پەیوەندی نێوان ئێران و عیراق، تورکیا و سوریا، یان مەزهەب لە پەیوەندی گەڵ وڵاتانی سوننە مەزهەب و پرسی هیلالی شیعی و دەستێوەردان لە کاروباری ئەم وڵاتانە، کە لەوانەیە بگاتە ئاستی هاوکاری یان ململانێ و بارگرژی. هەروەها کولتووری سیاسی تایبەتی ئێران و ململانێیەکانی نێوان ریالیست و ئایدیالیستەکانی ناوخۆیی کاریگەری لە سەر سیاسەتی دەرەوەی ئەو وڵاتە هەیە.

٩- لەم توێژینەوەیەدا بە یارمەتی تیۆری ناسنامەتەوەر یاخود ماناتەوەری کۆنستـراکتیڤیزم، بۆمان دەرکەوت کە ڕۆڵی (ئەویتـر) لە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران سەرچاوەیەکی گرنگی ناسنامە پێدەرە. بۆ نموونە ئێران، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئیسرائیل و بە گشتی ڕۆژئاوا، بە ئەوی تـری ناسنامەیی خۆی دادەنێت، لەم ڕێگەیەوە ناسنامەی خۆی و ڕەوایەتی سیستەمە سیاسییەکە لەم دژایەتیە بەرهەمدێنێتەوە، کە هەم سەرچاوەی ناسنامەسازیە و هەم سەرچاوەی ڕەوایەتی پێدانە و هەم بنەمایەکی هزری و بیروبڕواییە.

١٠- بەرژەوەندییەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران بە هۆی ئەم ناسنامە تایبەتەیەوە پێناسە و دەستنیشان دەکرێت، لێرەوە سیاسەت و ئابووری کۆماری ئیسلامی ئێران لە پەیوەندی لەگەڵ جیهانی سێیەم و دوورکەوتنەوە لە وڵاتانی ڕۆژئاوایی دابووە. لە لایەکی تـرەوە ئابووری گرێدراوی ئێران بە فرۆشتنی نەوت و غاز، وایکردووە کە سیاسەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە سەر بنەمای دژایەتی ڕۆژئاوا دابـڕێژرێت، بەم مانایە کە سیستەمی ئابووری دەوڵەتی لە سەر بنەمای فرۆشتنی نەوت و غاز، وایکردووە کە کۆماری ئیسلامی ئێران لە

سیاسەتیشدا هەوڵ بدات سەربەخۆ بێت، بەڵام ئەمە کاریگەری نەرێنی لە سەر ئابووری، گەشەسەندن و پەیوەندییەکانی و بە گشتی سیاسەتی دەرەوەی ئێران هەبووە و پەیوەندییەکانی بە پێی ئەم ڕوانگە ئابووری و سیاسییە دارشتووە.

١١- سروشتی ئایدۆلۆژیك و بـڕوایی هێز لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا وایکردووە کە لە سیاسەتی دەرەوەشیدا، بۆ نموونە بنەمای نەفی سبیل، پەیڕەو بکات، کە بەم پێیە نەچێتە ژێر نفوزی هیچ هێزێکی تـر. بۆ نموونە لە هەمبەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل، ململانێ و دژایەتی بۆتە بنەمای بـڕوایی یاخود پشتیوانیکردن لە بزووتنەوە توندرۆکان. لێرەوە بە پێی تیۆری کۆنستـراکتیڤیزم ئەگەر کۆماری ئیسلامی ئێران بنەماکانی سەرەکی و بنەڕەتی بنیاتنەری ناسنامەی خۆی بگۆڕێت، ئەوە ناسنامەیەکی تـری دەبێت و چیتـر کۆماری ئیسلامی بوونی نامێنێت. بەم مانایە کە سروشتی هێز لە کۆماری ئیسلامی ئێران لە سەر بنەمای بەرژەوەندی ئابووری، بەرگری لە سامانی نەتەوەیی، گەشەپێدانی بازرگانی و تەکنۆلۆژی پێشکەوتوو و زانستی نییە، بەڵکوو لە سەر بنەمای بڕوایی و سەرچاوەگرتوو لە شۆڕشی ئیسلامی و پاراستنی سیستەمی بڕوایی لە ناوخۆ و دەرەوەیە. ئەمەش وادەکات کە کۆماری ئیسلامی ئێران نەتوانێت دەستبەرداری ئەو بنەما هزری و بنچینەییانە یاخود بنیاتنەرانەی ناسنامەکەی بێت.

١٢- لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا پاراستن و مانەوەی دەسەڵاتداران و ڕژێمە ئیسلامییەکە پەیوەندی لەگەڵ بەردەوامی ئەو سیاسەتە لە دەرەوەدا هەیە. بەم مانایە کە فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتداریەتی لە کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ کۆمەڵێك بنەمای هزری، بڕوایی، بەهایی و پێوەری تێکئاڵاوە و هەر کەسێك لەم سیستەمەدا دەسەڵات بگرێتە دەست، دەبێت بەم بنەمایانە پابەند و وەفادار بێت. واتا بڕیاردەرانی سیاسەتی دەرەوەش دەبێت ئەم بنەما و بەها و پێوەرە هزری و

بـڕواییانە ڕەچاو بکەن، واتا لێرە بنەماکانی بڕوایی و هزری ئەم سیستەمە سیاسییە و پاراستنی لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە. بەم پێیەش بڕیار وەرگرانی سیاسەتی دەرەوە ناتوانن پەیوەندی ئاسایی لەگەڵ ئیسرائیل و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دروستبکەن، چونکە بۆ نموونە یەکێك لە گرنگتـرین هەلومەرجەکانی ئاساییکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ ویلایەتەیە ککگرتووەکانی ئەمریکا، گۆڕانکاریی ریشەیی لە پێناسەیەکە کە لە سیستەمی سیاسی کۆماری ئیسلامی ئێران لە هەمبەر ئیسرائیلدا هەیە. ئەم گۆڕانکاریەش بە پێی پێکهاتەی هزری و فەرمی سیستەمی سیاسی کۆماری ئیسلامی و بنەمای ڕەوایەتی و ناسنامەیی کۆماری ئیسلامی شتێکی زۆر دوورە و پرسی بەرگریی لە فەلەستینیەکان بۆتە بنەمایەکی نەگۆڕی دەسەڵات و ناسنامەیی لە کۆماری ئیسلامی ئێران. ئەمە جگە لە ڕۆڵی سوپای پاسداران و نفووز و کاریگەریان لە سەر سیاسەت، کە لە سەر بنەمای بڕوایی کاردەکەن و لەم دژایەتییە ڕەوایەتی ڕەفتار و مانەوە و هەروەها بەرژەوەندییەکانییان وەردەگرن.

١٣- لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا ڕەوایەتی و ئاسایشی نەتەوەیی گرێدراوی بنەماکانی سیاسەتی دەرەوەیە. بەم مانایە کۆماری ئیسلامی کە ناسنامەیەکی ئیسلامی شۆڕشگێرانەی هەیە، ناتوانێت پەیوەندی توندوتۆڵ و بەهێز یان ئاسایی لەگەڵ جیهانی سەرمایەداری و کولتووری لیبـرالی هەبێت یان هاوپەیمان بن، چونکە ئەوکاتە بنەماکانی ڕەوایەتی و ئاسایشی دەکەوێتە مەتـرسییەوە. بە پێی تێگەیشتن و ناسنامە تایبەتەکەی کۆماری ئیسلامی ئێران، بەها و پێوەرەکانی ئایدۆلۆژیای کۆماری ئیسلامی و بەها و پێوەرەکانی لیبـرالیزم لە دوو سەرچاوەی جیاوازی فەلسەفییەوە دەڕواننە پرس و بابەتەکان. بەم پێیەش لەم سیستەمە سیاسییەدا، دژایەتی نێوان ئێران و ئیسرائیل بەشتێکی سروشتی هەژمار دەکرێت و بەم هۆیەشەوە پاڵپشتی لە بزووتنەوە توندڕەوەکان یاخود فەلەستینیەکان دەبێتە

هۆی ئەم ناسنامە تایبەتە و بنەمای ڕەوایەتی. ئەمەش بنەماکانی هزری ئاسایشی نەتەوەیی ئاراستە دەکات یاخود فۆرمی پێدەدات، هەروەها ناکۆکییەکانی تـری نێوان کۆماری ئیسلامی و ڕۆژئاوا، وەکو: پرسی مافەکانی مرۆڤ و مافی نەتەوەکان لە ئێران و کەمایەتیە ئایینەکانی ئێران و...هتد، سەرچاوەی ناکۆکیین. بەگشتی حکومەتێکی ئایینی ناتوانێت سیکۆلار بێت، لە کاتێکدا پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان و پێوەرە نێونەتەوەییەکان لە سەر بنەمای سیکۆلاریزمە، نەك بیروباوەڕ و ئایدۆلۆژیا و ئایینی ئیسلام. بەم هۆیەشەوە کۆماری ئیسلامی ئێران تووشی دژەیەکی بووە، لە لایەك ئەگەر سیاسەتی دەرەوە و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ڕۆژئاوا ئاسایی بکاتەوە ئەوە بنەماکانی ناسنامەیی و ڕەوایەتی خۆی لە دەستدەدات. بۆیە ئەگەر بەردەوام دژایەتی ڕۆژئاوا بکات ئەوە گۆشەگیر و لاواز دەبێت و لە ئەنجامدا لە بواری ئابووری، پەرەپێدان، تەکنۆلۆژیا و خۆشگوزەرانی و...هتد، تووشی قەیران دەبێت. ئەمەش دەبێتە هۆی ناڕەزایەتی ناوخۆیی و لەوانەیە شۆڕش و ڕووخانی ڕژێمی لێبکەوێتەوە. لە لایەکی تـرەوە کۆماری ئیسلامی ئێران ناسنامە و ڕەوایەتی خۆی لەو دژایەتی و جیاوازییەی لەگەڵ ڕۆژئاوا و سیستەمی نێونەتەوەیی وەرگرتووە، بەم پێیەش کۆماری ئیسلامی ئێران بە هۆی زاڵبوونی فاکتەر و بەهاکان و دابەشکردنی هێز لە ئاستی نێونەتەوەیی، هەروەها ڕۆڵی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بە گشتی ڕۆژئاوا لە ئاستی نێونەتەوەیی و گۆڕانکارییەکانی ناوخۆیی، ناوچەیی و نێونەتەوەیی، ناتوانێت بەم سیاسەتە ناسنامەییە بەردەوام بێت.

## (٧) ـ سەرچاوەكان:

**قورئانی پیرۆز**

**سەرچاوە بە زمانی كوردی**

١- عثمان حەمە، هیوا، (٢٠١١)، **وەرگرتنی بڕیار لە سیاسەتی دەرەوەی كۆماری ئیسلامی ئێران "قەیرانی وزەی ناووكی وەك نموونەیەك"**، نامەی ماستەر بلاّو نەكراوە، زانكۆی سەلاحەددین، كۆلێژی یاسا و رامیاری، بەشی زانستە رامیارییەكان، هەولێر.

**سەرچاوەكان بە زمانی فارسی**

**یەكەم: كتێبەكان**

٢- ابوالنصر، فضیل، (١٣٧٨)، **رویارویی غرب گرایی و اسلام گرایی**، ترجمە: حجت الله جودكی، تهران: مركز چاپ و انتشارات وزارت امور خارجە، (١٩٩٩).

٣- احتشامی، انوشیروان، (١٣٧٨)، **سیاست خارجی ایران در دوران سازندگی**، ترجمە: ابراهیم متقی و زهره پوستین چی، تهران: انتشارات اسناد انقلاب اسلامی، (١٩٩٨).

٤- ادیب زاده، مجید، (١٣٨٧)، **زبان، گفتمان و سیاست خارجی**، تهران: نشراختران، (٢٠٠٨).

٥- ازغندی، علیرضا، (١٣٨١)، **سیاست خارجی جمهوری اسلامی ایران**، تهران: نشر قومس، (٢٠٠٢).

٦- ازغندی، علیرضا، (١٣٨٨)، **روابط خارجی ایران در سال هـای ١٣٢٠ تا ١٣٥٧** ، تهران: نشر قومس، (٢٠٠٩).

٧- استونر، جیمز و دیگران، (١٣٧٩)، **مدیریت**، تـرجمه: علـی پارسـیان و سید محمد اعرابی، تهران: انتشارات دفتـر پژوهش های فرهنگی، (٢٠٠٠).

٨- استونز، راب، (١٣٧٩)، **متفکران بـزرگ جامعـه شناسـی**، متــرجم: مهرداد میردامادی، تهران: نشرمرکز، (٢٠٠٠).

٩- اسکندریان، مهدی، (١٣٨٣)، **هویت و رابطه ایران و اتحادیه اروپـایی**، کتاب اروپا (٣)، تهران: انتشارات مؤسسة مطالعات و تحقیقات بین المللی ابــرار معاصر تهران، (٢٠٠٤).

١٠- اسـنایدر، ریچـارد و دیگـران، (١٣٨٩)، **تصـمیم گـیری در سیاسـت خارجی**، تـرجمه: محمدجعفر جوادی ارجمندی و مجید فرهـام، تهـران: نشـر میـزان، (٢٠١٠).

١١- اشرف، احمـد و ابــراهامیان، یروانـد و همـایون کاتوزیـان، محمـدعلی، (١٣٨٦)، **جستارهایی درباره تئوری توطئة درایران**، گـردآوری و تــرجمه: محمـد ابـراهیم فتاحی، تهران: نشر نی، (٢٠٠٧).

١٢- آلارثــوش، علــی و توتونچــیان، علیرضــا، (١٣٧٢)، **دیپلمــات و دیپلماسی**، تهران: سازمان چاپ و انتشارات وزارت امور خارجه، (١٩٩٣).

١٣- آلموند، گابـریل و جی، بینگهام و پاول، جونیوز و رابـرت، جی مونت، (١٣٧٦)، **چهارچوبی تطبیقی بـرای بـررسی سیاست تطبیقی**، تـرجمه: علیرضا گیب، تهران: مرکز آموزش مدیریت دولتی، (١٩٩٧).

١٤- آلیسـون، گراهام. تی، (١٣٦٤)، **شیوەهای تصـمیم گـیری در سیاسـت خارجی: تفسیری بـر بحران موشکی کوبـا**، تــرجمه: منوچـهر شـجاعی، تهـران: شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، (١٩٨٥).

١٥- امام خمینی، روح الله، (١٣٧٨)، **فلسطین از دیدگاه امام خمینی**، تهران : مؤسسة نشرو تنظیم آثار امام (ره)، (١٩٩٩).

١٦- ایزدی، بیژن، (١٣٧١): **سیاست خارجی جمهوری اسلامی ایران**، قم: مرکز انتشارات حوزه علمیه قم، (١٩٩٢).

١٧- ایکنبری، جی، جان، (١٣٨٣)، **تنها ابر قدرت: هژمونی آمریکا درقرن ٢١**، مترجم: عظیم فضلی پور، تهران: ابرار معاصر، (٢٠٠٤).

١٨- باتامؤر، تی.بی، (١٣٨١)، **نخبگان و جامعه**، ترجمه: علیرضاطیب، تهران: انتشارات شیرازه،(٢٠٠٢).

١٩- بارنت، مایکل و تلهامی، شبلی، (١٣٨٣)، **سیاست و هویت در خاورمیانه**، ترجمه: مرتضی بحرانی، تهران: پژوهشکده مطالعات راهبردی، (٢٠٠٤).

٢٠- بخشایش اردستانی، احمد، (١٣٧٥)، **اصول سیاست خارجی جمهوری اسلامی ایران**، تهران: نشر آوای نور، (١٩٩٦).

٢١- بیلیس، جان و اسمیت، استیو، (١٣٨٣)، **جهانی شدن و سیاست: روابط بین الملل در عرصه نوین**، ترجمه: محمد رضا راه چمنی، تهران: انتشارات ابرار معاصر، (٢٠٠٤).

٢٢- تسلیمی، محمد سعید، (١٣٧٨)، **تحلیل فرآیندی خط مشی گذاری و تصمیم گیری**، تهران: انتشارات سمت، (١٩٩٩).

٢٣- توکلی طرقی، محمد، (١٣٨٢)، **تجدد بومی و بازاندیشی تاریخ**، تهران: نشرتاریخ ایران، (٢٠٠٣).

٢٤- پرحلم، امیر رضا، (١٣٨٤)، **سایه عقاب ها: طرح سری حمله آمریکا به ایران**، تهران: نشر **عطائی**، (٢٠٠٥).

٢٥- ثقفی عامری، ناصر و دیگران، (١٣٨٦)، **ایران و سیاست نگاه به شرق**، تهران: مرکز تحقیقات استراتژیك، (٢٠٠٧).

٢٦- ثقفی عامری، ناصر، (١٣٨٥)، **رویکرد نگاه به شرق و سیاست خارجی جمهوری اسلامی ایران**، تهران: معاونت پژوهش های سیاست خارجی مرکز تحقیقات استراتژیك، (٢٠٠٦).

٢٧- پلانو، جك. سی و روی، آلتون، (١٣٧٥)، **فرهنگ روابط بین الملل**، ترجمه: حسن پستا، تهران: فرهنگ معاصر، (١٩٩٦).

٢٨- پهلوی، محمدرضا، (١٣٧١)، **پاسخ به تاریخ**، ترجمه: حسین ابوترابیان، تهران:نشرمترجم، (١٩٩٢).

٢٩- پیریا، **فاطمه**، (١٣٨٧)، **روابط سیاسی اقتصادی ایران و آلمان بین دو جنگ جهانی**، تهران: انتشارات مرکزاسناد انقلاب اسلامی، (٢٠٠٨).

٣٠- جرویس، رابرت، (١٣٨٧)، **بازسازی جهان تك قطبی**، مترجم: محمد جمشیدی، تهران: راهبرد یاس، (٢٠٠٨).

٣١- جکسون، رابرت و گئورگ سورنسون، (١٣٨٣)، **درآمدی بر روابط بین المللی**، ترجمه: مهدی ذاکریان و دیگران، تهران: نشر میزان، (٢٠٠٤).

٣٢- حاجی یوسفی، امیرمحمد، (١٣٨٤)، **سیاست خارجی جمهوری اسلامی ایران در پرتو تحولات منطقةای**، تهران: دفترمطالعات سیاسی و بین المللی وزارت امورخارجه، (٢٠٠٥).

٣٣- حامی کلوانق، ولی الله، (١٣٨٧)، **رابطه ایران با سازمان ملل**، تهران: مرکز اسناد انقلاب اسلامی، (٢٠٠٨).

٣٤- حسین، حسنی، (١٣٨٣)، **طرح خاورمیانه بزرگتر: القاعده و قاعده در راهبرد امنیت ملی آمریکا**، تهران: ابرار معاصر، (٢٠٠٤).

٣٥- حقیقت، صادق، (١٣٧٦)، **مسئولیت های فراملی در سیاست خـارجی جمهوری اسلامی**، تهران: مركز تحقیقات استــراتژیك، (١٩٩٧).

٣٦- خالوزاده، سعید، (١٣٨٢)، **ارزیابی تحلیلـی روابـط جمهـوری اسـلامی ایران با اتحادیه اروپا (كتاب اروپا)**، تهران: مؤسسة فرهنگی مطالعات و تحقیقات بین المللی ابــرار معاصر، (٢٠٠٣).

٣٧- خانی، محمدحسین، (١٣٨٦)، **مجموعه مقــالات همــایش ارتباطــات بــین فرهنگی و سیاست خارجی: رویكردی ایرانی**، تهران: انتشارات بین المللی الهــدی، (٢٠٠٧).

٣٨- خــبیری، خســرو، (١٣٦١)، **ایــدولوژی اســلامی**، چــاپ دوم، تهــران: انتشارات صبا، (١٩٨٢).

٣٩- خدادیان، اردشیر، (١٣٨٣)، **تاریخ ایران باستان**، تهــران: نشــر ســخن، (٢٠٠٤).

٤٠- خمینی، روح الله، (١٣٦٣)، **كشــف الاســرار**، تهــران: دفتـــر تبلیغــات اسلامی، (١٩٨٤).

٤١- خمینی، روح الله، (١٣٧٩)، **صحیفه نور**، تهران: مؤسســة تنقیم و نشــر آثار امام خمینی، (٢٠٠٠).

٤٢- خمینی، روح الله، (١٣٨٠)، **صحیفه نور**، جلــد: ٢٠، تهــران: **مؤسســة تنظیم و نشر آثار امام خمینی**، (٢٠٠١).

٤٣- خواجه سروی، غلامرضا، (١٣٨٥)، **خاطرات محمد رضا مهدوی كنــی**، تهران: مركز اسناد انقلاب اسلامی، (٢٠٠٦).

٤٤- خوشوقت، محمــد حســین، (١٣٨٥)، **تجزیــه و تحلیــل تصــمیم گــیری در سیاست خارجی** ، تهــران: دفتـــر مطالعــات سیاســی و بــین المللــی وزارت امــور خارجه، (٢٠٠٦).

